# دنیای شتە بچوکەکان

ڕێبوار سیوەیلی



چاپی دووەم

ناوی کتێب: دنیای شتە بچووکەکان

نووسەر: ڕێبوار سیوەیلی

دیزاینی بەرگ: سەیوان سەعیدیان

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: هەردەوان نەقشەبەندیو ژیلوان محمد

تایپکردن: یسرا و عیماد ڕەسووڵ ئیسماعیل

چاپ: چاپی دووەم

تیراژ: ٣٠٠٠

چاپو بڵاوکردنەوە: چاپخانەی ڕەنج

نرخ: تەنها ٤٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردنی ( ٥٥٩ ) وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵی ( 2005 )ی پێدراوە

به یادی:

## والتەر بنیامین

**فەیلەسووفی شتە بچووکە لەیادکراوەکان...**



# پێڕست

# سەرەتایەك

(میتۆدی ئەمکارە: مونتاژی ئەدەبییە. من هیچم نیە بیلێم، تەنیا هەندێ شت پیشان دەدەم. نامەوێت دەربڕینی لێوڕێژ لە ڕۆحانیەت بهێنمە بەرهەم و نەشتوانم لە شتێکی پڕبایەخدا بەکاریان بهێنم. بە پێچەوانەوە من شتی تووڕهەڵدراو و زبڵئاسام لایە: نامەوێ ئەوانەش وەسف بکەم، بەڵکو دەمەوێت بیانهێنمەوە پێشچاو).

(قسەکردن لەسەر **کتێبی سرووشت** ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت واقیع وەك **تێکست** بخوێنێتەوە).

## واڵتەر بنیامین: کتێبی *قەیسەریەکان*

*(من دەمگوت: ئاە نەسرەدینی بۆنخۆشی برام، من شێتی دۆزینەوەی حیکمەتەکانی وێرانبوون نیم، من گەرەکمە شتەکان، حەقیقەتە پارچەپارچەکان، وێنەکانی ئەو سەردەمە لەیەکترازاوە بەیەکەوە بنێمەوە، تا بتوانم لە خۆم و لە مەرگی پەروانە تێبگەم، تا بتوانم نیگارێك وەکو ئەو نیگارانە دروستکەمەوە کە تۆ بەدیواری ئەم ستۆدیۆیەدا هەڵتواسیون.*
*ئەو بەگومانی وێنەگرێکەوە، کە لەهیچ نیگارێکی نارێك و تەڵخ ڕازیینیە، دەیگوت: تازە هەر وێنەیەك دروستبکەین، وێنەیەکی خەیاڵی خۆمانە، وێنەیەکە پەیوەندی بە فەنتازیاکانی من و تۆوە هەیە... بەڵام ئەو جیهانە ئێستا هەمووی وەکو سەراب و تۆز وایە.. تێمبگە حەقیقەت نازکە، کە بوو بە تۆز، بە غوبار، بە تەم، ئیدی کۆناکرێتەوە...)*

## بەختیار عەلی: *ئێوارەی پەروانە*

**کە** کتێبێك ناو دەنێین: (کۆمەڵە وتار) ئیدی هەموو **پێشەکی** نووسینێك بۆئەوو کتێبە کارێکی زیادەیە، و پێشەکیەکە دەبێتە وتارێکی تایبەت، یان بەڵای

کەمەوە ناتوانێت هیچ زیادەیەك بخاتە سەر دنیای *سەربەخۆی* یەکبەیەکی وتارەکان. لێرەشەوە بێمانایە باس لە پێکەوەگرێدانی بەشەکانی کتێبێك بکەین، کە هەر لەسەرەتاوە خۆی بە ***کۆمەڵە وتار*** پێناسە دەکات. واتە بە کۆمەڵێ جیهانی سەربەخۆ کە هەریەکەیان هەڵگری مانا و جوانکاریی خۆیەتی و چارەنووسی چاپ و بڵاوکردنەوە لە دووتوێی چەند لاپەڕەیەکدا کۆیکردوونەتەوە.. بەڵام ئێمە هەتا ئێستاش لەناو ڕۆشنبیرییەکدا دەژین کە موبتەلایە بە تێڕوانینێکی نەرێتگەرایانەی ئێستاتیکی بۆ کتێب. لێرەشەوە ناچارین بە ئاماژەکردن بۆ خاڵی هاوبەش و نەگۆڕ کە سەراسەری لاپەڕەکان پێکەوە گرێبداتەوە، داکۆکی لە ڕەوایەتی بەرهەمەکانمان بکەین. وەکئەوەی دنیای کتێب دنیایەکی بەردەوامبووی نەگۆڕ بێت و بتوانین هەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە ئەو ئاسۆیە ببینین کە لە دوا لاپەڕەدا پێیدەگەین.. ئەمەش لە وەهمێك زیاتر هیچیتر نییە، کە تێڕوانینێکی ئەکادیمی وشکی لە پشتەوەیە.. بەڵام دەبێت لە پشت ئەو تێڕوانینەوە دنیای کتێب بە جۆرێکی تر ببینین. بۆیە ئەوەی لە دواجاردا بابەتەکانی ئەم بەرهەمە پێکەوە دەبەستێتەوە، جگە لە پرۆسەی خوێندنەوە، کە پەیوەندی بە تۆوە هەیە، دوو لایەنە. یەکەمیان ئەوەیە کە زۆربەی ناوەڕۆکی وتارەکان لە ژێر خانەی ***ئاڵوگۆڕکردندا*** پۆلێن دەکرێن. ئەمەش لەبەر ئەوەی پەیوەندییان هەیە بە پانتاییە دیدارییەکان، کێشەکانی میدیا و بوارەکانی ڕاگەیاندنی هاوچەرخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا. لایەنی دووەم ئەوەیە: لە زۆربەی باسەکاندا سێبەری گۆشەیەك لە بیروڕاکانی ڕەخنەگر و فەیلەسووفی ئەڵمانی (واڵتەر بنیامین) دەبینرێتەوە و هەوڵیشمداوە بە هەندێك لە چەمکە هزرییەکانی ئەو ڕەخنەگرە و لەناو ئەو چەمکانەدا بیر بکەمەوە، یاخود ڕاڤەی چەند ڕستەیەکی بکەم و لێرەدا مونتاژیان بکەمەوە. وتارەکانم بەپێی مێژووی نووسینیان ڕیز نەکردوون دەتوانیت بەوجۆرەی خۆت دەتەوێت بیانخوێنیتەوە. هەندێك لە کارەکانی ئەم بەرهەمە لە بۆنەی تایبەتدا پێشکەش کراون، بەڵام تەنیا وتاری ***ڕۆڵی تەلەفزیۆن لەبەرهەمهێنانی زەبروزەنگدا*** پێشتر لە گۆڤاری (یەکگرتن)دا بڵاوکراوەتەوە. لە ڕووی زمانی

دارشتن، ڕێنووس، خاڵبەندی و تێمپۆی نووسینەوە هیچ هەوڵم نەداوە وتارەکان لەیەکتر بچن. هێندە هەیە لەچاو ئەو کاتەی یەکەمجار بەرهەمەکانی تێدا نووسراون و پێشکەش کراون، لێرەدا و لەپێناوی خۆ دەربڕینی زیاتردا، کەمێ دەستکاری هەندێ بڕگەیانم کردووە، بەبێ ئەوەی لەناوەڕۆکیانم گۆڕیبێت..

دواجار سوپاسی هەموو ئەو دۆست و هاوڕێیانە دەکەم کە بەشێوەی جۆراوجۆر لە گەڵاڵەکردنی بەرهەمەکەدا بۆ چاپ، یارمەتییاندام..

ڕ. س. ١٩٩٩

# دەست:
# لە جەستەوە بۆ سێمبوول



*دواجار* چەمکی (ئاشتبوونەوە) گەڕایەوە ناو ژیانی سیاسیی ئێمە.. لێرە بەدواوە باسی گرنگیی ئاشتی دەکەین بۆ مانەوە و بەردەوامبوونمان. ئیدی سنوور بۆ دەسیسەو پلانە تێکدەرەکان دادەنرێت و دەستە کارا و بیناکەرەکان دەکەونە خۆ. بەم پێیەش دەست لە پرۆسەی ئاشتیدا و لە دیپلۆماسیەتی سیاسیدا گرنگییەکی زۆر زیاتر وەردەگرێت لەچاو ئەو گرنگییەی لەژیانی ڕۆژانەدا هەیەتی. چونکە دیپلۆماسییەت تاکە بوارێکە کارکرد و ئەرکی دەست لە ئەندامێکی جەستەوە بەرز دەکاتەوە بۆسەر ئاستی سێمبوولێکی سیاسی. لەپرۆسەی (ئاشنایی یەکەمجار و تازەکردنەوەی دۆستایەتی و ئاشتبوونەوە)دا، دەست چەندە ئەندامێکی فیزیکیی لەشە، ئەوەندەش دەبێتە ئەندامێکی سیاسیی و شێوەی ئیشکردنیشی دەگۆڕێت. بۆ تێگەیشتن لەم پرۆسەیەش پێویستیمان بەخوێندنەوەیەکی تری دەست هەیە و پێویستە لەسادەترین پرسیاریشەوە دەستپێکەین:

*ئایا کاتێ دەست هیچ ناکات، چی دەکات؟* لەجیهانی شانۆدا قسەیەکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێت، ئەو ئەکتەرەی نەزانێت لەسەر شانۆ چی لەدەستی بکات، ئەکتەرێکی سەرنەکەوتووە. مەبەست لەم قسەیەش ئەوەیە ئەو ئەکتەرەی نەتوانێت دەستی لە نواندندا بەجوانی بەکار بهێنێت، ئەکتەرێکی ناسەرکەوتووە. لەم دەربڕینەدا هەربەتەنیا گرنگیی (دەست)مان لەبواری نواندنی شانۆدا بۆ ئاشکرا نابێت، بەڵکو دەربڕینەکە ئاماژەیەکیشە بۆ گرنگیی دەست لە بواری (شانۆی ژیان)یشدا بەگشتی. بەجۆرێ دەتوانین هەمان مەبەست بەمجۆرەش دابڕێژینەوەو بڵێین: ئەو مرۆڤەی نەزانێت لەژیاندا چۆن دەستی بەکار بهێنێت، مرۆڤێکی سەرکەوتووش نابێت..

بەڵام بۆچی دەست لەسەرجەمی لەش جیا دەکەینەوە؟ بۆچی چاوەڕێمان ئەوەیە دەستمان وەك بەشێکی سەربەخۆ لەجەستەمان ڕەفتار بکات و بەکار بهێنرێت؟

## تۆپۆگرافیای دەست:

لەڕاستیدا لەچاو ئەندامە دەرپەڕیوەکانی تری جەستەدا، دەست سەربەخۆییەکی زیاتری هەیە. زیاتر توانای جووڵەی سەروخوار، شکانەوە، شۆڕبوونەوە، خواربوونەوە و چەمانەوەی هەیە کەئەمانەش ڕێگەمان بۆ خۆشدەکەن بەجۆرەها شێوە دەستمان بەکار بهێنین و جۆرەها فۆرمیشی پێدروستکەین. بەم مانایەش دەست لەئەندامە دەرپەڕیوەکانی تری لەش چالاکترە، بزێوترە و زیاتریش بۆی دەلوێ خۆی لەپەیکەری جەستە جیابکاتەوە، کەئەمەش وادەکات لەئەندامەکانی تر ئازاد تریش بێت.. بەکورتی دەتوانین بڵێین: دەست زووتریش بەدەستەوە دێت.

ڕەنگە ئەم ئازادییەی دەست، جگە لەوەی کە پەیوەندی بە پێکهاتەی ئەناتۆمی لەشەوە هەیە و (وەك گوتم لەبەر ئەوەش وادەکات دەست لەئەندامەکانی دی چالاکتر بێت) ئەوە پەیوەندیشی هەبێت بە لایەنی کولتوورییشەوە. واتە کولتووریش ڕۆڵی هەیە لە ئازادکردنی ئەو بەشەی جەستەدا. چونکە لە

کولتووری مرۆڤایەتیدا دەست و بەشی سەرەوەی پەیکەری لەش هەمیشە کەمتر تابۆیان لەسەر بووە. تائێستاش ئەو کولتوورە ڕەسەنانەی مرۆڤایەتی ماون، کە هۆز و گرووپەکانیان بەشی سەرەوەی لەشیان (بە نێر و مێیانەوە)، داناپۆشن، لەکاتێکدا لە کەمەر بەرەو خواریان داپۆشراوە. زۆربەی کولتوورەکانی مرۆڤایەتی لەئاست ڕووتکردن و دەرخستنی ناوك، سك، پەراسوو، سەرسنگ، گەردن و مل و پشت، ناوشان، قۆڵ، مەچەك و بازوودا، هیچ تابۆیەکیان دانەناوە. کەچی لەئاست ڕووتکردنی لەکەمەر بەرەوخواری جەستەشدا هیچ تۆلەڕانس و لێبووردە نەبوون. تەنانەت سرووشت و هەلومەرجەکانی ژیان بەر لەوەی هیچ شێوازێکی دەستکێش لەدەستکردن بەسەر مرۆڤدا بسەپێنن، ناچاریانکردووە پێڵاو لەپێ بکات. ئەمەش شتێکی سەرسووڕهێنەر نیە چونکە تاکو شارستانیەتی یۆنانیش، بەتایبەتی لەسەردەمی دیموکراتیەتی ئەسینیدا، کەتیایدا جەستە خاوەنی ئازادیی ڕێژەیی خۆی بووە، (پێی ڕووت) نەك هەر خەسڵەتێکی مرۆڤی ناودار و خاوەن پلەوپایە بووە، بەڵکو وەك پانتاییەکی ئیرۆتیکیش تەماشای کراوە. واتە دیمەنی پێی ڕووت: نەرمایی پاژنە پێ، لووسیی بەری پێ و کلاوەی پەنجەگەورە ]وەك بەشێکی جیانەکراوە لە سەرجەمی چالاکیی جنسی تەماشای دەکرا. ئەم بەشانە سەرنجی نیگایان ڕادەکێشا و بزوێنەری حەز و مەیلی جنسی مرۆڤ بوون. تەنانەت پێی ڕووت بەشێکی گرنگ لەو تابلۆیەی (ڕافاییل)یش پێکدەهێنێت، کە بە(قوتابخانەی ئەسینا) بەناوبانگە. قاچ ڕووتی بەشێکی جیانەکراوەیە لە کاراکتەرەکانی ئەم تابلۆیە و لە ناوەڕاستیشدا ئەفلاتوون و ئەرستۆی فەیلەسووف بەپێی ڕووتەوە نومایش دراون. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی شارستانیەتی یۆنانی، کە زۆربەی پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤی دابین کردبوو، نەیتوانیبوو (پێڵاو) دابهێنێ. بەڵکو تەنیا لەبەرئەوەی هێشتا (پێی ڕووت) دیسیپلین و کۆنترۆڵ نەکرابوو.

## دەست و کولتوور:

کەواتە ئازادبوونی دەست هەربەتەنیا پەیوەندیی بەشوێنی دەستەوە نیە لەسەر لەش، بەڵکو پەیوەندییەکی تووندیشی هەیە بە کەلتوورەکانیشەوە کە لەش

دابەش دەکەن بەسەر *خوارەوە* و *سەرەوەدا* و خوارەوە دەخەنە خانەی حەرامەوە و بەشی سەرەوەش ئازاد و حەلاڵ دەکەن.

لە کولتووری کوردیشدا ئەم دابەشکردنە هەر ڕاستە: کورد (قۆڵی ڕووت)ی زیاتر لە (قاچی ڕووت) پێ قەبووڵ دەکرێ. ڕاستە لە کولتووری خێڵدا سەری ڕووت وەك *بێڕێزی* لەئاست باوکانی هۆز و خاوەن ئاوتۆریتەکانی خێڵدا لێکدەدرێتەوە، بەڵام هەر لەساڵانی بیستەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا مرۆڤی (سەر ڕووت) وەك مرۆڤی شارستانی و پێشکەوتوو لەقەڵەم دراوە. لەکاتێکدا قاچڕووت بە(لنگ ڕووت) و (بێ دەرپێ) ناوبانگی دەرکردووە و ئەمەش شێوازێك بووە لە سەرکۆنەکردن و ڕووشکاندن. بەگشتی لە نیگارە فۆتۆگرافیەکانی ئێمەدا، هەر لەساڵانی بیست و سییەوە تاکو کۆتایی پەنجاکان، مرۆڤی کورد لەبەردەم کامێرادا هەردوو دەستی بەملاولای خۆیەوە نووساندووە (کە چەندین هۆی دەروونی، کۆمەڵایەتی و شارستانیی خۆی هەیە)، بەڵام لە نیگارەکانی ساڵانی شەست بەدواوە نەك هەر دەست ئازادتر دەبێ، بەڵکو چاومان بەگەلێك سەر ڕووت و قۆڵڕووتیش دەکەوێت، ئەگەرچی هێشتا قاچڕووت کەمتر دەبینین. هەروەها سینەی بەرجەستەبووی ئافرەت لە کولتووری ئێمەدا وەك نیشانەی پێگەیشتن و گەورەبوون و باڵقبوون تەماشای دەکرێت، بەڵام بەلەکی دەرپەڕیو یان سمتی بەرجەستە (بەتایبەتی لای ئافرەتان) وەك نیشانەیەکی بەدڕەفتاری لێکدەدرێتەوە.

** ** **

ئەوەی لەپشت ئەو دابەشکردنانەوەیە کولتوورێکە، نرخی جیاوازی بۆ بەشەکانی لەشی مرۆڤ داناوە و لەخانەی جیاوازیشدا دایان دەنێت. لەم دابەشکردن و نرخاندنەشدا بەشی سەرەوەی لەش زیاتر و زۆر زیاتریش بایەخی پێدراوە. ئەم خاڵەش بە ڕوونی لە زماندا ڕەنگی داوەتەوە، چونکە زمان پێش هەموو شتێك پانتاییەکە بۆ پیشاندانەوەی ناخ و زەینیەتی مرۆڤەکان. هەر لەبەر ئەمەشە دەبینین گەلێك دەربڕین لەزمانی ئێمەدا هەن کە جگە لەماناکەیان، جۆرێ لە پیاهەڵگوتنیشیان تێدایە بۆ بەشەکانی سەرووی لەش: لە

کولتووری ئێمەدا (*گەردن بەرزی، سەر بڵندیی و سەردەستەیی*)، لە(*سەرشۆڕی و سەرکزی*)ی پەسەندترن. هەروەها وەسفمان بۆ (*شان و ملی ئەستوور*) پێخۆشترە وەك لە(*قاچ و ڕانی قەڵەو*). قارەمانە میللییەکانمان بەمرۆڤی (*دەستوەشێن و دەستڕاست*) وەسفکراون، نەك بە قارەمانی (*پێ وەشێن و پێ و قەیەم خێ*)! بەوەسفی (*مەمکی وەك مەشکە و چاوی زەق و پرچ و نینۆکی درێژ*)ی دێوە ئەفسانەییەکانمان زیاتر تۆقێنراوین، تاکو بەوەسفی(*ڕانی هێندەی لادیوار و ئەژنۆی دەرپەڕیوی تیژو ڕەقەڵ*)یان. لەوەسفی کچاندا هێندەی جەخت کراوەتە سەر(*چاوی ژێرپیاڵەییان، گەردنی ساف و بەرزیان، برۆی کەوانەییان، پرچی وەك قەتران و ئاڵتوونیان و قۆڵ و مەچەکی ساف و سپیی وەك شووشەییان*)، هێندە بە(*پاووپووزیاندا، بە قولاپەی پێیاندا، بە قاچی بچکۆلەو پەنجەی کوڵ و باریك و نەرمە پێیان*) دا هەڵنەگوتراوە .

هەموو ئەمانەم بۆیە هێنانەوە تا پیشانی بدەم کولتوور ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە بەرجەستەکردن و داپۆشین و بەتابۆکردن و ئازادکردنی ئەندامەکانی جەستەدا. دەستیش لەم دابەشکردنەدا هەم بەهۆی تۆپۆگرافیەکەی و هەم بەهۆی ئەو وەسفە پۆزەتیڤانەی لەسەری دەکرێن، ئازادییەکی تەواوی هەیە لە جوڵەو چالاکیدا. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێت کە چاوەڕوانیمان لە(دەست) جیاوازترە لە چاوەڕوانیمان لە ئەندامەکانی تری جەستە. چونکە هێزی دەست و بازوو هێزی ئازدی و دروستکردنیشە. ژیان بە *عەرەقی نێوچەوان خۆشترە وەك لە دەرۆزەییکردن*: (**دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە**). هێزی دەست، هێزی بەرفراوانکردنی پانتاییەکانی ژیان و زۆرکردنی بوارەکانی ئەزموونە. بۆیە ئەو کەسەی نەزانێت چۆن دەستی خۆی لەسەر شانۆی ژیان بەکار بهێنێت، ناشبێتە مرۆڤێکی سەرکەوتوو. واتە هونەرمەندانە ناژی. چونکە لەبەکارهێنانی هونەرمەندانەی دەستدا بارانێکمان لە: (***دەستان خۆش، دەستان نەڕزێ و دەستمان لەگەڵ دەستتان بێ***)، بەسەردا دەبارێ. بەڵام کاتێ نەتوانین دەستمان هونەرمەندانە بەکار بهێنین، ئەوە هەورەتریشقەکانی وەك: (***دەستان بشکێ، دەستان بڕزێ و دەستان هەڵوەرێ***)، چەخماخە لێئەدەن.

من باسی ئەوە ناکەم دەست هەیە نەسرەوت و حاڵەت هەیە ئەم دەست ئاگای لەو دەست نامێنێ. هەروەها ناشمەوێ لەسەر ئەوە بڕۆم کەزۆرجار دەست بەئاواتی ئەوەی (دەستخۆشانە)ی لێبکرێ، پەلاماری ئەرکێکی داوەو کەچی ڕۆژگار (دەستشکان) و (دەست بەرئەژنۆنان)ی بەنسیب کردووە. بەڵام بەگشتی دەتوانم بڵێم: دەست لەم سەدەیەدا پتر دەستشکانی کردۆتە شایانی خۆی تا دەستخۆشانە. دەست لەسەدەی بیستەمدا دەستێ بوو، هێندەی حەزی لەبەرزکردنەوەی چەکەکان و هەڵکەندنی قەبر و سەنگەرەکان بوو، هێندە حەزی لە ئیمزاکردن و دەستڕاگرتن نەبوو بۆ قەبووڵکردنی دەستەکانی تر. ئەوەندەی دەستی هەڕەشە و درووشمخواز و تۆڵە بەرزکرانەوە، هێندە دەستی ئامێزگرەوە و دەستی ئاشتیخواز و دەستی تەوقەکەرمان نەدی. یاخود هێندەمان تەوقەی گەرم و گوڕ بینی کە پاشان لەمەیدانەکانی جەنگدا بەخوێن سوور بوون، ئیدی لەئاست هەموو دەستەکاندا کەوتینە گومانەوە. لەخۆمان دەپرسی: چ شتێ گەرانتییە بۆ ئەوەی ئەو دەستەی ئێستا دێتە دەستمانەوە، سبەی دەستمان نابڕێتەوە؟

## کاتیگۆریزەکردنی دەست:

لە (ئەرستۆ)ەوە فێر بووین بۆ تێگەیشتن و ناسینی زیاتری شتەکان و دیاردەکانی دەوروبەرمان، باشترین دەستپێکردن بریتییە لەوەی هەستین بە خانەبەندیکردنیان: (کاتیگۆریزەکردن). دەکرێ ئەمە میتۆدێکیش بێت، بۆ قسەکردن لەسەر جۆرەکانی چەمکی دەست. بێگومان پێش ئەوەی باسی دوو دەستی کۆنکرێتی بکەین، باشترین شت ئەوەیە دەستەکان (بەگشتی) و بەپێی ئەو فۆرمەی لەسەر شانۆی ژیان وەریدەگرن، خانەبەندی بکەین. واتە لەچۆنێتی بەکارهێنانەکەیان ورد ببینەوە بەوجۆرەی دێنە بەرچاومان. بەم پێیەش ئەو سیفەتەی لەساتێك لەساتەکاندا دەبێتە سیفەتی دەست، ئەوە لەهەمان ساتیشدا بۆی دەبێتە ئەو(خانە)یەی کە ئێمە ئەو دەستەی تیا دەبینینەوە. بۆنمونە کولتووری کورد کرداری (دەست بەرئەژنۆنان)، بەنیشانەی بێچارەیی و

تەسلیمبوون دەخوێنێتەوە. کرداری (دەست لەسەر کەمەر)دانان نیشانەی ناز و غرووره: (*ڕاوەستاوە لەو بانە/ دەستی لەکەمەردانە*) و (دەست خستنە بەر کەلەك)یش، لەکاتێکدا ئەوانیتر سەرگەرمی کارکردنن، بەنیشانەی بێموبالاتی و خۆ بەگەورەزانینن و کەم سەلیقەیی لێکدەدرێتەوە. لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەوەش بین کەسیفەتەکانیش ڕێژەیین و لە کولتوورێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێن. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەناو کولتووری ئێمەدا دەکرێت ئەم سیفەتانە بدەینە پاڵ دەست، واتە دەتوانین باس لەدەستە (دۆشداماوەکان)، دەستە(پۆڵایین و شۆڕەوەبووەکان)، دەستە (ڕاست و خوارەکان)، دەستە (بڵاو و نوقاوەکان)، دەستە (چرووك و بەخشندەکان)، دەستە(خاوێن و ناپاکەکان)، دەستە (ئازا و لەرزیوەکان)، دەستە (کورت و ڕۆیشتووەکان) و دەستە (شەڕانی و ئاشتیخوازەکان) و.. بکەین. ئەمانەش هەمووی لەکاتی قسەکردن و ڕاڤەکردنمان بۆ مانای ئەو کردارانەی دەست (بەشێوەیەکی گشتی) پێیان هەڵدەستێ.

** **

بەڵام لەکاتێکدا بمانەوێت دوو دەستی کۆنکرێتی بناسین و مانای ئەو سیفەتە تێبگەین کە بەهۆی چۆنێتی بەکارهێنانیانەوە بەخۆیانی دەبەخشن، ئەوە سیستەمی خانەبەندیکردن جێدەهێڵین و ڕاستەوخۆ ئاماژە دەکەین بۆ (جەستە) وەك پانتاییەکی زیندوو کە بەشێوەیەکی ئازاد ئەندامێکی خۆی دەخاتە جووڵە و کارپێکردن. واتە هێما بۆ چۆنێتی بەکارهێنانی ڕۆژانەی دەست لەلایەن مرۆڤەکانەوە و لە بارودۆخی جیاوازدا، دەکەین. بۆنمونە با لەکرداری (تەوقەکردن)ی دوو مرۆڤ لەژیانی ئاسایی ڕۆژانەدا وردببینەوە :

لەبنەڕەتدا کاتێ دوو دەست بەنیازی تەوقەکردن دەچنە ناو یەکەوە، یان کاتێ کەسێك دەستی دەهێنێ بەشان و سەری یەکێکی تردا و بەوجۆرە، ئەوە دەست تەنیا وەك ئەندامێکی لەش بەکاردەهێنرێت بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ لەشێکی تردا. واتە ئەوەی لەتەوقەکردندا ڕوودەدات، ئەوەیە کە دوودەست دەبنە پرد و تەنیا دوو جەستەش بەیەکتر دەگەیەنن. هەڵبەتە باسی گەرم و گوڕی و ساردیی

جۆری تەوقەکردنەکە ناکەم، کە دەشییێت زۆر شتمان لەسەر ئەنجامەکانی ئەو تەوقەیە و  بارودۆخی دەروونیی تەوقەکەرەکان پێبڵێت. ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئاماژەکردنە بەو (سنوور)ەی کرداری تەوقەکردن لەنێوان دوو مرۆڤدا دەیسەپێنێ. واتە سنووری بەپردبوونی دەست لەنێوان دوو جەستەدا و بەس. پردێ کەسەرەتاکەی لە جەستەی مرۆڤێکەوە دەستپێدەکات و لەجەستەی مرۆڤێکی تردا کۆتایی پێدێت. ئەوەی لەم پەیوەندیەدا دەیبینین ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتیە کەدەشییێت ماناکەی بریتیبێ لە(سەرەتای ئاشنایەتی) ئەو دوو مرۆڤە بەیەکتر، یان (تازەکردنەوەی) ئەو ئاشنایەتیە، یاخود (ئاشتبوونەوە)یان. لەو سێ مانایەدا، دەکرێ دەستەکان بە نوێنەر و گەیەنەری خواست و ویستی دوو کەس تێبگەین لەپێناوی هێنانەکایەی کەشێکی هاوبەشدا. بەدەربڕینێکی تر، تەوقەکردن کردارێکە تیایدا دوو جەستە هەریەکەیان (لەخۆی درێژدەبێتەوە) تا لەخاڵی سێهەمدا بەیەك بگەنەوە کە خاڵی(هاوبەش)ـە. واتە خاڵی پێکەوەبوون و خاڵی یەکتر قەبووڵکردن و ئاشتی. بەڵام دەمەوێت بەبیری خوێنەری بهێنمەوە، کەئەم خاڵەهاوبەشە تائەوکاتەی تەنیا هەر لەنێوان دوو جەستەی کۆنکرێتیدایە، خاڵێکی کاتی و ڕاگوزەریشە. واتە خاڵێکە تەنینەوەی نیە و تەنیا وەك نەریتێکی کۆمەڵایەتیش (نەریتی تەوقەکردن) دەمێنێتەوە.



## به سێمبوولبوونی دەست:

بەڵام ئاخۆ لە چ کاتێکدا دوو دەست دەبنە هۆی فراوانکردنی پانتایی ئاشتی و تەبایی و خۆیان لە نوێنەری دوو جەستەوە دەکەنە نوێنەری هەموو جەستەکانی تر؟ ئاخۆ تەوقەکردنێك هەیە ببێتە هۆی گواستنەوەی ویستی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکان بۆ هێنانەدی کەشێکی هاوبەش؟ ئاخۆ دوو جەستە بتوانن بەهۆی درێژبوونەوەیان بەرەو یەکتر، سنووری ئەو درێژبوونەوەیە بشکێنن و جەستەکانی تریش لەیەکتر نزیك بخەنەوە؟

یەکەم هەنگاو بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە ئەوەیە، کە(دەست) لەپلەی ئەندامێکی جەستەوە بەرزبکەینەوە بۆ پلەی دەست وەك سێمبوولێك. واتە هەرکات لەپشت تەوقەکردنی دوو دەستی کۆنکرێتییەوە، حەزی نزیکبوونەوە و ویستی درێژبوونەوەی جەستەکانی ترمان بۆ لای یەکتری هەستپێکرد، ئەوە لەبەردەم دەستداین وەك سێمبوولێك. چونکە دەست کاتێ دەبێتە سێمبوول، کە بتوانێت لەسەر بنەمای ئەو لێبووردن و سنگفراوانیەوە کە لەساتەوەختی تەوقەکردنیدا لەگەڵ دەستێکی تر دەیهێنێتە دی، سنگفراوانی و لێبووردنێکی گەورەتریش لەلای ئێمە دروستکات. دەست کەدەبێتە سێمبوولێك، هەمیشە توانای هەیە لەودیو ئاشناکردنی یەکەمجاری دوو مرۆڤ بەیەکتر، حەزی ئاشنابوونیش لەئێمەدا بڕوێنێ. توانای هەیە لەودیو تازەکردنەوەی ئەو ئاشنایەتیەوە هانمان بدات بۆ تازەکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ هەموو ئاشناکانمان و هەروەها لەپشت ئاشتکردنەوەی دووکەس و لایەن و ئاراستەوە، توانای هەبێ (ئاشتی) وەك بەهایەك بگێڕێتەوە بۆ ناو ژیان و بیرکردنەوەمان.

تەنیا لەو حاڵەتانەدایە کە دەستی بەسێمبوول بوو، دەبێتە پردێك تا سنووری نێوان دوو جەستەی کۆنکرێتی ببەزێنێت و بەناو جەستەی کۆمەڵگادا بتەنێتەوە. کەش و هەوای (کاتی)ی لەنێوان دوو جەستەدا بگۆڕێ بەکەش و هەوایەکی (هەمیشەیی) ناو ڕۆحی ئەندامانی کۆمەڵگاو زەمینەی هاوبەشی نێوانیان پتەوتر بکات. پاشان لە نەریتێکی خووپێوەگرتووی کۆمەڵایەتیشەوە ببێتە یاسایەکی ڕێزلێگیراو لەبواری هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا.

## دەست و کات:

کەی دەست دەبێتە سیمبوول؟ لەڕاستیدا دەست هەمیشە بۆی هەیە ببێتە سیمبوول، بەڵام بەسیمبوولبوونی دەست شتێ نیە پێشتر بڕیاری لەسەر درابێت. چونکە کاراکتەری (بەسیمبوول بوون) نرخێکە پاشتر دەدرێتە دەست، ئەویش لەپاداشتی جۆرێك لە بەکارهێنانی دەستدا لەسەر شانۆی ژیان. واتە بەکارهێنانێك کەتیایدا دەست فرسەتێکی دێتەدەست و خۆی تیا تاقیدەکاتەوە. لەئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیەوەیە کەنمرەی بەسیمبوولبوونی دەدرێتێ. بۆیە پرسیاری سەرەکیی ئەوە نیە کە بڵێین: کەی دەست دەبێتە سیمبوول؟ بەڵکو دەبێ بپرسین: سرووشتی بەسیمبوولبوونی دەست چییە؟ ئایا ئەو سیمبوولە سیمبوولێکی شەڕانییە یاخود ئاشتی خواز؟

بێگومان ئەگەر هەرتەنیا ساتەوەختی بەیەك گەیشتنی دوو دەست وەربگرین و لەچەشنی وێنەیەکی فۆتۆگرافیدا بیر لەو دوودەستە بکەینەوە کەبۆ هەمیشە پیشانی دەدات تەوقە لەگەڵ یەکتر دەکەن، ئەوە دەبێت بڵێین هەموو بەسیمبوولبوونێکی دوو دەست لەناو یەکتردا، سیمبوولێکی ئاشتیخوازانەیە. چونکە ئەوەی ئێمە لەساتەوەختی تەوقەکردنی دوو دەستدا دەیبینین ڕووخساری گەشی تەوقەکەرەکانە کاتێ دەڕواننە یەکتر، یاخود تەماشای چاوی کامێرای ڕۆژنامەنووسەکان دەکەن تا پەیمانەکەیان بەئێمە بگەیەنن. ئەم دیمەنەش شتێ نیە لەو ساتەدا لێی بەدگومان بین و تەنانەت لەسەر ئەزموونە نائومێدکەرەکانی ڕابردووشمانەوە لەگەڵ خاوەنی ئەو دەستانە و لەگەڵ ناپاکیی ئەو دەستانە، داوەرییان لەبارەوە بکەین. چونکە بەڕاستی پەیامی دوو دەست لەکاتی تەوقەکردندا ناتوانێت لەخۆدەرچوونی جەستە و درێژبوونەوەی نەبێت بەرەو جەستەیەکی تر. ناتوانێت داواکاریی جەستەیەك نەبێت بۆ نزیکبوونەوەی لە جەستەیەکی تر و پاشانیش ناتوانێت داوایەك نەبێت بۆ نزیکخستنەوەی هەموو جەستەکان لەیەکتری. ناتوانێت ویستی مرۆڤ نەبێت بۆ هێنانەدی خاڵی سێهەمی هاوبەش و ناشتوانێت هەوڵدان نەبێت بۆ فراوانکردنی ڕووبەری ئاشتی.. لەبەرئەوە ناتوانین لەپێشەوە گومان لەم خاوێنییە

سەرەتاییە بکەین کە دوو دەست لەکاتی تەوقەکردندا دەریدەبڕن. کەواتە پێکگەیشتنی دوودەست لەساتەوەختی یەکەمدا هەمیشە دەیانکاتە سێمبوولێکی ئاشتیخواز.

بەڵام ئەوەی گەرانتیی بەپایەداری مانەوەی سێمبوولێکی ئاشتیخواز دەکات و ناهێڵێ ببێتە سێمبوولی شەڕ، (داهاتوو)ە. داهاتوو داوەرێکی هەمیشەییە بەسەر خۆنواندنی (ئێستا)ی دەستەکانەوە. چاوەڕوانیی داهاتوو لەدەستەکان هەر تەنیا لەوەدا کورتنابێتەوە کە لەپێناوی ساتی تەوقەکردنیان و بەریەککەوتنێکی کورتخایەنیاندا، مەدالیای شانازییان بداتێ. یاخود بەرزیان بکاتەوە بۆسەر ئاستی سێمبوولێکی ئاشتیخواز. بەپێچەوانەی (ڕابردوو)ەوە کە ناتوانێت هیچ بڕیارێکی خۆی بگۆڕێت و بەپێچەوانەی (ئێستا)وە کە دەشێێت دەسخەڕۆی چاوبەستی بڕیارە لەپڕەکانی خۆی بێت، ئەوە (داهاتوو) هەمیشە ئامادەیە هەڵوێستێکی دیکە لەبەرامبەر ئەو شتانەدا وەربگرێت کە(ڕابردوو) و (ئێستا) بڕیاریان لەسەر داون. جوانیی داهاتوو ئەوەیە کە دەتوانێت مەدالیا و شانازییە بەخشراوەکان (کەپێبەخشراوەکان شایانیان نەبوون)، بسەنێتەوە و سێمبوولەکانیش بێ بایەخ بکات.

کەواتە ئەوەی داوەری بەسەر ڕەفتار و چۆنێتی بەکارهێنانی دەستەکانەوە دەکات، ئەم تینوێتی و سووتانەی ئێستای ئێمە نیە بۆ ئاشتی و تەبایی کە لەئەنجامی هەڵوەشانی جەستە و تەنیایی ڕۆحیمانەوە هاتووە. بەڵکو ئەوەی حوکمی کۆتایی دەردەکات (داهاتوو)ە. کاتێ داهاتوو دەبینێ دەستەکان بەبەردەوامی لەسەر شانۆی ژیان هونەرمەندانە بەکارهێنراون و لەپێناوی بەرفراوانکردنی سنوورەکانی ئاشتی و سنگفروانیدا یەکتریان گوشیوە، دەکەوێتە دەستخۆشانە لێکردنیان. بەم پێیەش دەست خستنەناودەست پرۆژەی بیناکردنی ئایندەیە و ڕایەڵکردنی پردێکە لەجیهانی ئەمڕۆی خۆمانەوە بەرەو دنیای دەرەوەی خۆمان کە سبەینێیە. ڕێك ئالێرەشدایە دەتوانین باسی (ستاتیکای تەوقەکردن) بکەین. چونکە هەموو هەوڵدانێك کە عەشقی ئایندەمان

تێدا دەخرۆشێنێ، هەوڵدانێکی ستاتیکییە و لەحوکمی سازدانی جیهانێکی تر و ئەڵتەرناتیڤێکدایە بۆ قەیرانەکانی ئەمڕۆ.

دەست ئەگەر نەیتوانی لە پردی نێوان جەستەکانەوە ببێتە پردی نێوان دڵ و ڕۆحە ماندووەکان، ئەوە دەبێت هەمیشە لێی بەدگومان بین و پرسیارە سادەکەمان دووبارە بکەینەوە:

***ئایا ئەوکاتەی دەست هیچ ناکات، چی دەکات؟*** تابەهۆی ئەم پرسیارەوە بەبیری خۆمانی بهێنینەوە کە دەست ئازادترین ئەندامی پڕ *مەترسی* جەستەیە.. چونکە چ شتێ گەرانتییە بۆ ئەوەی ئەو دەستەی ئێستا دێتە دەستمانەوە، سبەی دەستمان نابڕێتەوە؟

1.8.1998

کۆپنهاگن، لەندەن



# هەندێ پەرەگراف لەبارەی (نیگا)وە..

*(ئەو شێواز و فۆرمەی هەستیاریی مرۆڤی لە سەرەوە ئۆرگانیزە بووەو ئەو کەناڵەی لێوەی دەردەبڕدرێت، هەر بەتەنیا سرووشتیی نییە، بەڵکو پابەندی هەلومەرجە مێژووییەکانیشە).*

*واڵتەر بنیامین*

کردەی بینین‌و ڕوانین (تەماشا) هەر بە تەنیا لە پەیوەندییان بەهونەر و ئێئێستاتیکاوە جێگەی سەرنج نین، بەڵکو پەیوەندییەکی توندیشیان هەیە بەهەموو تێگەیشتنی ئێمەوە لەواقیع. بەئەندازەیەك دەتوانین بڵێین ئێمە بەهۆی بینینەوە لەدەوروبەری خۆمان تێدەگەین و لێرەشەوە، ***نیگا و زمان و بیر*** لەیەکدی جیا ناکرێنەوە. هەر بۆیەشە ناتوانین باس لە ((تەرجەمە))یەك بکەین لە بینینەوە بۆ زمان، لەوێنەوە بۆ وشە، چونکە هەموو وێنەسازدانێك لەسەر دەوروبەر و شتەکانی ناوی، لەهەمان کاتیشدا ***بیرکردنەوە***یەکە لەبارەیانەوە. لەم نێوانەشدا چاو هەربەتەنیا ئۆرگانێکی وەرگر و پاسیڤی بینراوەکان و تەماشاکراوەکان نییە. بەڵکو هەموو دروستکردنی مانایەك، هەموو کردنەوەی کۆد و ڕەمزێك پابەندی هەلومەرجە کولتوورییەکانە و ئەنجامی پرۆسەیەکی بڕیار لەسەر دراوە، کە چەندین هۆکار ڕۆڵی تیا دەبینن. بەمانایەکی تر، ئێمە تەنیا ئەو شتانە دەبینین کە دەمانەوێت بیانبینین، چونکە بینین لەهەمان کاتیشدا نەبینین و چاوپۆشینیشە.

لەگەڵ ئەوەشدا دیتن و تەماشاکردنی ئەو شتانەی دەکەونە بەرچاو، سەرچاوەیەکی سەرەتایین بۆ زانین‌و ئەزموونەکانمان وەك مرۆڤ. ئێمە بەهۆی چاومانەوە بەشێکی زۆری شوناسی خۆمان لەسەر دەوروبەر بەدەست دەهێنین.

جیهان لەڕێگەی نیگاوە باوەشمان بۆ دەکاتەوە و ئێمەش کاتێ لەناویدا هەست بەئامادەیی خۆمان دەکەین، کە بوونی خۆمان لەپەیوەندی لەگەڵ شتەکان و فەزای دەوروبەدا دەبینین. لەهەمان کاتیشدا، هەر بەیارمەتی بینینە کە لەوەخت و بێوەختدا سەرمان دەسوورمێ و لەژێر کاریگەری ئەوەشدا کە دەیبینین، ((چاومان دەپەڕێتە پشتی سەر))مان! و ((بەچاوی خۆمان بڕوا ناکەین)). واتە شتی سەیر و جیاواز دەبینین و بەهۆی نیگاکردنەوە خۆمان لەبەردەم ڕێگاچارەی دیکەدا دەبینینەوە، یان تیژبینانە ئەو مەترسیانە دەبینین کە بەسەرهەڵدانیان دەشێت ئارامیی ژیانمان تێکبدەین.

بەلام ئێمە هەروەکو چۆن زۆرجار تێدەگەین کە هیچ تێنەگەیشتووین، ئاواش زۆرجار تەماشا دەکەین بەبێ ئەوەی هیچمان بینیبێت. ئەمەش ئەو دژایەتییە پێکهێنەرەی ناو (هەستی بینینمان)ە و جیاوازیی دەخاتە نێوان دوو جۆر بینینەوە: (بینینی ئاگایانە) و (نائاگایی بینین). واتە ئیمکانمان دەداتێ لەبارودۆخی ئاگایانەی ڕوانینەوە (بۆ نموونە ئاگا بەتەماشاکردنی تابلۆیەك)، بپەڕینەوە بۆ بینینێ کە نائاگا دەمانگەیەنێت بەبارودۆخێك، کە تیایدا دەکەوینە ئاشکراکردنی نەدیتراوەکان (واتە دەچینە ناو جیهانی تابلۆکەوە و لەمەتریالیەتی ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی دەپەڕینەوە)، بەمەش بینینەکەمان بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی شهوود. لێرەشەوە (نەزانین و نەبینین) بەشێکی گرنگە لە سیحری نیگا: نیگا ئەو بینینەیە کە دەمانخاتە ناو شوێن و فەزای دیکەوە، لەجێگایەکەوە دەمانبات بۆ یەکێکی تر و لەوێشدا ئیمکانی دیتنی ئەو شتانەمان دەداتێ کە ناتوانین لەهیچ جێگایەکی تردا بیانبینین.





بەڵام هەرچۆنێك ڕاڤەی نیگا بکەین هێشتا ناتوانین خۆمان لەڕاستییەك بشارینەوە، کە پێماندەڵێت: نیگا دەربڕینێکە بەچاو، یاخود دەربڕینە لەچاودا. چاو وەك ئەندامێکی ئۆرگانیی لەش. سەفەری ئەم دەربڕینە لەسنووری چاوەوە بەرەو دنیای دەرەوە دەڕوات، بەڵام لەهەمان کاتیشدا سەفەری گەڕانەوەیشە بۆ ناوەوە. چونکە چاو وەك ئۆرگانێکی بایۆلۆژی، بە(ئاوێنەی ڕۆح)یش ناوی دەرکردووە. بۆیە دەکرێت بڵێین: (چاو)، سنوورە لەنێوان دوو جیهاندا: یان کەناڵێکە بەرەو جیهانی ماتەریالیی دەرەوە (بەرەو دار و درەخت و شتەکان و هتد...)، یاخود ڕێگایەکە بەرەو ناوەوەی ڕۆح. لەزۆر کاتیشدا چاو و توانای بینینەکەی، دەبەسرێن بەتوانای ئاگاییەوە بۆ تێگەیشتن. واتە هەموو (بینینێ) بەمانای (تێگەیشتن) و پەیبردنە بەنهێنییەکان. کیەرکەگۆردی فەیلەسووف نووسیویەتی: (*ئاژەڵ چاوی هەیە، بەڵام تەنیا مرۆڤ خاوەنی نیاگایە*).
ئەگەرچی لەڕوانگەی ئاراستە ئیتیکیەکانی ئەمڕۆوە، کە داوای مافی یەکسان بۆ ئاژەڵ دەکەن، ئەم گوتەیە شوێنی ڕەخنەیە، چونکە لەڕوانگەی بەسەنتەرکردنی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام هێشتا دەتوانین بڵێین: بەم گوتەیە نیگا دەبێتە تایبەتمەندیی چاوی مرۆڤ نەك هی ئاژەڵ، چونکە نیگا هەر ئەنجامی ئیشکردنی چاو نییە وەك ئۆرگانێکی لەش، بەڵکو گەیەنەر و دەربڕی مانایە لەناوەوە بۆ دەرەوە و هەڵگری پەیامی ناخ و قوڵاییەکانیشە.
کاتێ مرۆڤ تەماشا دەکات، هەمیشە تەماشای شتێ دەکات و لەژێر نیگای خۆیدا شتەکان ڕادەگرێ. بەڵام هەمیشە بەنیگاکەی شتێکیش لەسەر ناخی خۆی دەڵێت. لێرەشەوە جیاوازی هەیە لەنێوان (تەماشاکردن) و (نیگاکردن)دا. یەکەمیان کردەیەکە چاو وەك ئۆرگانێکی بایۆلۆژی جێبەجێی دەکات و ئەمەش خاڵی هاوبەشی نێوان ئێمە و گیاندارەکانی دیکەیە. بەهۆی ئەم کردەیەوە چاو شتەکان لێکدی جیادەکاتەوە، دەیانناسێتەوە و تۆماریان دەکات و هتد، بەڵام نیگاکردن هەمیشە شتێکی، یان ئەرکێکی زیاتر لەوانە جێبەجێ دەکات، چونکە دەشبێتە هەواڵدەر و پەرچکەرەوەی ناخی نیگاکەر و ئەو (خود)ـەی کە نیگای ئاراستەی شتەکان دەکات.

(چاو) وەك ئەندامێكی بایۆلۆژی، كرانەوەیەكە (انفتاح) لەسەر سنووری پانتایی لەش، دەتوانین بەدوو ئاراستەدا ئەو سنوورە بناسینەوە: دەتوانین وەك ئاماژەیەك یان وەك تیرێك تەماشای بكەین كە هێما بۆ (دەرەوە)ی جەستە دەكات. تیرێ كە لەسەر سنووری لەش، لەسەر ئاسۆی لەش و لەو شوێنەدا (پێڵوو) هەر ساتەناساتێ دەبێتە پەردەیەك، ڕێنومایییمان دەكات (بەودیودا)، بەرەو جیهانی مەتەریالیی دەرەوە. بەڵام لەهەمان كاتیشدا تیرێكە بەرەو ناخ و ڕێگای چونە (ناوەوە)مان پێشاندەدات. بانگهێشتنمان دەكات بەرەو ناخ. وەك ئەو دەروازەیەی بەكرانەوەكەی خۆی قوتمان دەداتە ناو جیهانی قەیسەری و بازاڕەكانەوە. هێندە هەیە دەروازەی چاو ئەمجارەیان قوتمان دەداتە ناو دنیای نامەتەریالی و قەیسەرییەكانی ڕۆحەوە. لێرەشەوە، ئەو چاوەی پڕە لەنیگا، هەر تەنیا پڕنییە لە تەعبیر، بەڵكو پڕیشە لە مەعنەویەت. هەر لەبەر ئەم خاڵەش دەبێتە ڕاستگۆترین شایەتێ بەسەر نیەت و چۆنایەتی ناوەكیی دنیای ناخی مرۆڤەوە. ئێمە لەچاوی یەكتردا تەماشای خۆمان ناكەین، بەڵكو لەنیگای یەكتردا وەك مرۆڤ خۆمان دەبینینەوە. (تەماشاكردن) ئیشكردنە بەچاو وەك ئۆرگانێكی جەستەیی كە شتەكان دەناسێتەوە، داتایان دەكات و لێكدی جودایان دەكاتەوە. بەڵام (نیگا) شوێنی بەیەك گەیشتنی ئێمەیە وەك مرۆڤ و ئاشكراكەری پانتاییە ئینسانییەكانی ئێمەیە. هەر بۆیەشە ئەو چاوەی لە نیگا خاڵی بێت،ناتوانێت ببێتە پەناگە و داڵدە بۆ ئینسانیەتی مرۆڤێكی تر. چونكە ئەو چاوە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆحدا پساوە و تەنیا لەئاستی كاركردە ئۆرگانیەكەیدا ئیشدەكات: وەك چاوی ئەو كارمەند و كەسانەی كە لەناو كۆژانەكانماندا تەماشامان دەكەن، بەڵام نامان بینن و هەستمان پێناكەن چونكە ئەوان دەروازەیەكیان نییە بچێتەوە سەر قوڵاییەكانی ڕۆح..

لەپەیوەندی بەباسەكەی ئێمەوە، مرۆڤ لەدوو حاڵەتدا وەك مرۆڤی تەواو حسابی بۆ ناكرێت بەمناڵی و لەكاتی سەرەمەرگدا. چاوی مناڵی چاوێكی تەماشاكەرە و چاوێكە هێشتا پڕ نەبووە لەنیگا. لەسەرەمەرگیشدا، مەرگ كاراكتەری مرۆڤبوونمان لێدەستێنێتەوە و لێرەشەوە بۆدواجار نیگامان پێ دادەخات.

بەڵام حاڵەت هەیە بەدەر لەمناڵی و سەرەمەرگ، کە نیگا نەك هەر نابێتە پانتایی تەحقیقکردنی ئینسانیەتمان، بەڵکو شەڕانیەتی ناوەوەشمان ئاشکرا دەکات. ئەمەش کاتێکە کە سنوورەکانی مرۆڤبوون (پێشێل دەکرێن) و نیگا دەبێتە ئامرازێك بەدەست کینەی ناخەوە. وەك چاوی جەللاد لەنیگایدا بۆ قوربانی. وەك چاوی حەسوود، چاوی پیس، یاخود وەك لەزمانی ڕۆژانەدا دەگوترێت: چاوێ کە (پێمان هەڵنایە)!

نیگا پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بەدروستبوونی خودێتی مرۆڤەوە و بەرجەستەکەری ئەو خودێتیەیە. نیگا لەهەمان کاتدا کە شتێ دەبینێت، خودێتی، هەستیاری و ئاگایی مرۆڤیش بەسەر ئەو شتەدا، ئەو کەسانەدا و ئەو جیهانەدا (دەپرژێنێ) کە دەیان بینێت و کە دەبنە بابەتی نیگاکردنەکە. لێرەشەوە نیگا پەیوەندییەك لەنێوان خودی بینەر و بابەتی بینراودا دروست دەکات. بەڵام دەشێت ئەم تەوژمە بەپێچەوانەشەوە بپرژێت: واتا ئەو بابەتەی دەکەوێتە بەر نیگای تەماشاکەر، یەکسەر ئەو نیگایە بەخۆیەوە گیرۆدە بکات. کاتێ مرۆڤێ بەیەکێکی تر دەڵێت: (لەیەکەم نیگاوە خۆشمویستی)، ئەوا باس لەگەڕانەوە و پەرچبوونەوەی پرژنگی نیگا کراو دەکات بەرەو نیگاکەر. باس لەگیرۆدەبوونی نیگا دەکات لەئاست ئەو بابەتەدا کە نیگامان لێدەدزێت. واتا ئەوکاتەی کە نیگاکراو تەوژمی خۆی بەرەو نیگاکەر دەپرژێنێ..

نیگا واتا بینین، بینینیش هاومانایەکی ترە بۆ (تێگەیشتن و دەرککردن). ئێمە بەیەکتر دەڵێین: (تۆ بارودۆخی من نابینیت) واتا تۆ لە بارودۆخی ژیانی من تێناگەیت. لێرەشەوە مەرجی ئەوەی بتوانین چاو بەدنیادا بگێڕین و شتەکان بخەینە بەر نیگامان، تەنیا ئەوە نییە خاوەنی ڕۆحێك بین، بەڵکو ئەوەیشە کە بتوانین ببینین و دەرك بکەین. دەرککردن هەم واتای (تێڕوانین) و پەیبردن بەناوەوەی شاراوەکان دەگەیەنێت، هەم مانای دەرککردن و (لێوەڕوانین) بەرەو دەرەوەش: واتا توانای ئایندەبینین. کاتێ بەکەسێ دەگوترێ (زەینڕوون)، یان (چاوکراوە)، ئەوە گوتراویشە نیگای ئەو کەسە لەئاست ژیاندا کراوەیە. واتا ژیان بەبێ هیچ بەربەستێ لەهەموو کاتێکدا سەفەر دەکاتە ناو نیگا و

ڕوانینیەوە. هەندێکی تر، نیگایەکی (تیژ)یان بۆ بارودۆخەکانی ژیانی خۆیان و کەسانیتر هەیە. لەم کاتەشدا نیگا وەك دووربینێك وایە کە دەتوانێت هەندێ ووردەکاری و گۆشە ئاشکرا بکات و لەمەترسی و کاریگەری ئەو نادیارانەمان ئاگادار بکاتەوە، کە ژیانمان دەشێوێنن و زامدارمان دەکەن. دەتوانین (بەدبینانە)ش بڕوانینە ژیان و جیهان، هەروەکو چۆن دەکرێت بەبێ هیچ تێڕوانینێکیش بۆ ژیان بمێنینەوە.. لەزۆر بواری دیکەشدا نیگا مانای تر بەخۆیەوە دەگرێت: نیگامان هەیە نیشانەی (گوێڕادێران)مانە بۆ داستان و بەسەرهاتی بەرامبەرەکەمان، هەمانە (ورد دەبێتەوە) و لە ڕوخساردا بۆ شتێ (دەگەڕێت)، هەمانە (سەرسووڕمانی) بەرجەستە دەکات، هەشمانە( پرسئامێزە)و هەیشە (گوماناوی) و بەو جۆرە..

لەهەموو ئەم بارودۆخانەدا کە باس لە تێڕوانین بۆ ژیانو جیهان دەکەین و جۆرەکانی بینین ناودەهێنین: (تیژ بینی، ئایندە بینی، بەدبینی و هتد)، ئەوە باسی ژیان و جیهان دەکەین وەك ئەنجامی چۆنایەتی ڕوانین و نیگاکردنەکەمان. لێرەشەوە، نیگا وەك تێرمێکی گشتی لێدێت، کە دەبێتە نیشانە بۆ هابیتۆسێکی تایبەت. واتا وەك سەرجەمی هەڵوێستی خودی نیگاکەر لەبەرامبەر جیهاندا و وەکو جیهانیش وەك ئەوەی لەچاوی نیگاکەردا بەرجەستە دەبێت. چونکە ئێمە لەسەرەتاوە گوتمان: چاو هەر بەتەنیا وەرگرێکی پاسیڤی بینراوەکان و تەماشاکراوەکان نییە. هەموو دروستکردنی مانایەك هەموو کردنەوەی کۆد و ڕەمزێك پابەندی هەلومەرجە کولتوورییەکانە و ئەنجامی پرۆسەیەکی بڕیار لەسەردراوە، کەچەندین هۆکار ڕۆڵی تیا دەبینن. بەمانایەکیتر، ئێمە تەنیا ئەو شتانە دەبینین کە دەمانەوێت بیانبینین، چونکە ویستی بینین لەهەمان کاتیشدا ویستێکە بۆ چاوپۆشی.

دەتوانین ئەنجامگیری ئەوە بدەین بەدەستەوە و بڵێین: نیگا پەیوەندیەك لەنێوان نیگاکەر و نیگاکراو و لەنێوان خود و بابەتدا دروستدەکات. ئەمەش پێماندەڵێت، کە ڕوانینە شتەکان و بابەتەکان هەر بەتەنیا تۆمارکردن و بەداتاکردنێکی پاسیڤانەی میکانیکی چاوی مرۆڤ نییە بۆ دەوروبەری خۆی.

بەڵکو کردەیەکی چالاکانەی خودی نیگاکەرە لەبەرامبەر جیهانی دەرەوە و بابەتەکانی ناویدا. ئەنجامی ئەم کردەیەش، واتا ئەم مامەڵە دیداریە، هەم لەژێر کاریگەری خەسڵەتی شت و بابەتە بینراوەکانی جیهانی دەرەوە و هەم لەلایەن (شێوەی نیگاکردن)ی خودی بینەر و بەپێی ئەو (بەرژەوەندیانە)ش کە ئەو لەو نیگایە بەدەستیان دەهێنێت، دەست نیشان دەکرێت. بۆیە دیتن و تەماشاکردن، سەرچاوەیەکی سەرەتایین بۆ بەدەستهێنانی زانین و ئەزموونەکانمان وەك مرۆڤ. ئێمە بەهۆی چاومانەوە بەشێکی زۆری شوناسی خۆمان لەسەر دەوروبەر بەدەست دەهێنین. جیهان لەرێگای نیگاوە باوەشمان بۆ دەکاتەوە و ئێمەش کاتێك لەناو جیهاندا هەست بە ئامادەیی خۆمان دەکەین، کە بوونی خۆمان لە پەیوەندی لەگەڵ شتەکان و فەزای دەوروبەردا ببینین. بەمانایەکی تر، نیگاکردن هەر بەتەنیا کردەیەکی سرووشتیی چاو نییە، بەڵکو پابەندی هەلومەرجە مێژووییەکانیشە وەك لەو گوتەیەی بنیامیندا دەردەکەوێت، کە کردمە سەرەتاگەی ئەم وتارە.

** **

بەتایبەتی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە، کە مرۆڤ توانی ئامێرەکانی وەك (دوربین، کامێرای وێنەگرتن، میکرۆسکۆب) و پاشان لەم سەدەیەشدا (لینز، زووم و ڤیدیۆ و تەلەفزیۆن) دروست بکات، ئەوە توانیشی باشتر (تەماشا) بکات. بەڵام نەك بەزەرورەت باشتر و قووڵتر (ببینێت). قووڵتر بینن پەیوەندییەکی توندی هەیە بە نیگای مرۆڤەوە بۆ مرۆڤی تر و ئەمەش شتێ نییە تەنها بەهۆی ئامێرەکانی تەکنەلۆژیاوە جێبەجێ بکرێت. نیگا هەر زەمەنی تێڕامانی مرۆڤ نییە لە مرۆڤ، بەڵکو شوێنێکیشە بۆ داڵدەدانی نیگاکراو. چونکە ئەو چاوەی پڕە لەنیگا، هەر تەنیا پڕ نییە لە تەعبیر، بەڵکو پڕیشە لە مەعنەویەت. ئێمە لە چاوی یەکتردا تەماشای خۆمان ناکەین، بەڵکو لە نیگای یەکتردا وەك مرۆڤ خۆمان دەبینینەوە. (تەماشاکردن) ئیشکردنە بەچاو وەك ئۆرگانێکی جەستەیی کە شتەکان دەناسێتەوە، داتایان دەکات و لێکدی جودایان دەکاتەوە. بەڵام (نیگا) شوێنی بەیەکگەیشتنی ئێمەیە وەك مرۆڤ و

ئاشكراكەری پانتاییە ئینسانیەكانی ئێمەیە لەبەرامبەر یەكتردا. هەربۆیەشە ئەو چاوەی لەنیگا خاڵی بێت، ناتوانێت ببێتە پەنا و داڵدە بۆ ئینسانیەتی مرۆڤێكی تر. چونكە ئەو چاوە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆحدا پساوە و تەنیا لە ئاستی كاركردە ئۆرگانیەكەیدا ئیشدەكات.
سەردەمی ئێستا لەسەر ئاستی (تەماشاكردن) لەهەموو سەردەمێ زیاتر چاوبرسیترە و چاو دەگێڕێ و بەهەموو لادا دەڕوانێت. هیچ شتێ نەماوە تەماشا نەكرابێت و نەكرابێت بە وێنە.. بەڵام لەسەر ئاستی (نیگا) ئەم سەردەمە، هەروەكو فەیلەسووفی ئیتالی پۆڵ ڤیریلیۆ دەڵێت: لەهەموو كاتێك كوێرتر و نابیناترە. مەترسییەكەش هەر لەوەدا نییە كە تەماشا دەكات بەبێ ئەوەی ببینێ، بەڵكو لەوەدایە كە تەماشا دەكات بەبێ ئەوەی بزانێت كە نابینێت.. ئەمەش لوتكەی ڕووالّتكەرایی ئەم سەردەمە..

١٩٨٨



# کتێبەکان، هاوڕێکان، مەرگ و بیرەوەری..



***والتەر بنیامین***، فەیلەسووف و ڕەخنەگری ئەڵمانی لە وتارێکیدا دەنووسێ: ***(لەڕاستیدا نووسەرەکان کەسانێك نین لەبەر مەژاری کتێب بنووسن، بەڵکو لەو کتێبانە ڕازی نین و خۆشیان ناوێن کەدەتوانن بیانکڕن)***. ڕەنگە بەشێکی زۆری ئەم وتەیەی بنیامین بەلای هەموو ئەو کەسانەوە کە تائێستا کتێبیان نوسیوە جێگەی دڵخۆشی نەبێت، چونکە لەمانای وتەکەدا دەشییێت گوێمان لە داوایەك بێت بۆ تووڕهەڵدانی هەموو ئەو کتێبەنووسراوانەی حاڵی حازر دەتوانین بیانکڕین و کەچی ڕازیمان ناکەن. گرنگیی قسەکەی بنیامین لەوێوە دەستپێدەکات کە (*خۆشەویستی*) بۆ کتێبەکان کردۆتە مەرجێکی هاندەر بۆ بەدەستهێنان و هێنانەوە و کۆکردنەوەیان. لەڕاستیشدا خۆشەویستی وەك هاندەرێك لەپشت هەموو ئیشکردنێکی بەردەوام و بەرهەمهێنانێکی ئیبداعییەوەیە. واتە داهێنانی جیهانێکی نوێ کە سەرچاوەکەی لە خۆشەویستی ناو دەروونی داهێنەرەکەیدایە و دەیەوێت دنیای ئەوانەش کە بەدەستی دەهێنن بە بوونی خۆی لەژیانیاندا بڕازێنێتەوە.

بۆ ئەوەی لە گرنگیی کتێبەکان بۆ ژیانی خۆمان باشتر تێبگەین، لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم بەراووردیان بکەم لەگەڵ گرنگی پەیوەندیی لەگەڵ (هاوڕێکان)دا و دەمەوێ هەندێ لە لێکچوون و جیاوازییەکانیشیان شیبکەمەوە.
ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەکەیان خۆشەویستییە زۆر کەم و دانسقەن، دەنا وەك لەمەبەستی قسەکەی بنیامیندا دەردەکەوێت دەتوانین هەر ڕۆژە بەلێشاو کتێب بکڕین. هەروەك چۆن ئەو کەسانەی لەنیگای یەکەمدا وادەردەکەوێت دەبنە هاوڕێمان، بەژمارە زۆرن، بەڵام ئەوانەی کە وەك هاوڕێیەك خۆیان لەناو ژیانماندا (*دەسەلمێنن*)، ژمارەیان هەر هێندەی کتێبە دانسقەکانە. هاوڕێکان کەسانێك نین (بیاندۆزینەوە) یان (بەسەریاندا بکەوین)، بەڵکو ئەو خاوەن ڕۆحانەن کە بانگمان دەکەن و دنیای خۆیانمان لەسەر ئاوەڵا دەکەن تا دنیای ئێمەش بەبوونی خۆیان ئاوەڵاتر و بەرفروانتر بکەن. تەنانەت هاوڕێکان ئەو کەسانەش نین کە چاومان پێیان دەکەوێت، بەڵکو کەسانێکن (ئاشکرا)یان دەکەین و دەیاندۆزینەوە، وەك چۆن لە تینوێتیدا بەسەر کانیاوێکدا دەکەوین و دەیدۆزینەوە. بەهەمان شێوە کتێبە دانسقەکانیش ئەوانەیان نین کە (دەیانکڕین)، بەڵکو ئەوانەن (*بەدەستیان دەهێنین*): لەناو سەدان کتێب و هەزاران ناونیشانی سەر ڕەفەی کتێبفرۆشەکاندا، تەنیا لەلای ژمارەیەکی کەمیانەوە دەوەستین و تەنیا چەند دانەیەکیشیان هەموو تیژبینیمان بۆخۆیان ڕادەکێشن.
بەڵام جوانترین لێکچوونی کتێبەکان و هاوڕێکان ڕەنگە لەوەدا بێت کە بەوپەڕی ئازادییەوە، بەبێ هیچ زۆر لەخۆکردنێك و بەبێ هیچ لێکدانەوەیەکی گوماناوی دەیانبەینەوە ماڵ و شوێنی حەوانەوە و پشوودانمان، بەبێ ئەوەی هەست بە قورسایی و سەنگیان بکەین: هەردووکیان وەك بەشێکی جیانەکراوە، وەك پارچەیەکی دابڕنەبووی سرووشتیی وان، کە ژیانی تایبەتیمان دەڕازێننەوە و ئارامیمان پێدەبەخشن. بەمانایەکی تر، هاوڕێکان و کتێبە دەگمەنەکان لەژیانماندا شوێن داگیر ناکەن، بەڵکو شوێنی خۆیان هەیە: شوێنێ کە هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت پڕی بکاتەوە. لێرەشەوە پەیوەندی لەگەڵ (کتێب) و

(هاوڕێ)، هەربەتەنیا پەیوەندییەك نییە لەناو پەیوەندییەکانی تردا، بەڵکو گەیشتنە بە کام و بە ئۆرگازمی هەموو پەیوەندییەکانی تریش.. بەرزکردنەوەی پەیوەندییە لەئاستێکی *مەبەستگەراوە* بۆ ئاستێکی *بێمەبەست*: چونکە کاتێ کتێبێك دێتە ژیانمانەوە ئیتر دڵنیاین هەمیشە لێرەیە و دەبێتە نیشانەیەکی ناسینەوەی کەسایەتیمان، هەروەك چۆن کاتێك مرۆڤێکی دیکە وەك خۆشەویست و هاوڕێ تێکەڵ بە بوونمان دەبێت، ئیتر هەموو قفڵەکانی گومان تێکدەشکێن و دڵنیایی دێتە ژێر سەرمانەوە تا پێمان بڵێ: بێ ترس، بنوو بەتەنیا نیت!

## (٢)

بەڵام جیاوازیی هەرە گرنگی نێوان کتێبەکان و هاوڕێکانیش (دوورکەوتنەوە)و (لێکدابڕان) نییە. بەڵکو (لەدەستدان)ی یەکەمیان و (ونکردن)ی دووەمیانە.. مەبەستیشم لە مانای (لەدەستدان) بەهیچ جۆرێ کردنە دیاری و زایەکردنی کتێب نیە، بەڵکو مەبەستم ناچاربوونە بە هەڕاجکردنی.. هەڕاجی کتێبەکان گەورەترین تراژیدیای هەر کتێبدارێکە، کە بەناچاری دەبێت نرخێکی ماددی بۆ ئەو جیهانە دابنێت کە پێکهێنەری بەشێکە لە خودی خۆی، لە کاراکتەر و کەسایەتی خۆی. لێرەوە کتێبدارێ کە ناچار دەبێت کتێبە خۆشەویستەکانی حەڕاج بکا، باشتر لەهەر کەسێکی تر لەو ئافرەتانە تێدەگات کە بەناچاری نرخ لەسەر جەستەو لەشی خۆیان دادەنێن.. هەردووکیان یەك کۆژان و گێنگڵ کۆیاندەکاتەوە: کۆژانی خۆخستنە بەردەست کڕیارەکان.

بەڵام بۆچی گوتم: جیاوازیی هەرە گرنگی نێوان کتێبەکان و هاوڕێکان (دوورکەوتنەوە و لێکدابڕان) نییە؟ چونکە دابڕان و دووری، چاوەڕوانیمان زۆر دەکات و لەوێشەوە حەز و ئیشتیاقی دیدار و سەرلەنوێ یەکتر بینینەوە بەهێزتر دەبێ. دابڕان فێرمان دەکات ئیش بە توانای وردبوونەوە و هێزی بەگەڕخستنی خەیاڵمان بکەین. لە خەیاڵی خۆماندا، ڕەنگی بەرگی کتێبەکان، شێوەی کاغەزەکەیان، خەتی ناونیشانەکەیان، شوێنی پەنجەکانمان کاتێ دوای

عەرەقکردنەوە لەویێ بەجێماون، بهێنینەوە پێشچاوی خۆمان. هەروەها ئەو گۆشەو لاپەڕانەی چا، قاوە و شەرابیان پیاڕژاوە، تاڵە مووە بەجێماوەکان، ئەو مێشوولەیەی بەبێ خواستی ئێمە لەژێر فشاری یەکهاتنەوەی نێوان دوو لاپەڕەدا بۆ هەمیشە ووشك بووە، نامەو وێنەکانی ناویان و لاپەڕەی کەج بووی یاداشتەکانی دووتوێی لاپەڕەکانیان بهێنینەوە یادی خۆمان. پاشان بە دیققەتەوە بیر لە ژمارەی لاپەڕە و شوێنی پەرەگرافەکان بکەینەوە تا وەك چۆن وردە وردە پاش ڕەوینەوەی تەم و مژ، دەتوانین درەخت و بەرد و ڕێگاکان لێکدی جیابکەینەوە، ئاواش بەبەر چاومانەوە ئەو پەرەگرافانە بەرجەستە ببن کە خەتمان بەژێردا هێناون، کە دێڕ و دەربڕینە هەرە خۆشەویستەکانمانیان تیا دەناسینەوە و جارێکی تر لەژێر لێومانەوە دەست دەکەینەوە بە زەمزەمە کردنیان. زەمزەمەش جۆرێکە لە زیکری ئەو (ڕاز)انەی کە دەردی دابڕان دەیانسەپێنێ و تەنیا لە دیدار و یەکتر دیتنەوەشدا ئەدرکێنرێن.. بەمانایەکی تر، دابڕانی کتێبدار لەکتێبەکانی، ئەو دەکاتە سۆفییەکی چاوەڕوانکردووی بەسەبر، کە مەودای دووریی لەیاری خۆی، نەك بە زیکر، بەڵکو بە خەیاڵکردنەوە پڕ دەکاتەوە.

بەهەمان شێوە، دووری لەهاوڕێ و درێژبوونەوەی مەودا جوگرافییەکان، فراوانبوونی سنوورەکانی جیابوونەوە و فیراق، نابێتە هۆی سڕینەوە و تێکچوونی پەیوەندییەکان. بەڵکو هەڕەشەی گەورە کاتێ سەرهەڵدەدات کە دوو هاوڕێ یەکتری (گوم)بکەن. چونکە وەك لە حاڵەتی کتێبەکاندا گوتم: ئەو شتەی (بەدەست دەهێنرێت)، تەنیا بە (لەدەستدان) لەناو دەچێت. هەروەك چۆن ئەو پەیوەندیی هاوڕێیەتیەی (دەیدۆزینەوە) و کەشفی دەکەین، تەنیا بە (گومکردن)ی نامێنێت. ونکردنیش نیشانەی کوێربوونەیەوەیە.. وەك ئەو کانییەی کە چیدی شوێنەکەی نادۆزینەوە تا تینوێتیمان بشکێنێ، چونکە ئیتر وشکاوی هاتووە و هیچ پنجە گیاو سەوزاییەکیش لەو ناوە نەماوە تا شایەتی ئەوە بدات کە: ڕۆژگارێ کانیاوێ لەوناوە بووە!

## (٣)

ڕەنگە هەندێك بپرسن: ئاخۆ مەرگ نابێتە هۆی دروستکردنی سنوورێکی ڕەها لەنێوان هاوڕێ و خۆشەویستەکاندا؟ ئاخۆ مردن سنووری جیابوونەوەی بنەبڕی پەیوەندییەکان نییە؟

بێگومان مەرگ کێشەیەکە..، لەلایەکەوە ئەوەتا ئایین پێماندەڵێت: ئێمە (دەبێت) بمرین، مردن ڕێگای هەموومانە، ئێمە بوویەکین لەچاوەڕوانی مەرگدا و ژیان جگە لە دیمەنی مردن هیچ ڕوانگە و دیمەنێکی تری نیە چاوی بڕیبێتێ.. لەلایەکی ترەوە مردنی مرۆڤەکانی تر، کۆچی لەپڕ و دنیا بەجێ هێشتنیان، دوێنێ لێرەبوون و ئێستا لێرە نەمانیان، پتر ئەو ترسەمان لەدڵدا دەچەسپێنێ کە ئایین لەمنارەی مزگەوت و بورجی کەنیسەکانەوە دەیدات بەگوێماندا.. بەڵام ئاخۆ ئەو مەرگە دەتوانێت سنوور بۆ (بیرەوەری)شمان دابنێت؟ ئاخۆ مەرگ دەتوانێت لەگەڵ ڕاپێچکردنی ئەوانیتردا بۆ ناو زوڵمەتی قەبرەکان، ئاگایی ئێمەش لەبارەیانەوە بسڕێتەوە و ڕاپێچی ناو تاریکایی بکات؟. بێگومان (مردن) کۆتاییەکە، خاڵی دابڕان و یەکتر جێ هێشتنێکە، جا ئەمە بەمانا ئایینیەکەی وەربگرین یاخود وەك ڕاستییەکی سووڕی ژیان خۆی، ئەمەیان شتێکی دیکەیە. بەڵام هێشتا ڕاستیەکی تر هەیە کە پێماندەڵێت ئەو دابڕانەی مەرگ دروستی دەکات، بەپلەی یەکەم دابڕانێکی (جەستەیی)یە و جێهێشتنی یەکترە لەسەر ئاستی فیزیکی.. ڕاستە دین پێماندەڵێت بێگوناهەکان نامرن و دەبەخشرێن و لەبەهەشتی ئاسماندا جێگیر دەبن، بەڵام ئێمە کە لەبێگوناهی خۆمان دڵنیانین، دەشێت بپرسین: ئەی گوناهبارەکان بۆکوێ دەچن و چییان لێدێت؟

بەمانایەکی تر، مەرگ کۆتاییە لەبەردەم جەستەدا نەك لەبەردەم تایبەتمەندیی بوونی ئێمەدا وەك کائینێك، کە بوونمان تەنیا لەسەر مانەوەی جەستە نەوەستاوە. بەڵکو بوونی ئێمە بوونێکیشە لەسەر ئاستی ئاگایی و بیرەوەریش. بوونێك کە جیامانەکاتەوە لە بوونی گیانەوەرەکانی دیکە.. ڕاستە مەرگ سنوورێکی ڕەها بۆ پەیکەری هاوڕێ و خۆشەویستەکانمان دادەنێ: چیدی نایان بینین لەسەر دوو قاچ بەسەر شەقامەکاندا پیاسە بکەن، لە پەنجەرەکانمانەوە

بەزەردەخەنەی سەرلێویانەوە خۆیان پیشان بدەن و لەناو دەرگای ماڵەکانماندا چیدی ناوەستن و لەتەلەفۆندا گوێمان لەدەنگیان نابێت قسانمان لەگەڵ بکەن.. ڕاستە مەرگ دێت تا جەستەیان ببات و لەژێر خاکدا وەك هەر گیانەوەر و ئۆرگانیزمێکی دیکە بیانڕزێنێ و بیانکاتەوە بەکرم و خۆراك و هتد.. بەڵام ئەی چی لەتایبەتمەندییان وەك مرۆڤ، دەکات؟ مەبەستم لە تایبەتمەندیی هەرکامێکیانە کە جیای دەکاتەوە لەئەوانیتر و مانای تایبەت دەداتە بوونی هەریەکەیان وەك بوونەوەرێکی سەربەخۆ.. چی لە یادگار و شوێندەست و زمان و تۆنی دەنگ و هەموو ئەو خەسڵەتانەیان دەکات، کە لەبیرەوەری ئێمەدا وەك نیشانە و بەڵگەی (هەبوونی بەردەوام)ی مردووەکان خۆیان دووبارە دەکەنەوە؟ دەکرێ بپرسین: ئایا دەتوانین بەهەمان شێوەی وێناکردنی(تەسەوور) چۆنێتی لەناو چوونی جەستە، وێنای چۆنێتی نەمانی (ئاگایی و بیرەوەرییەکان)یش بکەین؟ ئەگەر بیرەوەریەکانیش وەك جەستە مردبان، ئایا ئەمڕۆ دەمانتوانی ناوی چەندین مرۆڤ بهێنین کە لەمێژە مەرگ ڕاپێچی کردوون و کەچی بوونی ئەوان لەسەر ئاستی ئەو کار و کردەوەو بەرهەم و پاشماوانەی بۆیان بەجێهێشتووین، هەر لەژیانی ئێمەدا بەردەوام و زیندوون؟

جارێکی تر ئەوە دەڵێمەوە، کە بێگومان مەرگ سنوورێك بۆ دیار و نادیار، غیاب و ئامادەیی ژیانی هاوڕێکان و ئازیزان لەناو ژیانی ئێمەدا دادەنێت. بەڵام ڕەنگە لەهەمان کاتدا (بیرەوەریەکان) ئەو توانایەی ئێمە بن بۆ بەخشینی مانای بەردەوام بە نیشانە و شوێندەستی مردووەکان و ئامادەکردنەوەیان لەژیانی خۆماندا. هەر لەبەر ئەمەش، واتە لەبەرئەوەی ئێمەی مرۆڤ توانای هێشتنەوەی یادگاری مردووەکانمان لەبیرەوەریماندا هەیە، ڕەنگە ئەو سنوورەی مەرگ دایدەنێت، دەڵێم (ڕەنگە) سنوورێکی بنەبڕ و ڕەها نەبێت.. سنووری ڕەها وەك لە پێشاندا گوتم، سنوورێکە (ونبوون)، پێش مەرگ و پێش لێکهەڵوەشانەوەی جەستە دەیسەپێنێت. لەیەکتر ونبوونی دوو مرۆڤ، دوو هاوڕێ و ئازیز و دوو خۆشەویست، شتێکە کاتێك ڕوودەدات کە هەردوولا هێشتا لەژیاندان و خاوەنی جەستەی زیندووی خۆیانن. ونکردنی یەکتر بەواتای کوێربوونەوە و وشکبوونی

ئەو کانیاوەیە کە هەردوولا لەناخی یەکتردا کەشفیان کردبوو، کردبویانە سەرچاوە بۆ شکاندنی تینوێتی خۆیان و بەهێلانەیەك بۆ پشوودانی ڕۆح..
ترازیدیای (یەکتر ونکردن)، کارەساتێکە هیچ ڕێوڕەسم و کەشێکی تایبەتیشی نییە تا بەهۆیەوە یادی بکەینەوە. کاتێ دوو هاوڕێ و دوو خۆشەویست یەکتری وندەکەن، ئیدی ئەم ترازیدیایە هەموو ڕێوڕەسمەکانیش لەگەڵ خۆی وندەکات! ئەمەش جیاوازیی هەرە دیاری نێوان ئەو سنوورە ڕێژەییەیە کە مەرگ دروستی دەکات (چونکە گوتم مەرگ تەنیا سنوورە لەبەردەم جەستەدا) و ئەو سنوورە ڕەهایەی یەکتر ونکردن دەیسەپێنێ، چونکە کاتێ مردوومان لێدەمرێت، لەماتەمی و تەعزیەدا دەبینە هاوبەشی خەمی یەکتر.. سەرەخۆشی لەیەکتر دەکەین و سەبووری بەدڵی یەکدی ئەدەین و یەکتری بەسەر دەکەینەوە.. بەڵام کاتێك خۆشەویست و هاوڕێکانمان وندەکەین، کاتێ تازە هیچ کانیاوێکی پەیوەندی لەگەڵیاندا تینوێتیمان ناشکێنێ، ئیتر لەناو دۆزەخی ناوەوەی خۆماندا تەنیا دەمێنینەوە، تەنیاییەکی بێتەقس و بێ ڕێتواڵ..
تەنیاییەك کە تیایدا ڕووخساری ئەویتر مانای خۆی لەدەست دەدات و چاو نایەوێت بکەوێتە سەری، چونکە لە (بیرەوەریدا) ئەو ڕووخسارە بەردەوام وەك ڕووبەرێکی ڕەش، وەك یادهێنەرەوەی حاڵەتی ئازار، چەوسانەوە، تاڵییەکان و پەستبوون و تێکشکانەکان خۆی دەنوێنێ.. لێرەشەوە (بیرەوەری) مانا و توانای خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە قەسابخانەی کوشتنی سیمای ئەویتر، بەجۆرێ کەئیدی ناتوانین پێی بڵێین بیرەوەری.. کاتێ سیمای کەسێ، یان هاوڕێکەی دوێنێمان لە بیرەوەریماندا دەشێوێ، ئیدی دڵیشمان لەئاستیدا ڕەش دەبێت.

ڕەنگە دەستەواژەی (دڵڕەشبوون) جوانترین خوازە (ئیستیعارە) بێت کە زمانی کوردی لەجیاتی مانای (دابڕانی هەمیشەیی) خستبێتیە بەر دەستمان. بەتایبەتی ئەگەر زانیمان لەنێوان دەنگی وشەی (ڕەش) و کردەی (ڕشانەوە)دا لێکچوونی پیت و تەواوکاری مانا هەیە: (ڕەش) لە دەستەواژەی (دڵڕەشبوون)دا، ئەو شتەیە کە جەستە خۆی لێ بەدوور دەگرێت.

دەهێنرێتەوە، یەق دەدرێتەوە و لە جەستە تووڕ دەدرێتە دەرەوە، چونکە ئیتر بە زیندوویی لەش نامۆ بووە و زیانی پێدەگەیەنێت و ڕێگرە لەبەردەم گەشەکردنی ڕۆحدا. بەمانایەکی تر، کە (ڕەشی) دەبێتە خەسڵەتی هەر شت و هەر پەیوەندییەك، ئەوە (ڕشانەوە)ش دەبێتە چارەنووسی. بەم پێیە لەیەك کاتا (ڕشانەوە)، (ڕەش هێنانەوە)یشە.. سەرسووڕهێنەری ئەم پەیوەندییە کاتێ دەردەکەوێ کە بیرمان لە کرداری (هێنانەوە) کردبێتەوە، کە کردارێکە لەزمانی ئێمەدا ئاماژە دەکات بۆ شوێنی قوڵاییەکان: واتە بۆ ناوەوە و بۆ ناخ. هێنانەوە لەو دەربڕینانەی پێشوودا، هەمیشە هێنانەوەیە لە قوڵاییەوە بۆ سەرەوە، لە تاریکییەوە بۆ دەرەوە. تەنانەت (هێنانەوە) کردارێکە بەپیتی بێدەنگی (ه) دەستپێدەکات، کە خودی گۆکردنی ئەم پیتە پێویستی بە کردنەدەرەوەی هەناسەیەکی قووڵە، تادەنگەکەی بەرجەستە ببێت. من لێرەدا لەمە زیاتر لەسەر ئەم کردارە ناڵێم، بەڵام بەبیری خوێنەر دەهێنمەوە کە دەنگی ئەم پیتە هەم دەربڕی مانای (دەردانەوەی) شتی زیادەی ناو قووڵایی لەش دەگەیەنێت (خواردنی هەرس نەبووی ناو گەدە) کە سیستەمی هەرسکردن دەریدەهاوێتەوە دەر و بەمەش جارێکی تر لەش ئارام دەبێتەوەو هاوسەنگی خۆی وەردەگرێتەوە. هەم مانای دەرهاویشتنی ئاوی پشت لە پرۆسەی جووتبووندا دەگەیەنێت، کە دیسانەوە دەرهاویشتنێکە لەقوڵاییەوە و دیسانەوە بەدیهێنەری ئارامی و هاوسەنگیی ڕۆحی و جەستەییە. مانای سێهەمیشی لە خۆ بەدوور گرتن و خۆ دەرهاویشتنی مرۆڤ لەو پەیوەندیانە دەدات بەدەستەوە کە بەقووڵی تێکەڵی بوون و تێکەڵیان بووە و بەڵام چیدی ئارامیمان پێنابەخشن. بەڵکو ناو جەرگمان دەخۆن، هاوسەنگیمان تێکدەدەن و تیایاندا دڵمان لە بەرامبەرەکەمان (ڕەش) بووە. بۆیە دەبێت مەودایان لەگەڵ دروستکەین تا ئارامی و هارمۆنیەتێ بۆ ژیانمان بەدەست بهێنینەوە.

(٤)

لە وتەکەی بنیامیندا کە دەڵێت، ***نووسەرەکان لەبەر هەژاریی نیە کتێب دەنووسن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەو کتێبانەیان خۆشناوێن کە دەتوانن***

*بیانکرن*، بانگاشەیەکی شاراوەش هەیە بۆ ئیمکانی نوسین و داهێنانی ئەوجۆرە کتێبانەی دەشیێت خۆشمان بوێن. واتە ئەو کتێبانەی لەپێشاندا باسم لێوەکردن و سەبارەت بە گرنگییەکەیان بۆ ژیانی خۆمان، لەگەلّ هاوڕێ و خۆشەویستەکاندا بەراووردم کردن.. بەلاّم خالێکی زۆر گرنگ ماوە کە پێویستە لەیادی نەکەم: زۆربەی ئەو کتێبانەی خۆشماندەوێن و بەدەستیان دەهێنین، پێشکەش کراون بە کەسانێکی تر، کەسانێك کە لەژیانی نووسەردا شوێنێکی گرنگیان هەیە و بەو جۆرەش بیرەوەری ئەو کەسانە لە ژیانی نوسەرەکەیان و ئێمەشدا نەمر دەکەن. بنیامین یەکێك لە ناسکترین کارەکانی خۆی بەناوی (جادەی یەکڕێ) پێشکەش کردووە بە خانمێك کە بەداخەوە لەعەشقدا پێك نەگەیشتن(۲).. بەمکارەش بنیامین کتێبێکی بۆ بەجێهێشتین کە خۆشماندەوێت، دەمانەوێت بەدەستی بهێنین و بەخوێندنەوەشی ئاسان دەبێتە بەشێکی جیانەکراوە لەژیانمان. لێرەشەوە (پێشکەشکردن)ی کتێبێك بە کەسێك هەرتەنیا ناوهێنانی ئەو کەسە نییە لەسەر بەرگ و لاپەڕەکانی ئەو کتێبە، بەلّکو کردنەوەی جیهانی بەرهەمەکەیشە بەڕووی بیرەوەری ئەودا. واتە بەڕووی تایبەتمەندییەکانی ئەو کەسە لە خەیالّدا وەك کائینێك کە ڕەنگە چیدی لەژیاندا نەمابێت، بەلاّم نەمردووە. پێشکەشکردنی بەرهەمێ، هەلّگێڕانەوەی پانتایی بەرهەمەکەیە و کردنێتی بەڕووبەرێك بۆ نومایشدانەوەی نیشانە و خەسلّەت و یادگارەکانی ئەو کەسە لە بیرەوەریدا. هەموو جارێ کە کتێبەکە دەکەینەوە، ئەو کەسەش لەوێیە و ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی بەرهەمەکە دوو ئەرك جێبەجێ بکات: یەکەمیان سەلماندنی خۆی وەك بەرهەمێك کە دەچێتە خانەیەکی داهێنانەوە: (ڕۆمان، شیعر، مێژوو، چیرۆك و لێکۆلّینەوە و بەوجۆرە). دووەمیان سەلماندنی خۆی وەك کەنالێکی ڕاگەیاندن کە بەردەوام دەیەوێت ناوی کەسی پێشکەشکراومان بەبیر بهێنێتەوە. هەموو جارێ کە خوێنەرێ بەرهەمێکی بنیامین دەخوێنێتەوە، ناوی خاتوو (ئاسیە) بەخەیالّیدا گوزەر دەکا. هەموو جارێ کە دەلّێین (مەولانای ڕۆمی)، یەکسەر (شەمسی

تەورێن) دێتەوە بیرمان و لەگەڵ هەموو (نالی) گوتنێکدا (حەبیبە)ش دەکەوێتە سەر زارمان و هەتا دوایی..
بەوجۆرەش یادهێنانەوەو (پێشکەشکردن) هەوڵدانە بۆ نەمرکردنی نیشانەو دەنگ و خەسڵەتەکانی ئەو کەسەی کە وەك جەستە لەگەڵمان نەماوە، بەڵام هێشتا لەبیرەوەریماندا زیندووە. پێشکەشکردن جۆرێکە لە بەگژداچوونەوەی هەرێمی مەرگ و فراوانکردنی هەرێمی بیرەوەری و یادگارەکانە لەژیاندا. لێرەشەوە کتێبێك جگە لەپەیامەکەی خۆی، جگە لەو بابەتانەی کە دەیکەنە کتێبێك و بەرهەمێکی سەربەخۆ، بەوەی پێشکەش بە کەسێك دەکرێت، ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانەش دەگێڕێت، چونکە بەشداری دەکات لە نرخاندنەوەی کاراکتەری ئەو ئازیز و خۆشەویستانەی کە مەرگ بێبایەخیان دەکات و گەرەکیەتی لەگەڵ ڕزاندنی جەستەیاندا، شوێندەستیشیان بسڕێتەوە. ئەم ڕۆڵە شۆڕشگێڕانەیە لە کۆمەڵگایەکی وەك ئەوەی ئێمەدا، کە ئەندامەکانی بەردەوام هەڕەشەی مردنیان لەسەرە، هێندەی تر بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. چونکە کۆمەڵگایەك کە بەئاسانی ڕۆڵەکانی خۆی بداتە دەست سیخوورەکانی مەرگ، کۆمەڵگایەکە مردنی ئەندامەکانی دەکاتە مەرگێکی بێمانا. بێمانایی دەکاتە دوا سزای بوونی ئەوان و لەکفنی شەرمەزاریدا جەستەیان دەکاتە دیاریی گۆڕەکان. کاتێ کۆمەڵگایەك بەلێشاو، دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ ئەندامەکانی ڕاپێچی مەرگ بکات و بیانکاتە سووتەمەنی شەڕە بەردەوامەکان، چیدی مانایەکی بۆ مەرگ لەپێشچاو نەگرتووە. بەڵکو مەرگ هێندە تیایدا بێمانا بووە کە مردنی هیچ کەسێك ئەو کەسە ناکاتە قارەمانێك کە لەپێناوی مەبدەئێکی ڕەوادا گیانی خۆی بەخت کردبێت. هەر لەبەر بێمانابوونی مردنەکانیشە کەتەماشا دەکەین ڕووبەری گۆڕستانەکان تادێت بەرفراوانتر دەبێت، بەڵام بەبێ ئەوەی ژمارەی قارەمانەکان زیاد بکات..
ڕۆڵی شۆڕشگێڕانەی کتێبە پێشکەشکراوەکان لەوەدایە کە مانایەك بۆ مەرگ دەگێڕێتەوە، بیرەوەریمان دەخاتەوە گەڕ بۆ بەخشینەوەی پەیکەرێك بە خەسڵەتی مردووەکان. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو ناکۆکیەیە کە زۆرجار

دەکەوێتە نێوان ناوەڕۆکی کتێبەکان و شوێنگەی ئەو کەسەی بەرهەمەکەی پێشکەشدەکرێت. ڕەنگە لە ئەدەبی ئێمەدا لەسالآنی هەشتا بەدواوە شوێنگەی (باوک)، وەك نمونەیەك بەباشترین شێوە ئەو ناکۆکیە ئاشکرا بکات.

(٥)

یەکێك لە خەسڵەتە سەرنجڕاکێشەکانی داهێنانی ئەدەبیی ئێمە لەهەشتاکانەوە ئەوەیە، کە بەرهەمەکان دەیانەوێت لەسەر ئاستی پەیام و ناوەڕۆك دژ بە سیستەمی باوك و هەموو ئەو سێمبولانەش بن کە یادهێنەرەوەی باوکن. واتە دژایەتیەك لەنێوان باوك وەك سێمبولێکی ئایدیۆلۆژیدا، کە بەرهەمەکان دەیانەوێت ناوی بزڕێنن ⌉و لەنێوان خۆشەویستی بۆ باوك وەك باوکی بایۆلۆژی، کەبەرهەمی پێشکەش دەکرێت⌉، بەدی دەکەین. هەڵبەت ڕەنگە دژایەتیکردنی باوك وەك سێمبول لە ئەدەبی ئێمەدا بگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی (لەخەوما)ی جەمیل سائیب، چونکە لەوێدا بۆ یەکەمجار سەرکردەیەکی کورد کە (شێخ مەحمود)ە وەك باوکێکی ئایدیۆلۆژی بەسێمبوول دەکرێت و ڕەخنەی لێدەگیرێت. بەڵام لەهەشتاکانەوە ئێمە مامەڵەیەکی تر لەگەڵ باوکدا دەکەین: وەك سێمبوول و شێوەیەك لەدەسەلآت دەیکەینە دڕندە و وەك باوکی بایۆلۆژیش ستایشی دەکەین. بەرهەمەکان لەسەر ئاستی ناوەڕۆکەکەیان سیستەمی باوك و نرخەکانی دەخەنە ژێر پرسیارەوە و لەهەمان کاتیشدا خودی ئەو بەرهەمانە پێشکەش دەکرێن بە باوکە بایۆلۆژییەکانی ناو واقیع و کۆمەڵگاو خێزان. بەکورتی دەکرێت بڵێم، لەجیهانی دەقەکاندا باوکان و یاساکانیان بە نەفرەت دەکرێن و لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکانیشدا، بەرهەمەکان پێشکەش دەکرێن بە باوکانی ناو خێزان، بەتایبەتش ئەوانەیان کە مردوون و چیدی لێرە نین. ئەم ناکۆکیە هەرچەندە جێگەی سەرنجدانی فراوانیش بێت سەبارەت بە ڕاستگۆیی و جورئەتی پەیامی بەرهەمەکان لەئاست دروشمەکانی خۆیاندا بۆ شکاندنی سیستەمەکانی باوك، هیچ لەو بەهایە ناگۆڕێت کە کتێب دەیەوێت لەکۆمەڵگایەکی وەك ئەوەی ئێمەدا بیداتەوە بەمردووەکان. چونکە هەر

لەھەشتاکانەوە، لەجەنگی نێوان عێراق/ئێران و ئەنفال و هەڵەبجە و دواجار شەڕی ناوخۆییەوە مەرگ لەکۆمەڵگای ئێمەدا بووە مەرگێکی بێمانا. لەو کاتەوە مەرگ توانی بەشاڵاوە بەردەوامەکانی پۆل پۆل جەستەی خۆشەویست و هاوڕێ و کەسەکانمان لێبسەنێتەوە. لەهەمان کاتیشدا هەڕەشەیەکی بەردەوامیش بێت بۆ سەندنەوەی کەسە زیندووەکانمان. ئەم ئامادەییە بەردەوامەی مەرگیش بواری نەداینێ بیرەوەریمان بۆ یادهێنانەوەی مردووەکان بخەینە گەڕ. مەرگی بەردەوام ئێمەی لەیەکتر ونکرد و مردووەکانی لەئێمە شاردەوە. بەجۆرێ کە واهەست بکەین کۆتایی ژیانی ئازیزانمان لەکۆتایی جەستەیاندایە.

بەڵام ئەوەتا لاپەڕەی یەکەمی کتێبە خۆشەویستەکانم دەکەمەوە: لاپەڕەی (پێشکەشی). وەك ئەوەی ئەو لاپەڕەیە تاکە پانتاییەك بێت کە نوسەری ئێمە بتوانێت خۆشەیستی خۆی تیا دەرببڕێت و تیایدا مانایەك ببەخشێتەوە بە مەرگی هاوڕێ و هاوسەر و جگەرگۆشە و باوکانی خۆی. لێرەشەوە، تێدەگەم خۆشەویستیمان بۆ کتێبەکان لە خۆشەیستیمانەوە بۆ کەسەکان هاتووە..، هەڵبەت نەك ئەو کتێبانەی لەبەر هەژاری دەنووسرێن، بەڵکو ئەوانەی هەڵگری مانایەکن بۆ خۆشەیستی..

کۆپنهاگن/دانمارك

١٢ و٢٢ی ١٩٩٨/٩

## پەراوێزەکان:

١. والتر بنیامین: بازکردن کتابهایم، نشریه (زنده رود)، شماره: ١٠ و ١١- بهار ١٣٧٤، ل١٠٠

٢. ناوی کتێبەکە بریتیە لەEnsrettet gade : و پێشکەشیکردووە بە خاتونێکی لیتوانی بەناوی Asja Lacis کە بنیامین لەساڵی ١٩٣٠دا خۆزگەی دەخواست بیکاتە هاوسەری خۆی... بەڵام ئاسیە خاتوون گەڕایەوە شاری (ڕیگا) و پاشانیش دە ساڵی لە ئۆردوگا زۆرەملییەکانی (ستالین)دا بردەسەر، کاتێك ڕزگار بوو، ئیدی ئەمجارەیان بنیامین لەژیاندا نەمابوو تا ئەوان بەیەك بگەن. بنیامین بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی نازییەکان، خۆی کوشتبوو. ڕەنگە شوێنی بەیەك گەیشتنیان ناو بیرەوەری ئێمە بێت کاتێ خۆزگەی بەیەك گەیشتنیان بۆ هەڵدەخوازین..

# ئاستەکانی بە شووشە بوون،
# ئاستەکانی شـ ـکـ ـا ن

## (چەند دانپیانێك)

### بەدەنگهێنانی شووشە:

دەنگی تەبەقە شووشەیەکی شکاو کلێشەیەکی ناسراوە: سیمبۆلی تێکشکان و نیشانەیە بۆ دەماخ و دەروونێکی هەڵوەشاو، سیمبۆلی پەرتبوونی خەون و ئاوابوونی یۆتۆپی و دڵ بەدنیا خۆشکردنەکانە. شووشە هەمیشە بە شکانەکەی ئەو ڕاستیەمان بیر دەهێنێتەوە کە ئێمە بەردەوام حاشا لە بیستنی دەکەین و لێی ڕادەکەین. زرنگەی شکانی شووشە پێمان دەڵێ: ئێمە چەندە تەمەن کورتین، چەند بە ئاسانی ڕوونی و بریقە و باقی خۆمان لەدەست ئەدەین.. کێ لە ئێمە شکانی ئەو پەنجەرانەی بە ڕیزی گوللە وێڵەکان و گوللە ئاراستەکراوەکان نەبینی کە بە منالی لەو دیویانەوە تەماشای بەفرمان دەکرد پەنجەرەی مالی کاممان بە دەنگی تەقینەوەی بۆمباکان هارەی نەکردە خوارەوە..؟ لە چ شەرە گەڕەکێك و شەڕی نێوان هۆز و نێوان شار و شاردا، بە هەزاران شووشە نەشکان و سەدان پەنجەرە بێ گلێنە نەمانەوە.. لەو ڕۆژەوەی شووشە هاتۆتە ناو ژیانی مرۆڤەوە، ترسێکی دیکەشی لەگەڵ خۆی هێناوەتە ئەو ژیانەوە. ترس لە شکانی خۆی نا، بەڵکو ئەو ترسەی کە بە شکانەکەی، شکانی خۆمان و پارچە پارچەبوونی خۆمانمان بیر دەخاتەوە.. ڕەنگە هەر لەو ترسەشەوە بێت ئێمە تا ئێستا نەمان وێراوە باسی شووشە بکەین و زرنگەی شکان و هەڵڕزینە خوارەوەکەی بەدەنگ بهێنین.. شکانی شووشە هەر بەتەنیا ڕاستییەکی نێو ژیانی ڕۆژانەمان نیە، بەڵکو لە چەندین ڕۆمان و شیعر و فیلمیشدا، بەهەزاران شووشە درزیان برد و لێکترازان و هەڵڕژانە خوارەوە. لە

سرووشتی هەموو کەرنەڤاڵ و خۆشی و کامەرانییەکدا، ڕۆحێکی شووشە ئاسا خۆی شاردۆتەوە، لەو کاتەشدا کە شووشە پتر خاوێن و بریسکەدارە، ئەگەری شکانیشی لە هەموو کاتێکی تر زیاترە.. سرووشتی شووشە ئەوەیە کە ئێمە هەرگیز کارێکی ئەوتۆمان بە ڕووبەری خۆی نییە. بەڵکو بەردەوام نیگامان لە ڕووبەرەکەی دەپەڕێتەوە و لەسەر ئەو شتە چەق دەبەستێت کە لەو دیویەوەیەتی. سرووشتی شووشە ئەوەیە کە ئەودیوی خۆیمان لێناشارێتەوە، تەنانەت ئێمە تەماشای ئاوێنە ناکەین، تەماشای خۆمان دەکەین لە ئاوێنەدا. بەڵام لەو کاتەوە کە ڕووبەری شووشە خۆی دەبێتە شوێن سەرگەرمیمان ئەبێ وریا بین، چونکە ئیدی سەیری ئەودیوی ناکەین. دەستی تێوە ئەدەین و لێی نزیك دەبینەوە. دەستیش زۆر جار نەگبەتە، ئەیەوێ شتەکان ئەمدیوە و دیو بکات و لەم شوێنەوە بیانگوێزێتەوە ئەو شوێن. دەست هەمیشە ویستێکی سەیری هەیە بۆ کەشفکردن و هەستکردن بە نهێنی پێکهاتەی شتەکان و چێژێکی زۆریش لەمە دەبینێت. دەست *نەسرەوتە* و جێی گومان! دیارە لەم کەین و بەینەشدا هەمیشە گریمانەی لە دەست کەوتنە خوارەوە و بەدەستەوە شکان لە ئارادایە: منداڵی هەموومان پرپەتی لە شکاندنی ئەو یاری و لەیستۆکانەی دوای بێتاقەت بوون لێیان، دەمان شکاندن!.. ڕەنگە هەر دەست و پەنجەکانیش شەڕانیترین بەشی جەستەی ئێمە بن: زۆر کەمن ئەو کوڕە لاسارانەی یەکەم بیرەوەری تاڵیان ئەو یەکەم زللەیە نەبێت کە بەدەستی باوکیان خواردویانە.. کەمن ئەو کچە بزێوانەی (هەڵبەت یەکێ لەجوانییەکانی کچ بزێوییەکەیەتی)، کە دەستی دایکیان قژیانی ڕانەکێشابێت.. هەر دەستە بە درێژایی مێژوو، بەیاننامەی جەنگەکانی ئیمزا کردووە و لە گۆڕەپانەکاندا شمشێر و خەنجەری وەشاندووە.. لە پشت کوژرانی هەر مرۆڤێکیشەوە، ئەو دەستە نەخشەکێشە ئامادەیە کە دیزایینی تفەنگەکان دەکێشێت و، ئەو دەستەی نەخشەکان لە کارگەکانی چەکسازیدا دەکاتە مەتریاڵ و پاشان ئەو دەستەش هەیە کە بەلەپیتکەی تفەنگەکان دەترازێنێ.. لە دەستدا نهێنییەکی شاراوە، خواستێکی بەردەوام و حەزێکی تێر نەبوو هەیە بۆ شکاندن و

لێکهەڵوەشاندنی ئارامیی ناوەوەی شتەکان و ڕۆحکێشانی ساتە هارمۆنییەکان..
بەتایبەتیش کاتێ مرۆڤ بە کەشفکردن و دیتنی شتەکان ڕادێت و هەموو نهێنییەکانیان ئاشکرا دەکات، ئیتر دەیەوێت کۆنترۆڵیشیان بکات.. مەگەر زانست دەستێوەردانێك نییە لە شتەکان کە پاشان بە کۆنترۆڵکردن و وێرانکردنیان کۆتایی دێت؟

نزیکبوونەوە لە شووشە و ئەملاولا پێکردنی دەستدرێژییەکی گەورەیە بۆ سەر شەففافیەت و ڕوونییەکەی. ڕەنگە یارییەکی ترسناکیش بێت کە تەنیا شکان لەو ترسەمان ئاگادار بکاتەوە.. لە ڕاستیشدا کاتێ مرۆڤ هەموو شتێ کەشف دەکات و ناوەوەی هەرشتێکی لێئاشکرا دەبێت و بۆی ڕوون دەبێتەوە، ئیدی لە ڕوونی و ئاشکرایی و دیتن وەڕس دەبێت. هەر لێرەیشەوە شاعیرە شەڕانییەکان، لە پێش هەمووشیانەوە بۆدلێر، بە ئاواتەوەن هەرچی شووشە و ئەوەیش بشکێنن کە شووشە تەعبیری لێدەکات: *ڕۆشنگەری، ڕوونی، دڵنیایی و خاوێنی*. بە چ چێژێکەوە بۆدلێر نووسیویە: *دەنگ باڵاخانەیەکی کریستاڵییە، هەورەبرووسکە دێت و هەپروون بەهەپروونی دەکا..*
(قیف!) (تۆم بۆ دەرکەوت!)، (دەستەکەت کەوتە ڕوو) (خۆت ئاشکرا کرد) و هتد. ئەمانە ئەوجۆرە ڕستانەن کە بۆیان هەیە مووی سەری مرۆڤ ڕاستبکەنەوە و مووچڕکەیەکی سارد بەسەرتاپای لەشیا بهێنن. لەو کاتەدا کە بەو ڕستانە لەگەڵت دەئاخڤن، چ شتێکت هەیە بۆ بەرگریکردن لەخۆت؟ کاتێ پێت دەگوترێ (تۆمان بۆ دەرکەوت) یان (دەستەکەت کەوتە ڕوو)، هەمیشە پێشت گوتراوە (پەردەمان لەسەر هەڵدایتەوە)، (تۆ چیدی شاراوە نیت) و هتد.
ئاشکرا بوون و ئاوەڵابوونی نهێنی و کەوتنە بەرچاو، شتێکی جیانەکراوەیە لە ژیانی هەموومان. ئەوەتا دەچینە لای دکتۆر و بۆمان هەیە ناو جەرگی خۆمان لەسەر شاشە ببینین نەبا نیشانەکانی نەخۆشییەکی تازە خۆیان مەڵاس دابێت..
دەچینە ئیدارەکان و کامێراکانی ڤیدیۆ وێنەی هەنگاو بەهانگاومان دەگرن نەبا (نییەتە بەدەکانی ناو سەرمان لە خشتەمان ببەن!. دەچینە سەفەر و چەمەدانەکانمان دەخرێنە بەر تیشکێکی لەیزەری تایبەت نەبا بۆمبایەکمان

لەناویاندا شاردبێتەوە. لەماڵەکەی خۆمانەوە بە تەلەفۆن قسان دەکەین و دەنگمان لە ژێرزەمینی پۆلیسخانەیەکدا تۆمار دەکرێت، نەبا لەکاتی دادگاییکردنماندا پەیوەندییەکانمان ئینکار بکەین.. بەکورتییەکەی، خواست و حەزی ئاشکراکردن و پەردە لەسەر یەکتر هەڵدانەوە، هەمیشە لەسەر پێش زەمینەی ترس لە نادیار و نەناس دێتە ئاراوە. لەبەر ئەوەی نادیار، ناسراو نییە، ئەوە لەگەڵ هەموو ڕووبەڕووبوونەوەیەك لەگەڵ نادیاردا ویستی کۆنترۆڵکردن سەر هەڵدەدات. بۆ ئەوەی بزاڤی ڕۆشنگەری، یان مۆدێرنیتە بتوانێ کۆنترۆڵی چاخەکانی پێش خۆی بکات، هات ئەو چاخە پڕ ئاژاوانەی کەنیسە فەرمانڕەوایی تێدا دەکردن ناونا: چاخە (تاریکەکانی ناوەڕاست)!. بەم ناو لێنانەیشی نەك هەر خەسڵەتی تاریکیی دەخستە پاڵ سەدەکانی ناوەڕاست، بەڵکو خۆیشی وەك پڕۆژەیەکی (ڕووناك و (ڕۆشنگەر) دەناساند.. ئەمڕۆ چیدی هاوارەکان لە پێناوی ڕۆشنگەریی و ئاشکرابوونی زیاتردا نین، بەڵکو تا دێت کەسانێك پتر هانا بۆ تاریکی دەبەن. بەڵام چ تاریکییەك؟ بێگومان سەردەمی ڕۆشنگەری هەر ڕۆشنایی نەهێنا، بەڵکو جۆرێ لە تاریکیشی هێنایە بەرهەم. ئەگەر زانست و گوتاری پۆزەتیڤ لەسەر پێشکەوتنی زانستی یەکێك بێت لە دەستکەوتە هەرە دیارەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، ئەوە زۆر زیادەڕۆیی ناکەین گەر بڵێین ئەو ڕووناکییەی زانست بە جیهانی بەخشیوە وەکو ئەو ڕووناکیە وایە کە ئامێری سلاید لە دیواری دەدات: بۆ ئەوەی وێنەیەکی ڕوون لەسەر دیوارەکە ببینین پێویستە هەموو ڕووناکیەکانی ژوورەکە بکوژێنینەوە! بۆ ئەوەی هەندێ کەلێن و قوژبن ڕووناك بکەینەوە، دەبێ تاریکی بکەینە بەرگی زۆر شت.. بەم پێیە ڕوونکردنەوە و (کەشفی زانستی)، هەمیشە شێوازێکی نابینایی هێناوەتە بەرهەم. ڕەنگە لە ڕۆحی هەموو زانینێکی زانستانەدا، نەزانینێکی بەر بڵاویش هەبێت. بەڵام هەر زانست بەرهەمهێنەری تاریکی نیە، بەڵکو تاریکییەکی سرووشتی تریش هەیە کە دەکرێت بە تاریکی گەردوون و جیهانی ناو ببەین. تاریکییەك، کە بە ئاسانی خۆی نادات بەدەست ئاستەکانی تێگەیشتنی مرۆڤەوە. وەك پاسکاڵ گوتویە: (*دڵ دەلیلی خۆی هەیە کە عەقڵ*

*هەرگیز تێیان ناگات*). ئەو دەلیلانەی لەناو دڵدا بن، لە دەستی زانستیش پارێزراون چونکە زانست ناتوانێت ڕووناکییان بخاتە سەر. بەڵام هونەر دەتوانێت (هەڵبەت ئەو هونەرەی کە نایەوێت لەگەڵ زانستدا کێبەڕکێ بکات و شوێنی زانست بگرێتەوە). هۆی ئەو بێدەستەڵاتیەی زانستیش ئەوەیە کە لەجەوهەردا زانست نایەوێت لە نهێنیەکان وردبێتەوە، بەڵکو دەیەوێت (ئاشکرا)یان بکات و پەردەیان لەسەر هەڵداتەوەو لەئەنجامیشدا بیانسڕێتەوە. ئەمەش لە کاتێکدا هونەر، نهێنیمان لەلا خۆشەویست دەکات و لە ئاستیدا پتر سەر سووڕماومان دەکات. زانست کەشفی نهێنی شتەکان دەکات و تەجەللاکەیان دەڕەوێنێتەوە، لەکاتێکدا هونەر پارێزگاری ئەو تەجەللایە دەکات کە لە نهێنی شتەکاندا هەیە. والتەر بنیامین لەساڵانی سیدا نووسی (*بەرهەمی هونەری لەسەردەمی کۆپیکردنەوەی میکانیکیدا ئۆرگیناڵیەت و تەجەللای دانسقەبیبوونی خۆی لەدەست داوە*). ئەو زانستەی کە دەخوازێ بە زانستێکی ڕوونکەرەوە لەقەڵەم بدرێت، پێویستە لەو کاتەدا کە دەیەوێت لە (تاریکی) بکۆڵێتەوە، کاراکتەری خۆی بگۆڕێت. چونکە کاتێ (*مەشخەڵی زانستی*) دەبرێتە ناو هەرێمی تاریکییەوە کاتێ ڕۆشنگەری زانستانە لە (هێشتا نەزانراوێك) نزیك دەبێتەوە، ئەوە دان بەو تاریکییەدا، یان بەو نەزانراوەدا نانێت کە لە نادیاردا هەیە، بەڵکو لەخۆی دوور دەخاتەوە و بەچواردەوری خۆیدا، دەیڕەوێنێتەوە و دەیپەترێنێ.. دیمەنی ئەشکەوتێ بهێنەوە یادت کاتێ بە چرایەکەوە دەچینە ناوی: لەوێدا ڕووناکی چرا لەوەزیاتر کە تاریکی دەرەوونی ئەشکەوتەکە دەپەترێنێ و لەخۆی دووردەخاتەوە، چیتر ئەنجام دەدات.

## بەشووشەبوونی فەیلەسووف:

خواستی (ڕووناککردنەوە و ئاشکراکردن و تیشك خستنەسەر ڕووداوەکان و ژیانی تایبەتیی مرۆڤەکان، خواستێکە هەمیشە نییەتێکی تری لە پشتەوەیە کە لەلایەن دەسەڵاتەوە جڵەو دەکرێت. نییەتێك کە هەر تەنیا نیازی گەیشتن بە حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە یان ژیانی ئەو مرۆڤانە، نیە، بەڵکو نیازیشێتی تا سەر

ێسقانیان ڕۆچێت و بە دەماریانا بڕواتە خوارەوە!. لە ڕاستیدا، هەمیشە
ەسانێك هەن دەیانەوێت تا سەر ئێسقانمان ڕۆچن و تا ئەوپەڕی بۆ لووان
ەردەمان لەسەر هەڵدەنەوە.. ڕەنگە هەر هەستکردن بە فشاری ئەم تەماعە
ڕندەیەش بووبێت کە بۆ یەکەمجار نزیکەی دووسەد ساڵ بەر لەئێستا، مرۆڤێکی
ەك ژان ژاك ڕۆسۆی فەیلەسووف هاتبێتە سەر ئەو بڕوایەی بکەوێتە
ووسینەوەی (دانپیانانەکان)ی و بە دەستی خۆی ڕۆچێتە سەر ئێسقانی
خۆی.. لەڕاستیشدا کاتێ ڕۆسۆ بڕیاری دا (هەموو شتێ) لەسەر خۆی باس
کات، کەسانێك هەبوون دەیانویست بە ناخیدا بچنە خوارەوە و پەردە لەسەر
هێنییەکانی هەڵبدەنەوە! ڕۆسۆ ساڵی (١٧١٢) لە ژنێف هاتبووە دنیاوە و
ایکیشی بەسەریەوە گیانی دابوو. بێگومان ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی
ەستکردن بە گوناهێکی گەورە لای فەیلەسووفەکەمان و پێدەچێت هەر ئەم
ووداوەش بووبێتە هۆی وەکو بۆخۆی دەڵێت: (ژیانە ناسرووشتییـەکەی). ڕەنگە
اسرووشتی بوونی ئەو ژیانەش لەوەدا بووبێت کە ڕۆسۆ چێژێکی بێ ئەندازەی لە
ازار و سزا چەشتن وەردەگرت و ئەمەش ئەو شتەیە کە بە زمانی ئەمڕۆ پێی
ەگوترێت: (ماسۆشییەت):

*کێ باوەڕ دەکات چێژی ئەو سزایەی من لە تەمەنی هەشت ساڵیمدا بەدەستی*
*اتوونێکی سی ساڵە دەمچەشت، بە درێژایی ژیانم کاریگەرییەکی دیار دەکاتە*
*ەر زەوق و حەز و ئازار و مەیلە شەهوانیەکانم... تەنانەت دوای ئەوەش کە*
*یاوێکم لێدەرمات ئەم چێژە شیرینەم هەر تێدا مایەوە، ئەگەرچی گۆڕا بۆ*
*ەرمێکی زۆر و هەستیارییەکی بێوێنە.. بەچۆکدا هاتن لەبەردەم مەعشووقێکدا*
*گوێڕایەڵیکردنی، یان داوای لێبووردن لێی لەسەر شتێك.. بەلای منەوە، پڕ*
*پێژترین ئارەزووی شەهوانی بوو. چەندێ خەیاڵیش زیاتر ئاگری بەردەدایە*
*ولێنم، ئەوەندەش پتر پێویستی من بەو خاتوونە ساردە زیادی ئەکرد..*(١)

اسۆشیەت بە درێژایی ژیان یەخەی ڕۆسۆی بەرنەدا. ئەمەش بەو مانایەی کە
ڕۆسۆ بەچاکی دەزانی لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا هەمیشە لە ململانێیەکی
ەردەوامدا بێت، لەبری ئەوەی ژیانێکی ئارام بژێت و چێژ لەو ناوبانگ و

خۆشەویستیە وەربگرێت کە لە دوایی تەمەنیدا وەك بارانی خێر بەسەریا دەباری.. ڕۆسۆ هەستیدەکرد **بەشوێنیەوەن** و **دەیویست** بەشوێنیەوە بن و لە ڕاستیشدا بەشوێنییەوە **بوون!** بەمانایەك ڕۆسۆ خۆی دەکاتە قارەمانی فەلسەفەکەی خۆی. ئەم منداڵە سەیرە هەر لەساتی یەکەمی ژیانیەوە تا ڕۆژی ٧/٤ی ١٧٧٨، کە لە تەمەنی ٦٦ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات دەبێت بە زۆر ناخۆشیدا تێپەڕێت.. کاتێ تەمەنی دەگاتە دە ساڵان، باوکی ڕۆسۆ ناچار دەبێت شاری (ژنێڤ) جێبهێڵێت و لێرەیش بەدواوە نۆرەی ڕۆسۆ دێت تا لەدەست سۆراخچیە خەیاڵییەکانی و ئەوانەی لە واقیعدا بەشوێنیەوە بوون، ڕابکات!. لەڕاستیشدا ڕۆسۆ ماوەی دە ساڵی ڕەبەق، واتە لە ١٧٦٠ بۆ ١٧٧٠ سۆراخی دەکرا، کتێبەکانی بەبەرچاوی خەڵکەوە دەسووتێنران تا ناچار کرا هەڵێتە ئینگلستان و، لەوێش دەیڤید هیومی فەیلەسووف ئامێزی میوانداریی بۆگرتەوە. بەڵام تازە ڕۆسۆ لەهەموو جێگەیەك نەیارەکانی خۆی دەبینی و ختوورەی فەنتازیاکانی وازیان لێنەدەهێنا.. لەسەری خۆیدا جیهان بۆی دەگەڕا و دنیای بەشوێنەوە بوو. هەر بۆ زاڵبوونیش بەسەر ئەم هەستەدا و بۆ هێورکرنەوە و دەستەمۆکردنیان بوو کە ڕۆسۆ بڕیاری دا (دانپیانانەکان)ی لە نێوان ساڵانی ١٧٦٥وە بۆ ١٧٧٠ بنووسێتەوە. ئەم دانپیانانـە سنگفراوانەیەی ڕۆسۆ بە یەکەمین ژیاننامەنووسی مۆدێرن لەقەڵەم دراوە. ژیاننامەنووسیش وەك ناوەکەی ئاشکرای دەکات، بریتیە لە بەرهەمهێنانەوەی ژیانێك بەنووسین، یان وەکو واڵتەر بنیامین دەڵێت: لە(*ژیاننامەنووسیدا ڕەچاوی کات و ڕێکخستنی ئەو شتانە دەکرێت کە شەپۆلەکانی ژیانێکیان پێکهێناوە*(٢) لەکاتێکدا بیرەوەری تەنیا هەڵبژاردەی یادگارەکانی ئەو ژیانەیە.

ڕۆسۆ دەیویست ژیانی خۆی بەرهەم بهێنێتەوە، ئەمەش بەجۆرێ کە هەموو کەلێنەکانی ئەو ژیانە، بەبێ ماکیاج و دەمامك لەچوارچێوەی حەقیقەتی ڕووت و قووتی خۆیاندا ئاشکرا ببێت.. ڕۆسۆ جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی کە، نیازییەتی لەسەر ژیانی خۆی (تەنیا ڕاستیمان پێبڵێت و بە حەقیقیترین شێوە خۆیمان بۆ ئاشکرا بکات. بەمانایەکی دیکە، ئەو دەیویست ( دڵی خۆی بکاتەوە

وای لێبکات بۆ هەمووان قابیلی بینین بێت. پێشزەمینەی ئەم جنوونی خۆ
ئاشکراکردن و ئیعتیرافکردنە، هەروەکو لە پێشاندا گوتم، بریتی بوو لەو
ڕوشارەی ڕۆسۆ لە ئەنجامی هەستکردنی بەوەی کەسانێك بەشوێنیەوەن و
ویانەوێت بە ناخیا بچنە خوارەوە. ئەمەش پێماندەڵێت، عەودالّبوون بەدوای
ئاشنگەری و ئاشکرابوون و ڕوونبوونەوەی ڕەهادا، بەتوندی بەسراوە بە
ئوورەکانی فەنتازیاوە. ڕۆسۆ دەیویست ژیانی ناوەوەی خۆی هێندە بە ڕوونی
ئاشکرا بکات کە پێشتر کاری وەها نەکرابێت و لەم ڕێگەیەشەوە پێش
ڕاخچی و ڕووتکەرەوەکانی بەدەستی خۆی خۆی ئاشکرا بکات. ڕەنگە هۆی
سەرەکی ئەم کارەش ئەو دڵنیاییە بووبێت کە ڕۆسۆ سەبارەت بە نەیارەکانی
هەیبوو، چونکە ئەو لێی ئاشکرابوو جگە لەخۆی هەر کەسانێکی دی
بەسەرهاتەکانی ئەویان بگێڕایەتەوە درۆیان بەدەمەوە دەکرد، ڕیسوایان دەکرد
و شتی ناڕاستیان بۆ هەڵدەبەست:

*من خودی حەقیقەتم بەگوێی خوێنەرەکانم گەیاندووە. ئەگەر کەسێکیش جگە
لەم ڕاستیە نووسراوانە شتێکی تر بزانێت، با هەزار جاریش سەلمێنرابێت، ئەوە
هەر درۆ ئەکات*(٣)

ئەم خۆ خستنەڕووە بێترس و بێباکانەیەی ڕۆسۆ، لە دوا ئەنجامدا دەچێتە
خزمەتی خۆیەوە. ڕەوایەتی پێدەبەخشێت و ئەوە نیشان دەدات کە ئەو لە
قووڵایی ناخی خۆیدا مرۆڤێکی *باش* بوو. هەربۆیەشە ڕۆسۆ بە پێوە و بەبێ
ترس لەبەردەم داوەری مەزندا، خۆی بە ڕووتی نومایش دەدات. ئەو لە کۆتایی
ژیانیشیدا بەهەمان شێوەی سەرەتای ژیانی ڕووت و قووت بوو: (بەڕووتی دێینە
دنیاوە و بەڕووتیش دنیا جێدەهێڵین!):

*دەست دەدەمە کارێك پێشتر هیچ سابیقەی نەبووە و کەسیش لاسایی
ناکاتەوە. دەمویست بەسەرهاتی پیاوێك بەهەموو خەسڵەتە واقیعیەکانیەوە بە
دۆست و ناسیاوەکانم پیشان بدەم کە ئەو پیاوەش بۆخۆم دەبم. بۆخۆم
بەتەنیا. من هەست بە دڵی خۆم دەکەم و خەڵکانێکیش دەناسم، بەڵام من وەك
هیچکامێ لەو کەسانە دروست نەبووم کە بینیومن و ئەدگاریشیم لە ئەدگاری*

*کەس ناچێت. خۆ ئەگەر لە باقی ئەوانیتر باشتر نیم، ئەوە بەلای کەمەوە لە کەسیشیان ناچم و جیاوازم... لێگەڕێ ڕۆژی قیامەت بەرپا ببێت تا من ئەم کتێبە بەدەستمەوە لەبەردەمی دەروازەی داوەری مەزندا ئامادەبم و بەدەنگێکی ڕوون بڵێم: ئەمەیە ئەو شتەی کردوومە و هەبووم و بیرم لێکردۆتەوە. چاکە و خراپەکانیشمم بە ڕاشکاوی بەیان کردوون و هیچم نەشاردۆتەوە*(٤)

ڕۆسۆ دەیویست خۆی بۆ (داوەری مەزن) ئاشکرا بکات، واتە بۆ یەزدانی (بەهەموو شت دانا و سەروەر) ئەمەش ڕێك لەسەر ئەو خەیاڵەی ڕۆسۆ لەسەر چۆنێتی دیتنی خۆی لە چاوی یەزدانەوە، لەسەریدا دروستی کردبوو! بێگومان ڕۆسۆ دەیزانی کە نیگای یەزدان هەموو شتێ دەبینێت و هەموو نهێنییەکیش ئاشکرا دەکات. ئەمەش بەو مانایەی کە ئێمە ناتوانین هیچ لە یەزدان بشارینەوە.. کەواتە حەقیقەتی ڕووت دەبێت ئەو ڕاستیە بێ کە تەنیا بۆ یەزدان ئاشکرا دەبێت. بەڵام کاتێ مرۆڤ خۆی عەودالّی ئەو حەقیقەتە ڕووتە دەبێت، بەمکارەی هەر کێبەڕکێ لەگەڵ گوزارشچی و جاسووسەکاندا، یاخود فریشتەکانی سەر شانیدا ناکات. نیەتی هەر ئەوە نیە پێش فریشتەکان بۆخۆی ببێتە شایەتی خۆی و لەبەردەمی یەزداندا ئیعتیراف بکات، وەك ڕۆسۆ دەیەوێت پیشانی بدات. بەڵکو پێشمان دەڵێت ئەو وەك مرۆڤێك بڕوای هەیە کە دەتوانێت بەشداری بکات لە ئیشکردن بە ئاوەزی خواوەندیی و دەشتوانێت خۆیشی وەك یەزدان شتەکانی لێئاشکراو ڕوون بن.. لە دوا ئەنجامیشدا پێماندەڵێت کە مرۆڤ خۆی دەیەوێت لەمەڕ خۆی و کردارەکانیەوە داوەری بکات! ئەمەش جۆرێك لە خۆ بەرزکردنەوەیە بۆ ئاستی یەزدان و خۆ هەڵکێشانە بۆ هەمان ئاست خواوەندیی.. دیارە ئەمەش ئەو تێڕوانینە بوو کە هەریەك لە فەیلەسووفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری، لە شوێنێك لە شوێنەکانی بیرکردنەوەی خۆیاندا بڕوایان پێی هەبوو: حەقیقەتی ڕووت. چەمکی حەقیقەتی ڕووت لە دوا ئەنجامدا چەمکێکی تاوتۆلۆگی دووبارەوە بووە. چونکە حەقیقەتی کامڵ، هەمیشە حەقیقەتی ڕووتە. لە ڕێنیسانسیش بەرەو دواوە و تا ئێستا، بەرهەمهێنانی

ڕاستی وەك جۆریّ لە ڕووتبوونەوەی بەردەوامی لێهاتووە.. خواستی مرۆڤ بۆتە خواستیّ بۆ ڕووتکردنەوە و چوونە سەر ئێسقانی مرۆڤەکانی بەرامبەری.. لێرەیشەوە، چەمکی ڕووتبوونەوە مانایەکی جیاوازی لەڕووتبوونەوەی جەستەیی هەیە. واتە ڕووتبوونەوەی ئەودیوی جەستە و ئەودیوی پێست و خوێن، وەك ئەوەی لە شیتەڵکاری و ئاناتۆمیدا دەیبینین. حەقیقەتی ڕووت دەربڕینێکە زیاتر لە سەدەی شازدەیەم بەدواوە هاتە مەیدانەوە و لێرەیشەوە چەمکەکانی وەك شووشەیی بوون و خاوێنی و بریقە و باق، بوونە هاوشێوەیەکی دیکەی یان میتافۆری هەمان چەمك. نیتشە، کە هیچکاتیّ بڕوای بە چەمکی حەقیقەتی ڕووت نەهێنا پێی وابوو لە پشت هەموو خواستێکەوە بۆ ناسین و زانین، ترسێك هەیە کە وا لە مرۆڤ دەکات نەیەوێت هیچ شتیّ بە داپۆشراوی بمێنێتەوە بۆ ئەوەی ئازارمان نەدات و مەترسیمان بۆ دروست نەکات. هەروەها دەیگوت، هەموو ئامرازەکانی دانایی ئێمە، ئامرازگەلێکن بۆ سادەکردنەوە و بە تەجریدکردنی شتەکان تا کۆنترۆڵکردنیان ئاسان بێت.(٥) هەمان ترس لەودیو سیستەمە فەلسەفیە گەورەکانیشەوە دەبینینەوە، بۆ نمونە سیستەمی فەلسەفەی هیگڵی لە ئەنجامی ئەو ترسەوە دروستبوو کە هەمان سیستەم لەسەر ئەگەرەکانی(احتمالات) دەرەوەی خۆی هەیبوو. هەتا ئەو ئەگەرانەش هەبوونا، مەترسیەکان لەئارادا بوون.. بۆیە دەبوو سیستەمێك دروست بێت تا دوا ترس و دوایین گومانی ئیحتیمالی لەو دیوەوە نەمێنێت. چونکە تەنیا یەك وردە گومان بەسە بۆ ئەوەی هەموو کەرنەڤاڵ و بەرنامەکانمان لیّ هەڵوەشێنێتەوە. بەڵام کێن ئەو کەسانەی هەمیشە ئیدیعایەی (حەقیقەتی ڕووت) دەکەن و قسەی خۆیان لەسەر دنیا بە دوا قسە و لێکدانەوە دەزانن؟

ڕۆلان بارت دەیگوت، ئاخاوتن لەمەڕ حەقیقەتی ڕووتەوە شێوازێکی (بۆرجوازیانەی ئاخاوتنە(٦). جۆرێکە لە حساب بۆکردن و ڕەچاوکردنی وەلائەت و ملکەچی لەبەرامبەر دەستەڵاتدا و سەرشۆڕکردنە بۆ تاکڕەهەندی. یان ڕاسترە بگوتریّ جۆرێکە لە ملکەچی بۆ خۆ داپۆشینی قەدیس و قەشە و سیاسیی و

سەرۆك خێڵەكان. چونكە ڕووتی هەمیشە لەئەنجامی خۆداپۆشین یان خۆپێچانەوەوە، سەر هەڵدەدات. هیچ پەردەهەڵدانەوەیەكمان نیە ئەگەر پێشتر پەردە دادانەوەیەكمان نەبێت، هیچ ئاشكراكردنێك ڕوونادات ئەگەر پێشتر داپۆشینێك لەئارادا نەبێت. هیچ كەشفكردنێك نایەتەدی ئەگەر شاردنەوەیەك نەبێت و هتد. كاتێ حەقیقەتیش بەكراوەیی لەبەر چاوماندا نەبێت ئەوە بە مانای ئەوەیە كە خەڵكانێك هەن بەرژەوەندیان لە داپۆشین و شاردنەوەیایەتی... هەربۆیەشە دەتوانین وەك پرنسیپێك بڵێین: شاردنەوە و ئاشكراكردن، ڕوونی و تاریكی هەمیشە دوانەی پێكەوەیین و ئەمیان نیشانە و پێشزەمینەی ئەویتریانە.. بەرفراوانی و گەورەیی هەرێم و ئەو مەیدانانەی دەبێت ئاشكرایان بكەین، پێش هەموو شتێك نیشانە و بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانیی ئەو هەرێم و مەیدانانەی لێمان داپۆشراون. هێندە هەیە لەگەڵ هەموو هەنگاوێكدا كە لە ڕاستییەكانمان نزیك دەخاتەوە و خۆشی و كامەرانیمان دەخەنە دڵەوە، هەمیشە دووپشكی پرسیارە تۆقێنەرەكان چاوەڕێمان دەكات: كەی سەرلەنوێ داپۆشەرەكانی حەقیقەت شاڵاو دەهێننەوە؟ كەی لەشكری داپۆشینەكەیان پەلاماری ڕاستییەكان دەداتەوە تا سەرلەنوێ پێچی پێبدەنەوە و بیگۆڕن و مەكیاجی بكەن و بیشێوێنن؟!

** **

یەكێك لەشێوازەكانی سنووردانان بۆ بانگەشەی (حەقیقەتی ڕووت)، بریتیە لە گومانكردن لە زمان. چونكە زمان بۆی هەیە یەكەم داپۆشەر و مەكیاجكەری حەقیقەت بێت. كاتێ نیتشە دەیگوت: (حەقیقەت ئەو ئیستیعارە سواوانەیە كە بەهۆی بەردەوام بەكارهێناوە و دووبارەكردنەوەیان، وەهم بوونەكەیانمان لەبیر كردووە، گومانی خۆی لە ئاست زماندا دەردەبڕی.. بۆ ئەوەی بزانین كێن ئەوانەی لە خوتبەدان و وەعزدا لێهاتوون و لێكدا لێكدا پەیمانی گەیشتن بە حەقیقەتی ڕووتمان دەدەنێ، پێویستە بەوردی گوێ لەزمانەكەیان بگرین. چونكە ئەوانەی بەپلەی یەكەم لەشاردنەوەی ڕاستیدا جێگەی گومانن، جگە لە ناتیق و خەتیب و واعیز و ڕۆژنامەنووس و ستوون نووسەكان و پیاوانی زانست و

کسپێرتەکان و هتد، ناتوانن کەسیتر بن. هۆکەیشی ئەوەیە تەنیا ئەوان لە
بناوی کاریگەری بەخشین و شاردنەوەی ڕاستیدا زمانی خۆیان بەجۆرەها
ێوە دەڕازێننەوە، پێچ و پەنای پێدەدەن و سفت و لووسی دەکەن.. هەر
یەشە، زمانی ئەو کۆمەڵگایەی ژمارەی خوتبەدەر و ناتیقەکانی لە زۆربووندا
ت، کۆمەڵگایەکە زۆر ترین ڕێژەی حەقیقەتی تیا پێشێل دەکرێت. هەبوونی
بنبەرەکانی دەنگهەڵبڕین نیشانەی ئامادەیی و ئاشکرابوونی حەقیقەت نیە،
ڵکو نیشانەی ئامادەیی ڕۆحێکی خوتبەیی و هات و هاواری زۆرگوتنە. لە
ڕشنبیرییەکیشدا کە خوتبەدان و ووتاربێژی تاکە هۆی پەیوەندی بەستنی
کەکان بێت بەیەکترەوە، هەرگیز زمان ناتوانێت باس لە حەقیقەت بکات. بۆ
وەی زمان بتوانێت دەربڕی حەقیقەت بێت و وەك شووشە ئەودیوی خۆیمان
یشان بدات، بۆ ئەوەی زمان ببێتە جێگەی بڕوا لە گەیاندنی ڕاستیدا، پێویستە
ەستبەرداری ئەوانە بێت کە زمان لەسەر ئاستی خوتبەدان مەسرەف دەکەن و
کاریدەهێنن. کەواتە کردەی کەشفکردن و پەردە هەڵماڵین و ڕۆچوون تا سەر
یسقان و بە شووشەکردن، شتێ نیە بە خۆڕایی پێی بگەین، بەڵکو دەبێت
خی خۆی پێبدرێت: لەلایەکەوە دەبێتە هۆی وێرانکردنی زمان و لەلایەکی
یشەوە کاراکتەری تاکەکەس هەڵدەوەشێنێت. لەمەش زیاتر دەتوانین بڵێین،
، میکانیزمەکانی ئاشکرا کردن و چوونە سەر ئێسقانی خەڵکی و کردنیان بە
ووشە، دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی پرنسیپە ئەخلاقیەکانی خودی
ۆمەڵگای بۆرجوازیش. چونکە ئەم کۆمەڵگایە کە دەیەوێت کۆمەڵگایەك بێت
افی (موڵکایەتی تایبەت) بۆ ئەندامەکانی دابین بکات، دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵگایەك
، کۆنترۆڵی ئەندامەکانی دەکات. واتە کۆمەڵگایەك هەموو تاکەکانی ناوی
ەبنە چاودێریکەر بەسەر ژیانی یەکترەوە و خواستێکی بەردەوامیان هەیە بۆ
وەی (بەڕەی ژێر قاچی یەکتر دەربهێنن) و دەستی یەکدی بخەنە ڕوو.. لەم
ۆرە کۆمەڵگایەدا مرۆڤەکان تا ئەوپەڕی کەشف کراون و تا وردترین بەشی
ینەتیکییان پەردەی لەسەر هەڵدراوەتەوە. هەموو بۆ یەکتری ئاشکران و
بگایان وەك شووشە ئەودیو پێست و ئەناتۆمی لەشی یەکتر دەسمێت..

لێرەشەوە دەزگاکانی وەك پۆلیس و چاودێریکردن درێژبوونەوەی خۆیان لە پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا دابین دەکەن. ڕۆژگاریٚ کەمایەتیەك دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەدا دەسەپاند، ئەمەش بەو هۆیەوە کە خودی دەستەڵاتیان لە چەندین نهێنییەوە دەپێچاو لەکەسیان ئاشکرا نەدەکرد بۆ ئەوەی هەر لە دەست خۆیاندا بمێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مۆدێرندا، ئیدی دەبوو نهێنیەکانی دەسەڵات بۆ هەمووان ئاشکرا بێت. دەبوو دەسەڵات ئەوەندە خۆی ئاشکرا بکات کە دیار نەبێت و نەبینرێت.. ڕۆژگاریٚ بۆرجوازیەت ژیانی تایبەت و ناو چواردیوارەکانی ماڵی، بەیەکێك لەو مافانە تەفسیر دەکرد، کە هیچ شتیٚ نەبوو بتوانێت لە مرۆڤی بستێنێتەوە. بەڵام کاتیٚ سەردەمی کۆپیکردنی مرۆڤ هات و پێشاندانی لاشەی مرۆڤ بووە بابەتی پیشانگاکان و چەمکی (مرۆڤی شووشەیی) هاتە ئاراوە، ئیتر دیوارەکانی ماڵیش نەیانتوانی ئەو مافە بپارێزن و هەموو شتیٚ وەك شووشە ئەو دیوی خۆی پیشان دەدا.. لێرەیشەوە دەتوانین ژیان بە شووشەبەندێکی گەورە ناوبەرین کە بەشەرییەت لێوەی دەڕوانێتە یەکتر.. تازە هیچ شتیٚ بەتەنیا هی ئێمە نییە و هیچ شتێکیش وەك نهێنی ئێمە نەماوەتەوە. نهێنیەکانی ئێمە چەندە لە خۆمان شاراوەن ئەوەندەش لە خەڵکانی تر.. ڕەنگە ئەمەش مافێکی گەورەبێت بیٚ ئەوەی بەخۆمان زانیبێت دۆڕاندومانە.

## تاراوگە و بزربوون:

یەکێك لەو ئاگاییە تالآنەی تاراوگە پێماندەبەخشێت، یان بەسەرماندا دەیسەپێنیٚ، بریتیە لەهەستکردن بە کەمبوونەوەی سنوورەکانی سەربەخۆیی تاك.. غەییب بوونی تاك و تەسکبوونەوەی بواری ژیانی تاکەکەسی تاراوگەکراو، وەك بوویەکی ئۆتۆنۆم ئاگاییەکە لە ئەنجامی ئەو میکانیزمی تێڕوانینەوە دێتە دی کە ئەویتر لە ڕێگەیەوە تۆی پێدەبینێت.. چەندە زەحمەتە تاکەکەسی تاراوگەکراو، فرسەتی بێتە دەست تا بەناوی خۆیەوە و بەهۆی ئامادەیی فیزیکی و جەستەیی خۆیەوە لەبەردەم ئەویتردا خۆی بناسێنیٚ.. کاتیٚ یەکەم

پرسیار بریتبێت لە: (تۆ خەڵکی کوێیت؟) ئیتر تۆی تاك تێکەڵ بە پرۆسەیەك دەکرێیت کە پێش ناسینی خۆت، داوای ناساندنی ڕووبەرێکی گەورەترت لێدەکات.. بەوجۆرەیش ئەو پرسیارە لەعنەتیە دەتخاتە سەر سکەیەکی وەڵامدانەوەی ئەوتۆ کە هەرچەند بەسەریا بڕۆیت، ئەوەندەش لە خۆت و خەسڵەتە فەردیەکانی خۆت دوورت دەخاتەوە.. ئالێرەشدا، بە پێچەوانەی تێگەیشتنە سادەکانەوە، منی تاراوگەیی نەك هەر فەرد بوونی خۆمم لە تاراوگە تەحقیق نەکردووە، بەڵکو هەموو ئەو خەسڵەتە فەردیانەشم دۆڕاندووە کە بە درێژایی تەمەنی پێش تاراوگەبوون، بەهەزار حاڵ، خۆم کردە خاوەنیان: بڕوا بەخۆبوون، عەفەویەت، گەرم و گوڕی، پێکەوە گونجان، ڕووخۆشی، فێڵ و شەیتانی و سەلیقە و وردە پێکەنین و هتد. بۆیەش دەڵێم بەهەزار حاڵ خۆم کردە خاوەنی ئەم خەسڵەتانە، چونکە ئەو سنوورانەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئێمە بۆیان داناوین و ئەو ئازادیەی ئەو سنوورانە بە ئێمەیان ڕەوا دەبینن، ڕێگەت پێنادەن بە ئاسانی بڕوات بەخۆت بێت، بە ئاسانی عەفەوی بیت (چونکە هەردەم زنجیرە یاسا و نەریتێ هەیە عەفەویەتت تیا دەکوژێ) ڕێگەت پێنادەن بە ئاسانی گەرم و گوڕ بیت و ڕووخۆش بیت و شەیتان بیت و سەلیقە و تواناکانت پراکتیزە بکەیت.. با بێمەوە سەر باسە سەرەکییەکە: بێمانایە لە تاراوگە بیت و باسی تاکبوون و ئیندیڤیدواڵیتی خۆت بکەیت.. لە بیرمان نەچێت مانای چەمکی (*Individ*) ئین - دی - ڤاید بریتیە لە دابەش- نەبوون، تاکێك کە نابێ بە دوان. کاتێ تۆ تاکەکەسیت کە دابەش نابیت بۆسەر ژمارەیەکی تر و هەر بەتاکی دەمێنیتەوە، کە ئەمەش خەسڵەتی نمونەیی و یەکتایی و ئۆرگیناڵیەتی تۆیە.. هەر تاکەکەسێك نمونەیەکی بێ نمونەیە یان وەك دیموکریتۆس پێش زیاتر لە دووهەزار ساڵ گوتویە: (هەر تاکەکەسێك جیهانێکی سەربەخۆیە.. کە جیهانێکی سەربەخۆیش بوویت واتە نابیتە بەشێ لە جیهانێکی تر و بەردەوام سەر بە (خۆتیت). لە ڕاستیشدا، ئێمە ناتوانین هەم دووکەس بین و هەم یەك کەسیش. (تاك)بوونی خۆمانە کە وا دەکات هەمیشە چەند بەشێ لە تاکبوونی (ئەویتر)مان لەلا نائاشکرا بێت. ئەمەش ئەو نرخەیە

که ئێمە ناسنامەی خۆمانی پێدەکرێن: من هەمیشە ئەبێ ئەویتر وەك (غەیرە)ی خۆم ببینم ، چونکە ئەگەر ئەویشم وەك خۆم بینی و لەگەڵیا هاوجووت بووم، ئەوە من وەك خودێك کۆتاییم پێدێت. تا ئەوکاتەی (نارسیسیس)ی کوڕە لاوی ناو ئەفسانەکە لە دوورەوە تەماشای وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا دەکات، چ کێشەیەکی تووش نابێت، بەڵام کاتێ ئەوەندە عاشقی خۆی دەبێت و لە وێنەکەی خۆی نزیکدەبێتەوە و لەگەڵیدا هاوجووت ئەبێت، (خنکان) باوەشی بۆ دەکاتەوە. هەموو فەلسەفەی تاکبوون لەم ڕستەیەدا کورتدەکرێتەوە: ***من ئەوەم کە هەم، لەبەر ئەوەی من ڕێك ئەوە نیم کە ئەوانیتر هەن***.. من تەنیا دەتوانم ئەوکاتە تاك و سەربەخۆ بم، کە هەموو ئەوانیتر وەك (ئەوانیتر) ببینم. چونکە ئەگەر ئەویتر وەك من وابێت ئەوە منیش وەك ئەوم و، ئەوکاتەش کێ دەزانێت کێمان کامانین؟! کاتێ دەڵێم تاراوگە هەرگیز ڕێگەت پێنادات خۆت بیت، مەبەستم ئەوەیە بڵێم هەرگیز وەك تاکەکەس باوەشت بۆ ناکاتەوە. هەموو تاراوگەکراوێك خشتێکی بچووك لە پێکهاتەیەکی گەورەتر پێکدەهێنێت. لە کتێبی ***دیاردەگەرایی تاراوگە***(١٩٩٥)دا، بەترسەوە نوسیم: (***هیچ پەنابەرێك بەبێ پەنابەرێکی دی مانای نییە***). ڕەنگە هۆی ئەو ترسەش ئەوە بوبێت کە دەرککردنی ئەو ڕاستییە لەسەرەتاوە ئاسان نەبوو. بەڵام کاتێ دە ساڵێك تێپەڕ دەبێت، دەتهێنێتە دەنگ و ناچار بە هەڵوێستەت دەکات لە ئاست ئەو قۆناغەدا کە تۆی تیا کراویتە بەشێ لە حەشاماتێکی گەورە و تەنیا، بەشێك لە نەوعێ مرۆڤ، نەك بتکاتە تاکە مرۆڤێك! ڕەنگە هۆیەك لەو هۆیانەش کە ناچارت دەکات بیر لە فەردبوون و ناسنامەی تاکایەتی خۆت بکەیتەوە، ترس بێت لە ئاگاییت بەرامبەر ئەو ڕاستییەی کە بەردەوام هەست ئەکەیت لەناو حەشاماتی خەڵکدا دەتوێنرێیتەوە. خەسڵەتە دانسقەکانت لێدادەماڵرێت و لەناو خەسڵەتی گرووپ و دەستە و تاقمە فەنتازیکراوەکاندا، ون دەکرێیت.. زمانی خۆتت لێدەسەنرێتەوە و زمانی توتیت پێدەبخشرێت تا بەردەوام ئەو شتانە بڵێیتەوە کە هی خۆت نین. تا ئاسانتر ڕووت بکرێیتەوە و پەردەت لەسەر هەڵبدرێتەوە و بکرێیتە شووشە. چونکە ڕووتکردنەوەی تاکەکەس بە تەنیا، زەحمەت ترە لە

ڕووتکردنەوەی وەك ئەندامی دەستە و گرووپێك. ئەو کاتەی توانرا تاکەکەسێك بخرێتە خانەیەکی تایبەتەوە و فۆڕمی ئەو خانەیەی پێ لەبەر کرا، ئەوە کەشفکردنیشی ئاسان دەبێت. چونکە ئەوکاتە نەك هەر خەسڵەتەکانی خۆی، بەڵکو خەسڵەتی هەموو ئەندامە لەیەکچووەکانی ئەو خانەیەش یارمەتیدەرن لە ڕووتکردنەوەیدا. کەواتە کە تاکە ئەندامێکمان ناسی هەموو ئەوانیتریشمان ناسیون، لەبەر ئەوەی ئەو میکانیزمەی ئەو تاکەی لەناو حەشاماتدا ونکردووە، هەمان میکانیزمیشە کە پێکهێنەری حەشاماتە لە ئەنجامی لێکچواندنی تاکەکان بە یەکتری. واتە میکانیزمی کۆپیکردنەوە و سەر لەنوێ بەرهەمهێنانەوە. کێ بێت ماوەی دەساڵ لە تاراوگە بووبێت و هەستی نەکردبێت ئەویش وەك کەلوپەلی سۆپەرمارکێتەکان، زادەی پرۆسەیەکی فرەبەرهەمهێنان نیە؟. غوربەت لە دوا ئەنجامدا وات لێدەکات کە چارەنووسی خۆت بە چارەنووسی ئەو قتووی بۆشاوانە بەراورد بکەیت کە هەموومان دەزانین دوای خاڵی بوونەوەیان لە کوێدا خۆیان دەبیننەوە: تەنەکەی خۆڵ!

## بەشووشەبوونی شاعیر!

*(چیم مابێ ئەیهێنم. لەبەرما چی مابێ،*
*کڵێتە و مشەماو کراس و پانتۆڵ و دەرپێم و گۆرەویم.*
*هەر هەمووی دائەنێم، ڕووت و قووت ئەبمەوە.*
*بەڕووتی ڕائەکەم، ئەچمە دەر)*
شێرکۆ بێکەس

تاراوگە جیهانێکە لە شووشەییبوونی خۆمانمان نزیکدەخاتەوە، دەمانکاتە شووشە تا ساتی شکان و هەڵڕزانە خوارەوەشمان پێشخات! چونکە لەوکاتەوە دەبیتە شووشە شکانیش دەبێتە چارەنووست: تاراوگە نایەوێت ببێتە شوێنی هەمیشەییت و گەرانتی هەمیشە مانەوەت لێرە پێنابەخشێت.. کەواتە هەرگیز ناتوانیت هەست بە دڵنیایی خۆت بکەیت و دڵ بە ماڵ و شوێنەکەت خۆش

بکەیت، چونکە بەردەوام گریمانەی گواستنەوەت و دەستاودەست پێکردنت لەئارادایە: دەستیش.. هەیە ئارام و لەسەر خۆ، هەیشە.. نەسرەوت و بێباك. خۆ ناکرێ هەمیشەش بەدبین بین و بڕوا بە هەبوونی دەستە نەرم و ئارام بەخش و میهرەبانەکانیش نەکەین.. بەڵام کاتێ دەبیتە شووشە، کریستاڵ دەبێتە ڕۆحت.. ئەوکاتەش دەبەنگییە، گەر گومانت لە هەبوونی دەستە نەسرەوتەکان کەمکەیتەوە. ڕەنگە شاعیریش ئەو کەسە بێت لە پێش هەمووان‌دا هەست بە شووشەیی بوونی خۆی بکات و ترسی ئەم دەستا و دەستپێکردن سەراپای ژیان و بیرکردنەوەی دابگرێت. لێرەیشەوە جێگەی سەر سووڕمان نییە کە دوا بەرهەمی شێرکۆ بێکەسی شاعیر جۆرێکە لەو تێکستانەی کە لەودیویەوە، پرۆسەی بەشووشەبوونی جیهانی تاکەکەس بەئاشکرا دیارە. بەمانایەکی تر، شیعریش مەیدانێکی دیکەی بەشووشەبوونی تاکەکەسە و ڕەنگە نزیکترین مەیدانیش بێت . لێرەیشەوە، هەستکردنی کوشندە بەدەستە نەسرەوتەکان، بە چاوە زەقەکان و ئەوانەی دەیانەوێ تاسەر ئێسقانمان ڕۆبچن، یەکێکە لە مایە گرنگەکانی(خاچ و مار و ڕۆژژمێری شاعیری). ئەوەی لە پشت هەر دێڕێکی ئەم بەرهەمە شیعرییەوە دەیبینین، هەمان دەستە کە شێرکۆ لە پشت مێژووی ئێمە و لە بەسەرهاتی ژیانی خۆیدا دەیبینێ و بە درێژایی ساڵەکان ویستویە هەم ئەو مێژووە و هەم شاعیرەکەیشمان ڕووتبکاتەوە، ئاشکرای بکات و لە خەسڵەتەکانی خۆی دابماڵێ.. ئەگەر ئەم خوێندنەوەیە ڕاستییەکی تێدابێت، ئەوە دەتوانین باس لەو چارەنووسە بکەین کە شێرکۆ و ڕۆسۆ پێکەوە دەبەستێتەوە: هەردووکیان ناچار کراون خۆیان بەدەستی خۆیان ئیعتیراف بکەن و بێنە دەنگ! ڕۆسۆ لەبەردەم خوا دا و شێرکۆ لەبەردەم شیعردا. بەڵام گومانی ڕۆسۆ و گومانی شێرکۆ لە ئاست مێژوودا یەك گومانە و ئەمانیش نایانەوێت خۆیان بدەنە دەست حوکمەکانی ئایندەی ئەو مێژووە. بەڵکو دەیانەوێت خۆیان ڕاستیمان لەسەر خۆیان پێبڵێن. خۆیان ژیانی خۆیانمان بۆ (بەرهەم بهێننەوە). لێرەشدا، ئەو گرنگیەی ڕۆسۆ دەیبەخشێتە نووسینەوەی (بایۆگرافیانە)ی ژیانی خۆی، شێرکۆ دەیبەخشێتە (دان پیانانە شیعری)یەکەی.

،ڕوەکو چۆن ڕۆسۆ نەیدەویست سۆراخچی و ڕووتکەرەوەکانی درۆی دەمەوە هەڵبەستن و ڕیسوای بکەن، شێرکۆش نایەوێت ئەو جەللاد و اسووسانەی بە دوایەوەن مێژووی ئەو بنووسنەوە و بوختانی بۆ دروستکەن.

،گەر لە دواجاردا خۆشەویستی ڕۆسۆ بۆ یەزدانی مەزن یان ترسی ئەو لە خوا، اندەرێ بێت بۆ خۆ ڕووتکردنەوەکەی، ئەوە خۆشەویستی شێرکۆ بۆ ەقیقەتی زمان و وشە هاندەری دانپیانان و خۆ ئاشکراکردنەکەیەتی. چونکە ،وەی دواجار شێرکۆی هێناوەتە دەنگ بریتیە لەو درۆیانەی دەسەڵاتی مێژوو، ردونیەتە حەقیقەتی ڕووداوەکانی ژیانی شێرکۆ. بەڵام ئەو دەسەڵاتی مێژوو ەتدەکاتەوە تا بەهۆی خوڵقاندنی حەقیقەتی خۆیەوە هەموو ئەو درۆیانەش استبکاتەوە یان تووڕیان هەڵدات کە مێژوو بە ڕووداوی ژیانی شاعیرەکەمانی ،قەڵەم داون.

، پشت بەرهەمەکەی شێرکۆ وە، هەستیارییەکی قووڵ هەیە بەرامبەر بە ساتە اراوگەییەکانی ژیان و ئەو میکانیزمانەی کە ڕۆژ بەڕۆژ پتر تەنك و شەففافمان ەکەن و بوارمان بۆ ناهێڵنەوە تاژیانمان لە خۆماندا و بۆخۆمان بێت. شێرکۆ ەم بەدەنگهاتنە شیعرییەی، بەشێکی زۆری ئەو پانتایی کۆنترۆڵکردنە ئاشکرا ،ەکات کە ژیانی ئینسانی ئەمڕۆی لە جیهاندا خستۆتە ژێر ڕەوتی خۆیەوە. لەو ،یو نیەتی تۆڕەکانی جاسووسی و مەکیاجی دیپلۆماسیەتەوە دێتە دەنگ و ئەو حەقیقەتە شاراوەیە ئاشکرا دەکات کە حەقیقەتی ئەوە و بەردەوام لە اریکاییدا دەهێڵرێتەوە.. بەڵام خۆ ڕووتکردنەوەی شێرکۆ، بەتەنیا لە پێناوی ئەوەدا نییە زامەکانی سەرجەستەی خۆی و جەستەی مێژووەکەی ببینین، بەڵکو بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو حەقیقەتە ساختەیەشە کە تائێستا خۆی وەك حەقیقەتی ئێمەش دەناساند و، خۆی دەخستە بری ئێمە و لەو ڕێگەیشەوە بێدەنگی دەکردین.

شێرکۆ نایەوێت کەس بچێتە بری ئەو تا بۆخۆی هەمیشە هەنگاوێ لەدواتر بوەستێ و عەیبەکانی دەرنەکەون.. بەڵکو ئەو هەنگاوێك دێتە پێشەوە تا خۆی ببێتە قسەکەر و حەقیقەتی خۆی بخوڵقێنێ.. بەمجۆرەش، شێرکۆ گوتارێکی

شیعریی دژ، یان ناکۆك به جیهانی ئەمڕۆ دەخولقێنێت. گەڕانەوەی ئەو هەر گەڕانەوە نیە لە پێناوی یادکردنەوەی ڕابردوودا، بە ڵکو لە پێناوی ئەوەشدایە تا ڕابردوو لەدەست مێژوو بستێنێتەوە و بە زمانی خۆی دایبڕێژێتەوە.. ئەمکارەش پێش هەموو شتێك، جۆرێکە لە یاخیبوون و خۆ جیاکردنەوە و بگرە ڕووتکردنەوەی مێژوو.. ڕەنگە لە قووڵایی پەیامی ئەم گوتارە شیعرییەشدا، جۆرێ لە ماندوویوون یان بێبڕوایی شێرکۆ بە ئایندەش هەبێت.. بەڵام ئەمە بەمانای ئەوە نا کە ئەو دەستبەرداری (خەونی قەسیدەی داهاتووی تازە تر) بووە. بەڵکو ڕەنگە ئەو نائومێدییە بەپلەی یەکەم نائومێدی ئەو بێت لە ئاست ڕۆڵی ئینسانی خۆی لە بیناکردنی داهاتوودا. مەبەستم ئەوەیە، ڕەنگە هەستیارییە شیعرییەکەی، شێرکۆی تەواو دڵنیاکردبێت کە هێزی خولقێنەری داهاتوو لەوە ناچێت هێزێکی ژیاندۆستی ئینسانی بێت، هێندەی ئەوەی دەشێت هێزێکی مەرگدۆستی ئینسانی بێت. شاعیریش کە نایەوێت لە داهاتوویەکی ئینسانی دڕندەدا خۆی ببینێتەوە، حەقیەتی نائومێد بێت، بەلای کەمەوە لەسەر پانتایی دەق و لەناو خەیاڵدا.. وە چەندە شێرکۆ لە شیعردا ڕۆ ئەچێ هێندەش ڕۆحە شووشەییەکەی پاکتر و گەشتر دەبێتەوە.. تراژیدیای شاعیریش هەر لەوەدا نییە کە ژیانی ئەو زووتر لە ژیانی ئێمە بەشووشە دەبێ، بەڵکو لەوەشدایە کە هەرچەند ئەو بەشووشە بوونە زووتر ببێتە واقیع، هێندەش ئیمکان و گریمانەی هەپروون بەهەپروونی شاعیر نزیکتر دەبێتەوە..

## بەشووشەبوونی عاشق

بە پێچەوانەی خۆڕووتکردنەوەی فەیلەسووف لەبەردەم یەزداندا و درکاندنی هەموو ڕاستیەك بۆیی و لەوێشەوە خۆ بەرزکردنەوەی بۆ ئاستی ئەو، هەروەها بە پێچەوانەی خۆ ئاشکراکردنی شاعیر لە زماندا و درکاندنی ڕاستی لەبەردەم شیعردا و بەو جۆرەش کردنی خۆی بە حەقیقەتی خۆی، ئەوە خۆ ڕووتکردنەوەی عاشق تەنیا لەبەردەم (ئەویتر)دا مانای هەیە. حەقیقەتی عاشق تەنیا ئەو کاتە ئەبێتە حەقیقەت کە ئەو خۆی بۆ (ئەویتر)، واتە بۆ مەعشووق

اشکرا بکات. بەڵام لەو شوێنەی مەعشووق ئامادەبێ هەموو حەقیقەتێکیش
ەر هی ئەوە، ئەم حەقیقەتەش نایەتە دی ئەگەر عاشق خۆی و حەقیقەتی
خۆی نەفی نەکردبێ.. لێرەیشەوە، هەمیشە تراژیدیای عاشق لە تراژیدیای هەر
ەك لە فەیلەسووف و شاعیر گەورەترە.
هەرچەندە فەیلەسووف پێمان بڵێت ئەو هەموو ڕاستییەکمان پێدەڵێت و
شاعیریش هەرچەندە تا ئەوپەڕی ئیمکان خۆی ئاشکرا بکات، هێشتا ئەو کارەی
ئەوان دەیکەن کارێکە بەهۆی زمانەوە و بەپلەی یەکەم خۆ ڕووتکردنەوەیە لە
(زمان)دا. ئەوان بەوەی زمان دەکەنە نوێنەری خۆیان، بەوەی لە ڕێگەی
زمانەوە خۆیان ڕووت دەکەنەوە، ئەوە مانای ئەوەیە هێشتا ئەوان وەك خاوەنی
(خود)ی خۆیان دەمێننەوە. ڕۆسۆ بەوەی کە دەڵێت هەموو ڕاستییەکمان
پێدەڵێت، گوتوشیەتی بڕوا بەزمانم بکەن کە لەسەر خودی خۆم ڕاستیتان بۆ
بەیان دەکات. شێرکۆ بەوەی کە تاریکاییەکانی ژیانی خۆیمان لە ڕۆشنگەری
شیعردا بۆ بەرهەم دەهێنێتەوە، پێشمان دەڵێت ڕیوایەتی شیعر وەك ڕیوایەتی
ڕاستەقینەی ژیانی ئەو ببینین. بەڵام ئەوان هەردووکیان بەوەی کە زمان پێش
خۆیان دەخەن و لە زماندا خودێك بۆ خۆیان بەرهەم دەهێنن، ئەوە هەوڵیش
دەدەن قایلمان بکەن تا لە ئاست خودی جەستەیی خۆیاندا بێدەنگ بین. ئەوان
هەرگیز لە سەدا سەد بەشداری یاری خۆڕووتکردنەوە ناکەن و هەمیشە
توولەڕێگایەکی گەڕانەوە بۆ ڕزگارکردنی خودی ڕاستەقینەی خۆیان دەهێڵنەوە.
ڕۆسۆ لە دوو بەرگدا و بە درێژایی ٥٨٠ لاپەڕە و شێرکۆ لە (ڕۆمانە شیعر)ێکدا،
ئەو ڕاستیەمان بۆ باسدەکەن کە ڕاستی ئەوانە لە(زماندا). یەکەمیان بەهۆی
تەئەممولەوە و دووەمیان بەهۆی فەنتازیاوە، بەڵام (خودی خۆیان) هێشتا
لەژیانی ئەو دیو تێکستەکانیانەوە دەمێننەوە.
ئەوەی کە هیچ خەتێکی گەڕانەوە بۆ خودی خۆی ناهێڵێتەوە و لە سەدا سەد
دەچێتە ناو ئەو یارییەوە، عاشقە. خۆڕووتکردنەوەی عاشق، خۆ
ڕووتکردنەوەیە لە سەر ئاستی جەستە و ڕۆح و (هەموو خۆی).. عاشق نە هیچ
میتافۆرێك بەکار دەهێنێت و نە لەپشتی هیچ دەربڕینێکی زمانیشەوە خۆی

دەشارێتەوە. نە فەنتازیایەك ئەو ڕزگار دەكات و نەهیچ بیركردنەوەیەكیش.. ئەو هیچ شێوازێكی دەربڕینیش ناخاتە بری خۆی، بەڵكو هەموو خۆی بۆ یەكجار و بەتەواوی ڕووت و قووت دەخاتە بانقی عەشقەوە.

** ** **

ئەم خۆ ڕووتكردنەوەیە، خۆ نەفیكردنی ڕەهایە لە مەعشووقدا و بریتیە لەشیكردنەوە و گۆڕینی خود بۆ خاوێنترین و تەنكترین و ناسكترین ئاستی بەشووشە بوون. ڕەنگە پەیامی هەر عاشقێك لەوە زیاتر نەبێت كە پێمان بڵێ: ئەوەتا (م/ن) هێندە ڕوونم و هێندە شەففاف و ئاشكرا، كە چیدی خۆم نابینم و خۆمم بۆ گرنگ نییە، من بۆ ئەو هەم..

ڕۆسۆ لەگەڵ هەموو تراژیدیاكاندا، هێشتا درێژە بە سەفەر و ڕاكردنەكانی دەدات و، بگرە دانپیانانەكانی لە ئاهەنگ و شەوی ناو هۆڵەكاندا بۆ دۆست و هاوڕێكانی دەخوێنێتەوە. شێركۆ واقیعی ترە: ئەگەرچی لە كۆتایی ەقەكەیدا و لە شێوازی پرسیاردا ئاماژە بۆ مەرگ دەكات، بەڵام هێشتا هیوای خەوبینینی بە قەسیدەی تازەوە نەدۆڕاندووە.. تاقە كەسێ لەم كەین و بەینەدا عاشقە كە بەبێ هیچ پەناگەیەك دەمێنێتەوە. چونكە ئەو هیچ وەختێ ڕێگای گەڕانەوە بۆخۆی نەهێشتۆتەوە. شاعیر و فەیلەسووف هەرگیز لە سەدا سەد نائومێد نابن، چونكە هەردەم بەهۆی ئەو حەكایەتەی لەسەر ژیانی خۆیان دروستی دەكەن، بوارێك بۆ خۆشاردنەوەی خۆشیان دابین دەكەن. چونكە هەرچەندە بەدیققەتەوە ژیانی خۆیان بەرهەم بهێننەوە و دەق بكەنە ئاوێنەی ئەو ژیانە، هێشتا چەندین خاڵ هەیە ناتوانن ببیبنن. بەڵام ئەگەر عاشق نائومێد بێت ئەوە بۆ هەمیشە نائومێد دەبێت. ئەو نەك هەر جەستەو ڕۆح لە دەست ئەدات و هیچ دەقێك ناخوڵقێنێ، بەڵكو خەونیش دەدۆڕێنێ. شاعیر و فەیلەسووف هەمیشە ئومێدی (خۆ ئاشكراكردنەوەی تر لە زماندا) وەك ئیحتیمالی مانەوەی خۆیان دەبینن و لەم ڕووەیشەوە زیاتر لە عاشق میتافیزیترن (ئەگەرچی لەگەڵ هەموو خۆ ئاشكراكردنێكیاندا پتر دەبنە شووشە و پتر لە شكان نزیك دەبنەوە). بەڵام ئەگەر عاشق نائومێد ببێت ئەوە لە شكان نزیك نابێتەوە، بەڵكو زڕەی

پارچەپارچەبوونی خۆی ڕادەگەیەنێ.. ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێت ڕێگە بەخۆم دەدەم کە بڵێم: ئەو دەسەڵاتەی عاشق نەفی دەکات لە دەسەڵاتی خوا کە فەیلەسووف ناچار بە دان پیانان و، لە دەسەڵاتی مێژوو کە شاعیر ناچار بە خۆ ئاشکراکردن دەکات، گەورەتر و زەبراوی ترە. دەشێت فەیلەسووف و شاعیر هەمیشە لەلایەن جاسووسەکانی جەللاد و دەزگاکانی (پاراستن و ئیستیخبارات و ئاسایش و کۆکردنەوەی زانیاریی)ـەوە، مەترسییان لەسەر بێت و بگیرێن و سزاش بدرێن.. بەڵام هێشتا گریمانەی مانەوەی شاعیر و فەیلەسووف لە دەقدا، لەئارادایە.. کەچی مەعشووق لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ جاسووس و هەواڵدەرێکی نییە، هیچ دەزگایەکی چاودێری و کۆنترۆڵی نییە، هێشتا بەو پەڕی خاوێنیەوە و بەبێ ئەوەی کەس بتوانێت پەنجەی تاوانباریی بۆ ڕابکێشێت، دەتوانێت عاشق بسڕێتەوە و مافی ژیانی بۆ هەمیشە لێبسەنێتەوە.. ئەو مرۆڤەی لەعەشقدا ناکام دەبێت، (ژیان)ی لێدەبێتە ئەو تەڵزمە شووشەیەی لەهەموو ساتێکدا لە ڕۆحی هەڵدەچەقێت..

## دوای دەساڵ مانەوە لە...

ئایا بۆم هەیە پاش دە ساڵ مانەوە لە هەندەران و تاراوگەکەیدا، چاوێ بە ژیانمدا بگێڕمەوە و لەخۆم بپرسم: چ نهێنییەکم ماوە بەتەنیا هی خۆم بێت و هێشتا لەسەر شاشەی کۆمپیۆتەر و داتاکان یاداشت نەکرابێت؟ بەمانایەکی تر، ئایا من شتێکم هەیە تایبەت بێت بەخۆم و هێشتا بەرپرس و شارەزاکان پەییان پێی نەبردبێت؟!

ئەوەتا من ئەمساڵ مافی بوون بە هاووڵاتیی ئەم هەرێمەم وەرگرت. واتە بەپێی یاسا بووم بەئەندامێکی ڕەسمی ئەم وڵاتەو ئیتر بەلای کەمەوە، بۆ ڤیزە وەرگرتن لە چوونە بەردەم بەشێکی زۆری سەفارەتخانەکان ڕزگارم بووە. ئەمەش ئازادی و چێژێکی گەورەیە کە ئەو مافە بەمنی دەدات.. چ کەسێکیش هەیە مافی ئازادی بەخۆی ڕەوا نەبینێت؟

بەڵام هەتا پتر ڕۆژەکان تێپەڕ دەبن و زیاتر بڕوا دەکەم کە من چ مافێکم وەرگرتووەو بە درێژایی دەساڵ خۆمم بۆچ شتێك پاڵاوتووە، زیاتریش وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە ترس دەخەنە دڵمەوە: بە تێپەڕینی ڕۆژەکان خەریکم ئاشکرایی و ڕووتی خۆمم زیاتر بۆ دەردەکەوێت. خەریکم تێدەگەم لەوەی کە من تازە خاوەنی هیچ نهێنی و شتێکی تایبەت بەخۆم نیم.. ڕەنگە بێئەوەی بەخۆمم زانیبێت، دە ساڵ لە هەندەران ژیان و ئەزموونکردنی ساتە تاراوگەییەکانی، ناڕاستەوخۆ بەشداریکردن بوبێت لە یارییەکدا، کە هەموو دەستەکەمی تیا خراوەتە ڕوو! لەوە ئەچێ لەم ماوە دوور و درێژەدا بەردەوام هێزێك بەرە و خۆ ڕووتکردنەوەی هاندابم بەجۆرێ کە ئیدی ناتوانم خۆم داپۆشمەوە. ئەوەتا منیش مرۆڤەکانی تر بەڕووتی و بەبێ هیچ پەردەیەك دەبینم و ڕووناکایی نیگام ڕووبەری ڕووخسار و جەستەیان دەبڕێت و تا سەر شاراوەترین نهێنیان دەڕوات. ئای ، چەندە ئەوان بۆ من و منیش بۆ ئەوان قابیلی ڕونیەتم!؟.. من تازە لە دنیا ون نابم و لە هەر دەزگا و مووچەخۆری دایەرەیەك یان ئیستگایەکی پۆلیس پرسیاری ناوی من بکەیت، بەماوەیەکی کەم هەموو زانیارییەکت دەداتێ. لە کارمەندی هەر بانقێ پرسیاری دەرامەتی من بکەیت، بە وردی پێت ئەڵێ کە مانگانە چەندم یارمەتی وەرگرتووە و لەکێم وەرگرتووە. لەهەر دکتۆرێ یان شارەزایەکی کۆمەڵایەتی و دەروون ناسێك بپرسیت من چۆن هەڵسوکەوت دەکەم و چی دەخۆم و دەپۆشم و نەخۆشییەکانم چین و خاوەنی چ سایکۆلۆژیایەکم، بە ڕاشکاوی وەڵامی خۆت وەردەگریت.. من تاسەر ئێسقان کەشف بووم و دەستەکەم کەوتۆتە ڕوو.. تازە هیچ شوێنگەیەك و ناوێك، هیچ جل و بەرگێك، هیچ بەڵگەنامەیەکی ئەکادیمی و هتد، ناتوانێت بمشارێتەوە.. دیوارەکانی ماڵەکەم لە چاوبەستێك زیاتر هیچیتر نین. تەلەفزیۆنەکان و بنکەکانی ڕاپرسیی دەزانن چۆن ماڵەکەم ڕازاندۆتەوە، خواردنی ژەمەکانم چین و لەکام سۆپەرمارکێت کەل وپەلەکانم دەکڕم. ئاخر من بوومەتە مشتەری و مەسرەفکەر و ئەوانیش بەئەرکی خۆیانی دەزانن ئاگایان لێم بێت و هەموو ئەو ئیمکانیەتانەم بۆ بڕەخسێنن کە من وەك مەسرەفکەرێك

دەهێڵنەوە. ئەمەش پەیوەندی بە دیموکراتیەت و مافی هاووڵاتیانەوە هەیە.. من و هاوسێکانم ئەگەرچی پەیوەندیمان نیەو قسان لەگەڵ یەکتر ناکەین، بەڵام تا سەر ئێسقان شارەزای یەکترین و دەزانین چیمان لەژێر سەردایە. ڕۆژانە تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان هەواڵی ئێمە بۆ یەکتر دەگێڕنەوە و لە ئاست یەکدا ئاشکرامان دەکەن. ڕەنگە هەر لەبەرئەوەش بێت ئێمە ئیدی قسان لەگەڵ یەکتری ناکەین و کە لەسەر جادەش یەکدی ئەبینین، خۆمان لەیەك هەڵە ئەکەین.. چ پێویستییەکم بە هاوسێکەم هەیە؟ من خاوەنی تەلەفۆنی دەستی خۆمم، سەیارەی خۆم هەیە، چاویلکەی ڕەشی بەرهەتاو، دوا مۆدێلی تەلەفزیۆن، کامێرای فۆتۆ، کامێرای ڤیدیۆ، پایسکیلی بیست و یەك گێڕ، ڕەفەی ڕازاوە بە بتڵی خواردنەوەی هەمەجۆر، قەنەفەی چەرم، فاکس و ئەنتەرنێت، هەفتەی دوو جار ئەچم بۆ ساونا و مەلەکردن، وەرزش دەکەم، تەماشای هەموو دەورەکانی تۆپتۆپێنی جیهانی دەکەم، دوا مۆدێلی کەلوپەلەکانی مەتبەخ و مەکینەی قاوە دروستکردن و هتد. من چیدی (خۆم) نیم. چیدی ناتوانم لەسەر کاراکتەری تاکەکەسیی خۆمەوە ڕووبەڕووی دنیا ببمەوە. لەناو ئامێرو شتەکاندا خۆمم ونکردوەو تازە چیدی (خود)ێکم نیە ئاماژە بە (من) بکاتەوە..

** **

لەم هەموو ڕوونییەی خۆم و لەم هەموو بریسکە و شەوقدانەوەیە دەترسم.. تاراوگە پڕە لە نادیار و پڕە لە ساتی نائاشکرا.. چاکترە چیدی لەخۆم نەکۆڵمەوە و چیتر بەدەستی خۆم ئەمدیوەودیو بە بوونە شووشەییەکەم نەکەم.. دەزانم یەکێ خەسڵەتەکانی شووشە ئەوەیە ئەو کاتەی ڕوونترین و بریسکەدارترین ساتەکانی خۆی دەگوزەرێنێت، ئیحتیمالی شکان و هەپروون بەهەپروون بوونی لەهەموو کاتێکی دیکە زیاترە.. لەو ڕۆژەوەی شووشە هاتۆتە ناو ژیانی منەوە، ترسێکی دیکەشی خستۆتە دڵمەوە: ئەو ترسەی کە بە شکانەکەی، شکانی خودی خۆم و پارچە پارچەبوونی سەراپای خەونەکانم و دڵبەدنیاخۆشکردن و یۆتۆپیاکانم بیر دەخاتەوە.. با لەمە زیاتر شووشە

نەهێنینە دەنگ، چونکە هەر کاتیّ شووشە باسی خۆی بکات، شەقار دەبیّ..

***ئاه! چ لە عنەتێکە لە شووشە بچیت!***

١٩٩٨/٤

## پەراوێزەکان:

(١) ژان ژاك روسو: اعترافات (٢ جلد)، ت: فرهاد، تهران: نشر معرفت، ١٩٩١ل: ٤٣-٦٣،( بەکەمیّ دەستکارییەوە).

(٢) ئەم دێرەی بنیامینم لە وتارێکی (سۆزان سۆنتاگ)ەوە هێناوە، بڕوانە:
Susan Sontag: Under Saturrns tegn in: Tanke streger, Modtryk 1989, s. 15

(٣) ڕۆسۆ، ل: ٢٨٥

(٤) هـ. س. ل: ٢٢

(٥) ئەحمەدی: تردید.

(٦) R. Barthes: Mytologier, Biblioteket Rhodos, 1969

(٧) شێرکۆ بێکەس: خاچ و مار و ڕۆژژمێری شاعیریّ، ستۆکهۆلّم ١٩٩٧ ل:

# هونەر و بانگهێشتن (*Invitation*)

## بەرەو تیۆریزەکردنی ئێستاتیکای تاراوگە

**{پرۆژەی (*وشەو رەنگ*) وەك نمونە}**

### ٠. سەرەتا: هونەر و کێشەی (مێژوو):

ئەگەر تێگەیشتنمان لە چەمکی مێژوو، بەردەوامیی زنجیرەیەك ئەزموون و ڕووداوی ئینسانی لێکنەپساو بێ، کەبشییێت سەرلەنوێ بنووسرێنەوەو بەرهەم بهێنرێنەوە، ئەوە ناتوانین بەم تێگەیشتنەوە باس لە مێژووی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن لەکوردستاندا بکەین(١) هۆی ئەمەش بەبۆچوونی من دەگەڕێتەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی: یەکەم خاڵ ئەوەیە کە ڕەوتی هونەری شێوەکاریی کوردی و ئەزموونە ئیستاتیکییەکان لە کۆمەڵگای ئێمەدا، هەرگیز گەشەیەکی بەردەوام و زنجیرەییان نەبووە تا ئەم قۆناغ ببێتە بناغە بۆ قۆناغی پاشترو یەك ئەوی تر تەواو بکات، یان ڕەتی بکاتەوە. (بەردەوامیی) شتێکە نامۆ بە ئەزموونی ئیستاتیکی ئێمە و لێرەیشەوە ناتوانین مێژوویەك بەرهەم بهێنینەوە کەبەردەوامی و گەشەکردنی ئەم چالاکییەی مرۆڤی ئێمەی تیا بەرجەستە ببێت. بەمانایەکیتر، دەتوانین باس لەئەزموونی ئیستاتیکی چەند هونەرمەندێك بکەین کە لەماوەی جیاواز جیاوازدا، هەنگاوی شایانیان هەڵهێناوەتەوە. بەڵام ناتوانین ئەم هەنگاوانە وەك مێژوویەك تەماشا بکەین کە بەشێوەیەکی سرووشتی و بەپێی ڕەوتی ساڵەکان بەرەوپێش چووبێت. لێرەشەوە دابڕان و پچڕپچڕبوون بۆتە بەشێکی جیانەکراوە لەسرووشتی ئەزموونی هونەری لەکۆمەڵگای ئێمەدا و ئەگەر ئەمەش لەدوا ئەنجامدا مێژوویەکی پێکهێنابێ، ئەوە پێش هەموو شتێ (مێژوویەکی لێکهەڵوەشاو)ـە.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە ئەم مێژووە لێکهەڵوەشاوەی هونەری ناوبراو، هەمیشە لەپەراوێزی مێژوویەکی بەرفراوانتر و برپاردەرتردا ماوەتەوە، کەبریتییە لەمێژووی سیاسی کۆمەڵگای ئێمە. هونەری شێوەکاری کوردی و بەرهەمهێنانی هونەری لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەشێوەیەکی گشتی، هونەرێکە هەتائێستاش لەناو مێژوویەکی سەربەخۆی بەردەوامبوودا، نەژیاوە. واتە مێژوویەك کە هی خۆی بێت و سەربەخۆیی خۆی تیا تەحقیق کردبێ و دیسیپلینەکانی خۆی تیا دارشتبێ. بەڵکو مێژووێکە هەمیشە لەپەراوێزی مێژووی واقیعی کوردیدا ماوەتەوە.

بۆیە ئەگەر لەقسەکردنماندا لەسەر هونەری شێوەکاری کوردیی، مێژووی سەرهەڵدان و گەشەکردن و بەردەوامییەکەیمان پشتگوێ خست، ئەوە تووشی ناکۆکی و بازدانێکی میتۆدی نەبووین. بەڵکو رێك بەهەمان لۆژیکی گەشەسەندنی ئەم مەیدانە ئیش دەکەین. چونکە ڕەوتی گەشەکردنی هونەری شێوەکاری کوردی لەسەرجەمی ڕەوتی ژیان لەکوردستاندا جیاناکرێتەوە، کە ڕەوتێکە هەمیشە خۆی لەبەردەم هەلومەرج و بۆلووانی کورتخایەندا بینیوەتەوە تا کارایی و حەزی خۆی بۆ ژیان ئاشکرا بکات. لەکۆمەڵگایەکدا کە بارودۆخی سیاسی هەڕەشەیەکی بەردەوام بێت لەسەر ژیانی ئاسایی، ئەوە مرۆڤ نەك هەر ناتوانێت خەون بەئایندەوە ببینێت، بەڵکو بەردەوام لەبارودۆخی بەرگریکردنیشدایە بۆ ئەوەی ئەو ژیانەش لەدەست نەدات کە ئێستا تیایدا دەژی. هەمان پەیوەندی لەبواری هونەریشدا هەر ڕاستە و هەر ئەمەیشە هۆی دروستنەبوونی ڕەوت و قوتابخانەی سەربەخۆ بۆ هونەری شێوەکاری کوردی.

هۆی ئەمەش گەلێ سادەیە، چونکە دروستبوونی ڕەوت و قوتابخانەکان دیاردەگەلێکن لەناو ژیانێکی هاوسەنگ (ستابیل)دا دروست دەبن، کەتیایدا هونەرمەند بتوانێت خۆی بۆ تەرخانبکات و بۆی بژی و لەفۆرمۆلەکردنی تیۆریانە و ئێستاتیکیانەدا ئازاد بێت. بەڵام کاتێ ژیانە گشتییەکە هێندە بەسەختی مرۆڤ ڕاپێچی ژێر زەبری هەلومەرجەکانی خۆی بکا، ئیدی تەنیا هەلی

کورت و فرسەتی کورتخایەنی بۆ دەمێنێتەوە تابتوانێت گەشە بەئەزموونە ئیستاتیکیەکانی خۆی بدات.

** ** **

کەواتە بۆ قسەکردن لەسەر جۆرێك لەمێژووی سەربەخۆ بۆ هونەری شێوەکاری کوردیی، پێویستە دیققەت بدەینە ئەو هەل و فرسەتە کورتخایەنانەی هاتوونەتە بەردەم هونەرمەندە کوردەکان. واتە[*] بۆ ئەو ماوە زەمەنیانەی کە تاکە هونەرمەند توانیویەتی دەستی خۆی بوەشێنێت و ئەو شتە بکات کە خولیا و حەزی خۆیەتی، کە پراکتیزەکردنی ئازادی ناوەوەی خۆیەتی. تەنیا لەو فرسەتانەدا هونەرمەندی ئێمە توانیویە خۆی لەژیانە سەپاوەکە جیابکاتەوەو لەرێگەی بەرهەمەکانیەوە، ئەو جیهانە بهێنێتە بەرهەم کەخۆی تیا بینیوەتەوە، کە خواست و ویستی خۆی تیا بەرجەستە کردووە. بەم پێیەش قسەکردن لەسەر مێژووی هونەری شێوەکاری کوردیی، نەك هەر قسەکردن نییە لەسەر مێژوویەکی نەپساوی بەردەوامبوو، کەتیایدا قۆناغەکانی و ئاستەکانی لێکدی جودا بکرێنەوەو هونەرمەندە دیارەکان ئاماژەیان پێبدرێت، بەڵکو ئەو قسەکردنە ئەو کاتەش مانای هەیە کە بزانین ئێمە تەنیا لەبەردەم چەند *هەوڵدانێکداین* کەهەندێ هونەرمەندی کورد لەو فرسەتانەدا داویانن کە هاتونەتە بەردەمیان. کەواتە هونەری شێوەکاری کوردی لەتیوری و بەکارهێنانی کەرەستەدا لەگەڵ هونەری شێوەکاری کولتوورەکانی دیکە جیا نیە، بەڵام لە *هەبوونی مێژوودا* لێیان جیادەبێتەوە. دەتوانین باس لە مێژووی هونەری ئەوروپی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ڕێنیسانس و تا سەدەی حەفدەیەم و ئاراستەکانی مۆدیرنیزمی هونەری لەسەدەی بیستەمدا بکەین، بەڵام باسکردنێکی مێژوویی ئەوتۆی هونەری شێوەکاری کوردی، مانای نیە. ئەم بارودۆخە شوێنپەنجەی خۆی لە پرۆسەی نووسینەوەی مێژووشدا جێهێشتووە. واتە دەستنیشانکردنی نەبوونی مێژووێکی سەربەخۆ بۆ هونەر، خۆی لەخۆیدا دەستنیشانکردنی قەیرانێکیشە لەڕەوتی مێژوونووسیی کوردیدا. چونکە ڕۆڵی بڕیاردەرانە و زەبروزەنگی ڕووداوە سیاسیەکانی مەڵبەندی ئێمە، ڕاستەوخۆ

ته بەشێکیش لەپێکهاتەو زەبروزەنگی ڕەوتی نوسینەوەی مێژوو لەناو
شنبیریی ئێمەدا. واتە مێژووش وەك لقێکی بڕیاردەری بەرهەمهێنانی
ەقیقەت، یان وەك دەزگایەکی دانپیانراو، لەئاست لقە ڕۆشنبیریی و
نەرییەکانی تردا دڵڕەقبووە. پرسیاری ئەوەی چی ببێتە *بابەتی* مێژوو؟
ەمیشە پرسیارێکی زیندووی هیستۆریۆگراف کوردیی بووە. چونکە ئەم ڕەوتە
ەمیشە لەڕێگەی هەڵبژاردنی بابەتە خۆشەویست و سەرەکیەکەیەوە (کە
ێژووی لێکنەپساوی *سیاسییە*)، گەلێ بابەت و مەیدانی چالاکیی تری ژیانی
ۆڤی کوردی بەپەراوێزکردووە. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە لەزمانی کوردیدا،
انای زاراوەی مێژوو بەپلەی یەکەم و سەرەکی بریتیبێت لە (مێژووی
ەورە..).
ەبەست لەم زاراوەیەش، ئەو ڕەوتی نویسنەوەی مێژووەیە کەپێیوایە دەکرێت
بێ کێشەی میتۆدی و بەشێوەیەکی بەرفراوان بەسەرهاتەکانی نەتەوەیەك،
ۆرشێك، سەراپای وڵاتێك، یان هەرێمێکمان بۆ تۆمار بکات. ئەمەش بەجۆرێ
ە ناوەڕۆکی ئەو باسانەی تۆماریان دەکات وەك حەقیقەتێك دەخاتە ڕوو
ەلەڕابردوودا ڕوویانداوەو دەکرێت ئەمڕۆش بەدۆزینەوەی بەڵگەنامەکان و
اخکردنەوەیان، هەمان حەقیقەت بخرێتەوە پێشچاو. بەم پێیەش مێژوونووس
ەرکی خۆی بەوە پێناسەکردووە کە بەهۆی دەستنیشانکردنی ڕووداوەکان و
ۆکردنەوەی بەڵگەکان و نووسینەوەیان، دەشمانگەیەنێ بە خودی حەقیقەت..
ەشەوە مێژوونووسەکانی ئێمە هەمیشە وەك فریشتەی ڕزگارکەر و
ۆشنکەرەوەی ڕێگای نەتەوە لەشوێنگەی خۆیان تێگەیشتوون. چ
ێژوونووسێکی کۆن و نوێی ئێمەیە هەیە بەو نیەتە دەستی نەدابێتە قەڵەم
ەنەیویستبێت (ڕاستییە مێژووییەکانمان بۆ ڕوونبکاتەوە)!؟ ئەمەش لەو
اوبەستە(Illution) زیاتر هیچی تر نییە کە هەموو کایەیەکی
ەدەزگاییبوو، بەهۆی بێدەنگکردنی ڕەخنە لەئاست خۆیدا، بەرهەمی
ەهێنێت.

چاوبەستی (دۆزینەوەی حەقیقەت) بەهۆی نوسینەوەی مێژووەوە، بۆتە هۆی ئەوەی مێژوونووسەکان شوێنگەی ڕوانینی خۆیان لەیاد بکەن و لەبیریان بچێ ئەو شتەی ئەوان بە *حەقیقەت لە مێژووی کوردا* ناوی دەبەن، هیچ شتێ نییە بێجگە لە(بەرهەمهێنانەوەیەکی خەیاڵی)ی ڕووداوەکان. ئەوان لەیادیان چووە کە حەقیقەت لەو کارەدا، پێش هەموو شتێ پرۆسەیەکە، ئیمکانیان دەداتێ *خەیاڵ و لێکدانەوەی تایبەتی خۆیان لەشێوەی تێکستێکداو بەهۆی ئیمکانیەتەکانی دەربڕینی زمانەوە، لەسەر بابەتەکان دابڕێژن.* ڕێك لەبەر ئەوەش کەهێندەی ژمارەی مرۆڤەکان شێوەی دەربڕینی زمانیمان هەیە، ئەوە دەکرێت هێندەش (بەرهەمهێنانەوەی مێژوو)مان هەبێ. لێرەشەوە، دەتوانین بانگەشەی مێژوونووسەکان بۆ نووسینەوەی مێژوو، وەك ڕاستیەکی بابەتی کە (لەوێدا بێت و چاوەڕێی نووسینەوە بکات)، ڕەتبکەینەوە. هەربۆیەشە ڕەوایە ئەوەی تا ئێستا بەناوی (حەقیقەتی مێژوویی)یەوە لەسەر کولتووری ئێمە کراوەتە ماڵ، بە زەبروزەنگی ڕەوتی مێژوونووسیی کوردی ناو ببەین. چونکە هەموو چالاکیەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەی لە حەقیقەتی سیاسیدا، بە موتڵەق کردووە. کاتێ حەقیقەتێکی بەڕەهاکراویش دەبێتە تاقە ڕوانگە بۆ قسەکردن لەسەر کۆمەڵگاو مرۆڤی کورد، ئەوە بەمانای ئەوەیە جیاوازی و هەمەڕەنگبوونی ئەم کۆمەڵگایە لەبەر زەبری تاقە ڕاستیدا مایەپووچ دەکرێت.

بەمانایەکی تر، (مێژووی گەورە)ی ئێمە بۆتە پارسەنگی هەموو ڕاستی گوتنێ لەسەر کۆمەڵگا و مرۆڤی کورد و، بۆتە مێژوویەکیش کە مەشرووعەیەتی مێژووەکانی دیکە لەسایەی مەشرووعیەتی خۆیدا ببینێت و لە مێژووی خۆیان دایانبماڵێت. ئەم *زەبروزەنگە لەنوسینەوەی حەقیقەتدا*، وایکردووە کە هەموو چالاکیەکانی دیکەی مرۆڤی کورد، لەوانەش چالاکیی بەرهەمهێنانی هونەری، ببنە پەراوێزی چالاکیی سیاسی و نرخی هونەر بەپێی ئەو ئەرکانە هەڵبسەنگێنرێت کە لەئاست سیاسەتدا گرتوونیەتە ئەستۆ.

بەمانایەکی دیکە دەکرێ بڵێین: ئامادەیی ڕەهای بەها سیاسیەکان لەزەین و عەقڵیەتی مێژوونووسە کوردەکاندا، ڕێگەی گرتووە لەوەی نرخی چالاکیەکانی

ری مرۆڤی کورد، لەوانەش چالاکیی هونەری، لەڕەوتی نووسینەوەی مێژوودا،
ەك حەقیقەتی ئەزموونی ئیستاتیکی لەکۆمەڵگای ئێمەدا بەرجەستە بێن(٢)
ەمەش بۆتە ڕێگر لەبەردەم گەشەکردنی سەربەخۆیانەی لێکدانەوەکانی تری
رۆڤی کورد لەسەر خۆی و دنیای دەوروبەری. بۆیە بەبێ ئەوەی بمانەوێ حوکم
دەین، دەکرێ مێژووی هونەری شێوەکاری نەك هەر بە مێژوویەکی لێکپچڕاو
چوێنین، بەڵکو بەمێژوویەکیش ناوی بەرین کە لەناو مێژووی گەورەی کوردا
یچ نرخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە. بەجۆرێ لەلایەن مێژوونووسە کوردەکانەوە
ائەو ساتەوەختە وەك بەشێ لەمێژووی گەورەی سیاسیش تەماشای کراوە، کە
ونەر سەربەخۆبوونی خۆی و مێژووەکەی خۆی پشتگوێ خستبێ. ئەم حوکمە
ەبارەی دروستبوونی مێژوویێکی سەربەخۆ بۆ ئافرەتان، جوتیاران، شێتەکان،
وتابیان، مامۆستایان و هەموو گرووپەکانی تری ناو کۆمەڵگاش هەر ڕاستە.
چونکە ئەوانیش تائەو شوێنە لەناو مێژووی ڕەسمیدا جێگەیان بۆ کراوەتەوە،
کەمێژووی تایبەت بەخۆیان فەرامۆشکردبێ..

** ** **

ەڵام ئەگەر لەبەر ئەو دوو هۆیەی پێشوو نەتوانین بەبێ چاوەڕێکردنی هەندێ
کێشەی میتۆدی و بەبێ زاراوەی پێویست، باس لە مێژوویییەکی نەپساو،
ەردەوام و سەربەخۆی هونەری شێوەکاری کوردی بکەین، ئەوە دەکرێت بۆ
ەشداریکردن لەبەرهەمهێنانی ئەو مێژووەدا شێوازێکی دیکەی ڕاڤەکردن بگرینە
ەر. شێوازێ، لەجیاتی ئەوەی پشت بە ئەزموونی بەردەوامی و یەککگرتوویی
سەرجەمی مێژوویەك ببەستێ، ئەوا گرنگی دەدات بە چالاکییە تایبەتیەکانی
ەر هونەرمەندێکی کورد. لێرەشەوە، ڕەنگە بتوانێت ئەو پرنسیپانە بەرهەم
بهێنێنتەوە کەدەشێت لەدوائەنجامدا وەك پرنسیپی مێژووییەکی هونەریی
سەربەخۆ تەماشایان بکەین.

بەواتەیەکی دیکە: ئەگەر ڕابردوویەکی مێژوویی سەربەخۆمان بۆ هونەری
شێوەکاری کوردیی لەبەردەستا نییە کە ڕەگوڕیشەکانی ئێستای ئەم هونەرەی
پێوە گرێ بدەینەوە، ئەگەر چەندین قۆناغ و ئاراستەو قوتابخانەی جیاوازی ئەم

هونەرەمان نیە تابەهۆیانەوە دیسیپلینەکانی مێژووەکەی دەستنیشانبکەین و ڕەوتی گەشەکردنی بەردەوامیی و گۆڕانکارییەکانی هەر قۆناغ و قوتابخانەیەکی هونەری ئاماژە پێبدەین، ئەوە مێژوویەکی ترمان هەیە کەدەکرێت لەڕاڤەکردندا پشتی پێببەستین. واتە مێژووی چالاکیە کۆنکرێتیەکانی هەر تاکە هونەرمەندێکی کورد. ئەمەش بەبێ ئەوەی بکەوینە داوی شێوازەکانی نویسنەوەی ژیانی هونەرمەندەکانەوە (بایۆگرافی). یاخود بەبێ ئەوەی لەڕاڤەکردندا ناچاربین خۆمان بخەینە ژێر زەبرەکانی مێژووی (گەورەوە) و سەرلەنوێ بواری هونەر بکەینەوە بەپاشکۆی سیاسەت. چونکە ئەمە کارێکە دواجار کارکرد (فۆنکشن)ی هونەر لەوەدا کۆدەکاتەوە کە لەژێر زەبروزەنگی گوتاری سیاسیدا هەستێ بە ڕێکخستن (مۆبیلیزەکردن)ی جەماوەر و بەگوتەی والتەر بنیامین، لەم ڕێگەیەشەوە: (***ئیستاتیزەی سیاسەت بکا***) (3)
کەواتە دەمەوێت بەکورتی چوارچێوەی میتۆدی و بەرەوپێشچوونی باسەکەم لەسەر ئەو پرنسیپەوە دابڕێژم کە ڕێگەم پێدەدات وەك جیهانێکی سەربەخۆ مامەڵە لەگەڵ بەرهەمی هونەریدا بکەم، نەك وەك پاشکۆی مێژوویەکی گەورەتر. چونکە ئەگەر بمانەوێت مێژوویەکی سەربەخۆ بۆ هونەری شێوەکاری کوردی بهێنینە بەرهەم، هیچ ڕێگایەك لەبەردەستا نیە بێجگە لەدووبارە بیرکردنەوە لەو هەل و فرسەتانەی کە تاکە هونەرمەندەکان لەڕەوتی ئیشکردندا بۆ فراوانکردنی ئەزموونە ئیستاتیکییەکانیان، داویانە. ئەگەر لێرەش بەدواوە ئەم باسە تەرخاندەکەم بۆ پرۆژە تازەکەی ڕێبوار سەعید، نەك بۆ دەستنیشانکردنی مێژووییانەی شوێنی ئەم هونەرمەندە لەسەرجەم ڕەوتی شێوەکاری کوردیدا، ڕێك لەبەر ئەوەیە کەئەو تێگەیشتنەی سەرەوەم لەسەر گەشەکردنی هونەری شێوەکاری کوردی هەیە. تێگەیشتنێك کە ناچارم دەکات، لەوگوتارانەی وردبیمەوە کە ئێستا بەرهەمیان دەهێنێ، نەك لە بەردەوامیی گوتارە مێژووییەکەی لە ئێستادا. پرسیاری من ئەوە نییە هونەر لەبەرامبەر واقیعدا چی دەڵێت، چ شتێکمان لەسەر مێژووی میللەتێك بۆ ئاشکرا دەکات، چۆن تێکەڵ دەبێت بەتێگەیشتنەکانی دیکەمان لەسەر خۆمان و جیهان؟ بەڵکو پرسیاری من

ئەوەیە *هونەر خۆی وەك دنیایەكی ئازاد چ ئەڵتەرناتیڤێك دەخاتە ڕوو*.. یاخود ئاسۆی چ دنیایەكی دیكەمان لەبەردەمدا ئاوەڵا دەكات؟
لێرەش بەدواوە هەوڵدەدەم لەچەند ڕەهەندێكی پرۆژەی (*وشەو ڕەنگ*)بدوێم و ئەو خەسڵەتە ئیستاتیكی و كێشە فیكرییانە بەرجەستە بكەم كەئەم پرۆژەیە وەك (نمونەیەك لە هونەری تاراوگە)، لەگەڵ خۆی هێناونی. ئەمەش بەو مەبەستەی بتوانم هەندێ لەو دەلالەتانە ئاشكرا بكەم كە بوونەتە هاندەری من لەداڕشتنی ناونیشانی باسەكەمدا. واتە ئاماژەكردن بەو خاڵانەی كە ئەم پرۆژەیە وەك (بانگهێشتنێكی هونەری) بەرجەستە دەكەن. لێرەشدا بەسوود وەرگرتن لە سۆزان سۆنتاگ، نامەوێت ئامانجی خۆم لەبەشێكی زۆری ئەم نووسینە بەوە پێناسە بكەم، كە نیازمە (زۆرترین ناوەڕۆك) لەبەرهەمەكاندا بدۆزمەوە. بەڵكو پتر هەوڵدەدەم هەستەكانم ئازاد بكەم و فراوانترین پانتایی ببینم و دیققەت لە هێما وردەكان بدەم و گوێ لەڕازەكانیان بگرم.. ڕەنگە گرنگیی هەر ئاخاوتنێكی ڕەخنەیی لەسەر بەرهەمی هونەری لەوەدا بێت كەبتوانێ لەڕێگەی ئاشناكردنی بەرهەمەكەوە، وەك ئەوەی كەهەیە، جۆرێ لەئاشنایەتیش لەگەڵ خۆیدا بهێنێتە دی. بەگوتەی سۆنتاگ پێویستە ئەركی ڕەخنەگر ئەوەبێ كە: (پیشانی بدات ئەو شتەی هەیە، چۆن هەیە. یان بەشێوەیەكی ڕاشكاوتر: پیشانی بدات ئەوەی كە لەبەرهەمی هونەریدا هەیە چییە، نەك مانای چییە) (4)

## 1 . شكاندنی سنوورەكان:

پرۆژەی (وشەو ڕەنگ) بەپلەی یەكەم و لەئاستی سەرەتایی خۆیدا، دەكرێت بەپرۆژەی شكاندنی سنوورە جۆربەجۆرەكان ناوببرێ. هەروەها هەوڵدانێكە بۆ بەرفراوانكردنی ڕووبەری بەرهەمی هونەری، لە ڕووبەرێكی (تایبەت بە هونەرمەند)ەوە، بۆ ڕووبەرێكی(هاوبەش)، كەزۆرترین ژمارەی بەشداربووان بگرێتە خۆی. ئەمەش بەبێ ئەوەی ئەو ڕووبەرە هاوبەشە ببێتە هۆی كوشتنی جیاوازی و تایبەتمەندی و سەربەخۆیی بەشداربووەكان.

گرنگترین خاڵ ئەوەیە کە ڕێبوار سەعید لەم پرۆژەیەدا دەسەڵاتی تەواوکردنی بەرهەم و بڕیاری کۆتایهێنان بە تابلۆی لەخۆی سەندۆتەوە. بەرهەمی هونەری لەم پرۆژەیەدا وەك ڕووبەرێکی کراوە دەچێتە بەردەم زیاتر لەچەند کەسێك و هەرکەسێکیش بۆی هەیە وەك (مسۆدەیەك و بەوجۆرەی خۆی دەیەوێت)، ڕووبەری بەرهەمەکە بەکار بهێنێت، کە ئەمەش یەکێکە لەو ڕوونکردنەوانەی ڕێبوار لەنامەکەیدا، بەچەند زمان ئاراستەی بەشداربووەکانی کردووە(٥). هەروەها ناوو ئیمزاش بەهیچکامێ لەکارەکانەوە نییە و تەنیا نیشانەیەك بۆ هەبوونی خاوەنێك بۆ بەرهەمەکان، ئەو ناونیشانەیەیە کە بەمۆری دەستکرد، لەگەڵ ژمارەی هەر کارێکدا، لەدیوی پشتەوەی دراوە.





ئەم مامەڵەکردنە لەگەڵ بەرهەمی هونەری، وەك ڕووبەرێك کەپێشتر تەنیا هونەرمەند خۆی ئازادبووە لەئیشکردن تیایدا و لێرەشەوە بەرزکردنەوەی ئاستی هونەرمەند بووە بۆ ئاستی خاوەندارێکی ڕەهای کارە هونەرییەکان، لەم پرۆژەیەدا بەتەواوی پشتگوێ خراوە. بەرهەمی هونەری کراوەتە پانتاییەکی هاوبەش بۆ لەخۆگرتنی زیاد لەیەك سەلیقەو زیاد لەیەك ئەزموونی ئیستاتیکی، بەبێ ئەوەی مەرجی ڕێبوار بۆ بەشداربووەکانی دی ئەوە بێت کە لەسەر خودی ئیشەکان بنووسن. ئەمە جگەلەوەی مافی هەڵبژاردنی کارەکان لەپێشەوە دەستنیشان نەکراوەو هەر بەشداربوویەك بەشێوەیەکی گشتی زیاد لەسێ ئیشی

بۆ هەڵبژاردن لەبەردەستابووە. خاڵێکی گرنگی دیکە ئەوەیە کە لەدابەشکردنی ئیشەکاندا هەوڵدراوە زۆرترین سنوورەکان تێکبشکێنرێن. واتە هیچ سنوورێکی جوگرافی و سیاسی (قاڕڕە، وڵات، شار، مەڵبەند)، سنوورەکانی زمان و کەلتوور: (خۆرهەڵاتی/خۆرئاوایی)، سنووری بارودۆخی کۆمەڵایەتی: (دنیای دەوڵەمەند/دنیای هەژار)، سنووری ئایینی: (مەسیحی/ئیسلام/بودایی)، سنووری جنسی: (نێر/مێ)، سنووری پیشەیی: (پرۆفێشناڵ/ئاماتۆر) و سنووری نێوان جۆرە ئەدەبییەکان: (شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، بیرەوەری) نەبوونەتە مەرج لە دابەشکردنی بەرهەمەکاندا.

بەم پێیەش بەرهەمی هونەری لەم پرۆژەیەدا دەبێتە ڕووبەرێکی دیموکراتی و ئازاد بۆ پراکتیزەکردنی ئەزموونە ئیستاتیکییە جیاوازەکان. واتە ئەگەر هێڵ و مۆتیڤ و ڕەنگەکانمان بەڕەگەزە سەرەکیەکانی هەر ئیشێکی هونەری دانا، ئەوە لەم پرۆژەیەدا ئەم سێ پێکهاتەیە لەچوارچێوە ڕەها، تەقلیدیە پیرۆزەکەی خۆیان ڕزگار دەکرێن و لەچوارچێوەیەکی ڕێژەییدا، دەبنە مسۆدەیەکی کراوە بۆ ڕزگارکردن و هێنانەدی ئەزموونە ئیستاتیکییەکانی دیکە. لێرەشەوە ڕووبەری تابلۆ دەبێتە مەیدانێکی هاوبەش بۆ ئامادەبوونی بەیەکسانی ئەزموونەکان، بەبێ جیاوازی و بەبێ ئەوەی ڕەنگ و هێڵ و مۆتیڤەکان وەك سنوورێکی بەڵگەنەویستی پیرۆز دەربکەون. بەمانایەکی تر دەتوانم بڵێم: نرخی ئیستاتیکی ڕەنگ و هێڵەکان بەسەر نرخی ئیستاتیکی ئەلف و بێی زمانەکان و دەست و خەتی تایبەتی نووسەرەکانیاندا، فەرز نەکراوە و دەستپێشخەری ڕێبوار لەپڕکردنەوەی بەشێکی ڕووبەری کارتۆنەکاندا، نەکراوەتە مەرجێك لەبەردەم بەشداربووەکانی تردا، تا بۆیان نەبێت لەهەمان بەشدا شوێندەستی خۆیان جێبهێڵن..

## 2 . دابەشکردنی ڕووبەر:

ئەگەر بۆ ساتەوەختێکیش جۆرێ لە بەسەنتەربوونی ڕەنگ و هێڵی فیگەرەکان هەست پێبکەین، ئەوە لەو کاتەدایە کەدەبینین ڕێبوار لەزۆربەی هەرەزۆری

ئیشەکاندا، ڕەنگ و مۆتیف و هێڵەکانی لەناوەڕاستی پارچە کارتۆنەکاندا نەخشاندووە. واتە هەر لەسەرەتاوە ڕووبەری کارتۆنەکەی دابەشکردووە بە دوو بەشەوە: بەشی ناوەڕاست و بەشەکانی هەرچوارلا. لەم حاڵەتەشدا دەکرێت بڵێین، ڕەنگ و هێڵ و مۆتیڤەکان بەسەر خۆیاندا بوونەتە سنوورێکی داخراو. واتە لەو شوێنەدا کە ڕەنگ و هێڵەکان لەسەر پانتاییە سپییەکە تەواو بوون، ئەوە لەهەمان شوێنیشدا بوونەتە سنوور لەدەوری خۆیان... ئەگەرچی داواکاری ڕێبوار لەبەشداربووەکان ئەوەیە کە (بەبێ سڵکردنەوە لەسەر ڕەنگ و هێڵ و مۆتیڤەکانیش بنووسن) کەئەمەش دژایەتیەك لەنێوان داواکارییەکەی بۆ بەمسۆدەکردنی تابلۆکان و لۆکاڵیزەکردنی شوێندەستی خۆی لەناوەڕاستی ئیشەکاندا، دەردەخات. بەڵام ئەم دژایەتیە لەبەر دوو هۆ کە لەخوارەوە ناویان دەهێنم، تەمەنێکی کورتی هەیەو نابێتە خاڵێکی نێگەتیف بەسەر بانگەشەکردنەکەی پێشوومەوە کە نووسیم: لەم پرۆژەیەدا پانتایی تابلۆ بەرزکراوەتەوە بۆ مەیدانی ئامادەبوونی یەکسان، هاوبەش، ڕێژەیی و کراوەی بەشداربووەکان.





یەکەم هۆی کاتی بوونی ئەو دژایەتیە ئەوەیە کەپێبەخشین و کردنی بەشی ناوەڕاستی کارتۆنەکان بەڕەگەزەکانی تابلۆ لەلایەن ڕێبوارەوە، هاوشانیشە بە بەخشین و بەکراوەیی جێهێشتنی بەشەکانی دەوروبەر، بۆ دەستوخەت و شێوەی خۆدەربڕینی بەشداربووەکانی دیکە. ئەمەش پێماندەڵێت کە

نیشتەجێبوونی هێڵ و مۆتیف و ڕەنگەکانی ڕێبوار لەناوەڕاستدا و ئەو سنوورەی بەدەوری خۆیاندا کێشاویانە، نیشتەجێبوون و سنوورێکی ڕێژەیی و کاتییە. ڕێژەییە چونکە ئەو سنوورە نەبۆتە دوا سنووری ئیشەکان و بەشی سپێتی ئیشەکان بۆخۆی نیشانە و بەڵگەی قەبوولکردنی سنوورێکی ترە کە سنووری (گشتی)ی ڕووبەری پارچە کارتۆنەکانە. واتە ئەوەی لەدواجاردا وەك چوارچێوەیەکی ڕەمزی دەردەکەوێت، بریتییە لەشێوەی دابەشبوونی تێکستە بەدەست نووسراوەکان. تێکستەکان نەك هەر شێوازێکی دیکەی پێکهێنانی تابلۆن بە نووسین، بەڵکو دەتوانم بەدەربڕینێکی میتافۆریانە بڵێم: دەشبنە ئامێرێکی تەلبەندئاسا بەدەوری ڕەنگ و هێڵ و مۆتیڤەکاندا و هەندێ لایەنی داخراوی پانتاییە ڕەنگییەکانیش بەهۆی شەبەکییەتی خۆیانەوە، دەکەنەوە. چونکە دواجار تێکستەکان چەندە چڕ بن و بەهەر ئەلف و بێیەك نووسرابن و دەست و خەتی نووسەرەکانیان چەندێ جیاواز بێت، هێشتا بەهۆی ڕەچاوکردنی ماوەی نێوان دێڕەکانەوە، شێوەیەکی شەبەکییان هەیە. لەوکاتەشدا کەئەم شێوە شەبەکییە دەچێتە سەر ئەو ڕووبەرە ڕەنگییانەی کەبەهۆی ئامادەیی یەك ڕەنگی زاڵەوە، سیمایەکی داخراویان وەرگرتووە، ئەوە ئەو ڕەنگە زاڵە لەژێر شەبەکیەتی ماوەی نێوان دێڕەکاندا، کراوەتر دەنوێنێ. وەك ئەوەی دێڕەکان توانیبێتیان پانتاییە ڕەنگییەکان لەتەنیایی و چۆڵەوانی سپێتی چواردەوریان ڕزگاربکەن و ببنە سنوورێکی پارێزەر و هێورکەرەوە. ببنە سەنگەرێ بۆ پارێزگاریکردنی جیهانی ناو تابلۆکان لەئاست هێرشەکانی دنیای دەرەوە. یاخود لەهەندێ دیمەندا، پانتایی نووسراو وەکو پردێ، یان دوورگەیەك خۆی دەنوێنێ، کەبیەوێت بەناو پانتاییە سپییەکەدا، ڕووبەرە ڕەنگییەکان ببەستێ بەدنیای دەرەوە (٦). بەم پێیەش، دێڕەکان لەگەڵ هەموو سەربەخۆییەکی خۆیاندا، بەتەواویش تێکەڵ بە حەرەمی ڕەنگەکان بوون و ئالەوێشدا جوتبوونێکی پڕ لەهارمۆنی پێکهاتووە. ئەم پێکهاتە دیدارییەش هەروەك چۆن لەچەند ئاستێکدا، دەلالەتی پێکەوەبوونی ئێرۆتیکیانەی وەرگرتووە(٧)، ئاواش کۆتایهاتنی (پرۆسەی دروستبوونی تابلۆکان)

بەئەنجامگەیشتنی (ئەڵقەیەکی ئاڵوگۆڕکردن)یش ڕادەگەیەنێ، کە پاشان لەسەر هەریەك لەم دوو لایەنە قسان دەکەم.

** ** **

هۆی دووەمی کاتی بوونی دژایەتییەکەو ڕێژەییبوونی سنووری ناوەڕاست ئەوەیە، کەئەو سنوورە هەر بەکەرەستە باوەکانی هونەری تابلۆکێشان دروستنەبووە. لەوێدا ڕێبوار جگە لەبەکارهێنانی (ئەکریلیك، ڕەنگی ئاوی، مەرەکەب و ڕەنگی سوورمەیی)، سوودێکی زۆریشی لەڕەنگ و مۆتیڤی زۆر پارچەکاغەزی وەك (کاغەزی چوکلێت، کاغەزی نەخشێنراوی بەرگتێگرتن، کاغەزی پێچانەوەی دیاریی، پوولی پۆست، کاغەزی تەنکی ڕەنگاوڕەنگ (تیشوو پەیپەر) و وێنەی لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارە ڕەنگاوڕەنگەکان وەرگرتووە. واتە شتە سادەکانی ناو ژیانی ڕۆژانەی لەکۆنتێکستەکەی خۆیانەوە گواستوونەتەوە بۆناو ئیشەکانی خۆی، سەرلەنوێ کاری لەسەر کردوون و مانایەکی جیاوازتری لەو مانایە پێبەخشیون کەخۆیان لەبنەڕەتدا هەیانبووە.

ئەم گواستنەوەو سەرلەنوێ جێکردنەوەیەی شتەکانیش بەسەرجەمی تایبەتمەندییەکانی خۆیانەوە، خۆی لەخۆیدا وەك دژایەتیکردنێکی ئەو سنوورە دەردەکەوێت کەدەشێێت کەرەستە تەقلیدییەکانی هونەری وێنەکێشان، پێکی بهێنن و خۆیان وەك تاکە ماددەی پێکهێنەری تابلۆ بسەپێنن.. کردنی شتە سادەکانی ڕۆژانە بەڕەگەزی پێکهێنەری تابلۆ، لەهەمان کاتدا گواستنەوەی ئەو جیاوازی و هەمەڕەنگییەیە کەئەو شتانە لەواقیعدا هەڵگریانن، بۆناو جیهانی ئیشەکان. ئەمەش نەك هەر بۆتە هۆی ئەوەی پانتایی ڕەنگیی ئیشەکان بەزۆرترین جیاوازی پڕبکرێتەوە، بەڵکو ئەم جیاوزییەش وەك دژایەتیکردنێکی پێکهاتە تەقلیدییەکانی تابلۆ دەردەکەوێت.

ڕەنگە ئێستا بتوانین بڵێین، ستراتیژی بەرهەمهێنان لەم پرۆژەیەدا، لەسەر تێکشکاندنی ئەو سەنتەرەوە دروستبووە، کە لەنەریتی دروستکردنی تابلۆدا تەنیا جێگەی شوێندەستی تاکە هونەرمەندی تیا ئەبێتەوە و ئەمەش

بەنووسینی ناو و ئیمزای هونەرمەند و مێژووی دروستکردنی تابلۆکە لەگۆشەیەکەدا، بەرجەستەکراوەو نوێنراوە. ڕێبوار لەم پرۆژەیەدا ئەم تەقلیدە تێکدەشکێنێ و ڕۆڵی دەسەلاتی خۆی و زمانی دەربڕینی هونەری خۆی وەك تاقە بڕیاردەر لەسازدانی جیهانی بەرهەمدا، مینیمالیزە دەکات. ڕاستە دواجار ئەم پرۆژەیە بەناوی ڕێبوار خۆیەوە ڕادەگەیەنرێت و لەسەر کەتەلۆگی پیشانگاکە ناوی ئەو وەك دەستپێشخەر و ڕێکخەر دەنووسرێ، بەلام کاتێ بینەر پێدەنێتە شوێنی پیشانگاکەوە، بۆی دەردەکەوێت کە زۆر وزەی تریش لەسازدانی جیهانی ئەم پرۆژەیەدا بەشداربوون و ئەوەتا ئێستاش پیشانگاکە بۆتە مەیدانی بەشداربوونی ئەویش وەك بینەر..

ناوبردنی ئەم ئیشانە بە (تابلۆ)، هەمیشە هاوشانە بەو پرسیارەی کەداوامان لێدەکات قەبارەی *تابلۆ* دەستنیشان و پێناسە بکەین. لەبەر نەبوونی وەلامێکی کۆنکرێتیشە بۆ ئەم داواکارییە، کە من حەزدەکەم بەگشتی ئیشەکان بە ***بەرهەمی هونەری*** ناو ببەم. چونکە بەڕاستی ئەم بەرهەمانە لەو قەبارەیەدا نەخراونەتە ڕوو کەئێمە تائێستا بە قەبارەی تابلۆ دەیناسین.. وێنەی ئێمە بۆ تابلۆ لەسەر قەبارەی ئەو بەرهەمانەوە دروستبووە کە بەدیواری مۆزەخانە گەورەکانی وەك لۆڤەری پاریس، لوسیانای کۆپنهاگن و تەیت گالێری لەندەنەوە، هەلواسراون.. هەموو جارێکیش کە سەردانی ئەو شوێنانە دەکەین، بەو چاوەڕوانییەوە دەچین، تابلۆ لەو قەبارەیەدا ببینین کە تائێستا وەك قەبارەی تابلۆ لەزەینماندا چەسپاوە.

بەلام ئەوەی پەیوەندی بەقەبارەی گشتی ئەم ئیشانەوە هەبێت، دەکرێ لەسەر دوو ئاست دابەش بکرێن: یەکەمیان ناودەنێم (ڕووبەری گشتی) و مەبەستیشم لەسەرجەمی ڕووبەری کارتۆنەکانە کە تێکڕا ئەندازەی (١٥ x ٢٠)سم یان هەیەو ڕەنگە بتوانین بەقەبارەی (پۆستکارت) لەقەلەمیان بدەین، کە دواتر ڕوونی دەکەمەوە بەچ مانایەك ئەم ئاماژەیە دەکەم. دووەمیشیان بە(ڕووبەری ڕەنگی)ناو دەبەم و مەبەستیشم تەنیا لەو بەشەیە کە بەتایبەتی ڕێبوار ئیشی تیاکردوون و بەڕەنگ و فیگەرە کۆلاژیەکان پڕیکردوونەتەوە..

### 3. ڕووبەری ڕەنگی و مینیاتۆریزەکردن:

ئەوەی پەیوەندی بەو بەشەی ئەم ئیشانەوە هەبێت کە بەتایبەتی ڕێبوار کاری تیاکردوون، ئەوە دەبینین ویستویەتی بەشی هەرەزۆری کارەکانی ***میناتوریزە*** بکات. ئەم زاراوەیەش تەنیا لەپەیوەندی لەگەڵ قەبارەی ئیشەکاندا بەکارناهێنم، بەڵکو دەشمەوێت یارمەتیم بدات لەخوێندنەوەی هەندێ شێوازی ئیشکردنەکەشدا. ڕێبوار هەوڵیداوە لەزۆربەی ئەم ئیشانەدا، بە بەراوورد لەگەڵ ئەو بەشە سپییەدا کەبۆ ئەوانیتری جێهێشتووە، کەمترین ڕووبەری ڕەنگیی لەسەر کارتۆنەکان داگیر بکات. ئەمەشمان کاتێ بەباشی بۆ دەردەکەوێت کە بۆ ساتێك ڕووبەرە ڕەنگییەکان لەناوەڕاستەوە بگوێزینەوە بۆ یەکێك لەگۆشەکان و ئەمجا دیققەت لەفراوانیی پانتاییە سپییەکە بدەین، تابچووکی ڕووبەرە ڕەنگیەکانمان بۆ دەرکەوێت. پرسیار ئەوەیە: ئایا دەشێت پرۆسەی میناتوریزەکردن، جگە لەستایلێکی هونەری و شێوەزمانێکی دەربڕین لەکاری هونەردا، هیچ ھاندەرێکی دیکەی لەپشتەوە بێت؟ بەتایبەتی ئەگەر زانیمان هونەرمەندەکەمان تاراوگەکراوێکەو خۆی بەئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم شوێنگەیەدا دەکات(٨)

مرۆڤ بەپێی سرووشتی خۆی، ناتوانێت لە ڕووبەری بەربڵاودا توانای زەینیی خۆی کۆبکاتەوە: مێژووی ئەدەب پڕیەتی لەو نووسەر و شاعیرانەی لە فەزای کراوەو بەربڵاو هەراسان بوون و شاکارەکانی خۆیان لەفەزایەکی میناتۆریدا هێناونەتە بەرهەم. زۆرن ئەو ڕەفتارە کۆمەڵایەتی و جەستەییانەی مرۆڤ، کە تەنیا لەخەڵوەت و لەناو چواردیواری تاریکیدا چێژ بەخشن (لەوانەش تێکەڵبوونی ئیرۆتیکی).. زۆرجار لەقسەکردنیشدا جەستەی خۆمان دەچوێنین بە دیوارێك کاتێ لەدرکاندنی نهێنییەکدا بەیەکتر ئەڵێین: (لەنێوانی خۆماندا دەرنەچێت)! لەڕاستیدا، لەئەفسانە و مێژووشدا فەزای بەربڵاو، گۆڕەپانە بەرفراوانەکان، دەشتەپان و بەرینەکان و ئۆقیانووسە بێ کەنارەکان، هەمیشە جۆرێ لەترس و گومانیان خستۆتە دڵی مرۆڤەوە.. وەك ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ هەموو هەوڵدانێکیا بۆ شکاندن و ڕووخاندنی دیوارەکان، هێشتا لەناخەوە

پێویستی بە جۆرێ لەدیوار هەبوویێت، تابتوانێت لەچوارچێوەی سنوورەکانیدا خۆی بێت و لەگەڵ خۆیدا و جیهانە تایبەتیەکەی خۆیا بژی.. کەئەمەش وەك خواستی گەڕانەوەیەك وایە بۆناو ئامێزی ئەشکەوتە دێرینەکانی باووباپیرانمان! تەنانەت دوای مردنیش مرۆڤی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە دیوارەکانی قەبرێك و سنوورەکانی تابووتێ، ئامێزی بۆ بکەنەوە.

دوای ئەم سەرەتا کورتە، با مانای ئەم دیاردەیە لەپەیوەندی لەگەڵ ژیانی مرۆڤی تاراوگەکراودا پتر ڕوونبکەینەوە و ئەمجا هەوڵدەین ئەمە ببەستینەوە بەپرۆسەی میناتۆریزەکردنەوە بەوجۆرەی لەپڕۆژەی (وشەو ڕەنگ)دا هاتۆتە ئەنجام.

ڕەنگە یەکێك لەدەلالەتەکانی پرۆسەی بەمیناتۆریزەکردن و گرنگیدان بە شتەبچووکەکان و بچووککردنەوەی قەبارەی واقیعیی شتەکان، خەسڵەتێکی ژیانی هەر گەڕیدە، کۆچەر و تاراوگەکراوێك بێت. دەبێت شتەکان لەشوێندا هێندە کەم جێگر و لە قوورساییدا هێندە ئاسان هەڵگربن، کەبتوانرێت بەئاسانیش لەجێگایەکەوە بگوازرێنەوە بۆ جێگایەکی تر. لە لێکۆڵینەوەیەکی ناسك و غەمگینانەیدا لەسەر واڵتەر بنیامین، ڕەخنەگری ئەمەریکی سۆزان سۆنتاگ دەنووسێ: (***بەمیناتۆریزەکردن وەك ئەوەیە شتەکان ئامادەکەین بۆ گواستنەوە ـ ئەمەش ئایدیاڵترین جۆری بەخاوەنبوونی شتەکانە لەلایەن گەڕیدە وکۆچەرەکانەوە***) (٩)

لێکدانەوەکەی سۆنتاگ ڕاستەوخۆ بۆتێگەیشتن لەژیانی تاراوگەکراو دەست نادات، ئەمەش نەك لەبەرئەوەی لەڕیزی گەڕیدە و کۆچەرەکاندا، ناوی تاراوگەکراوی نەهێناوە.. بەڵکو لەبەرئەوەی ئەمەی دواییان هەرگیز نابێتە(خاوەن)ی شتەکان. چونکە لەژیانی تاراوگەکراودا نیشتەجێبوونی هەمیشەیی مانای نییە و لێرەشەوە هەموو ئەو شتانەی کۆیاندەکاتەوەو دەبێتە خاوەنیان، دواجار دەبنە خۆراکی ساتی پردەردی (بەجێهێشتن) و ماڵئاوایی... گەڕیدەو کۆچەرەکان جگە لەوەی ئازادانە ڕێگای سەفەر هەڵدەبژێرن و تێشووی پێویست لەگەڵ خۆیان دەبەن، ئەوە هەمیشە شوێنێکیشان هەیە بۆی

بگەڕێنەوەو ئەوشتانەش لەگەڵ خۆیان ببەنەوە کە کۆیانکردوونەتەوە. لەکاتێکدا تاراوگەکراو، وێرانەماڵێکە ناچار بەچاوەڕێکردنێکی بێ بڕانەوە کراوە و لەساتەوەختی کۆچێکی تریشدا ئەبێ بەدەستی بەتاڵ ملی ڕێگا بگرێت..
بۆیە دەشێت مەسەلەی خاوەندارێتی گەڕیدەو کۆچەرەکان بۆ شتەبچووکەکان، لەراڤەکردنەکەی سۆنتاگدا زۆر سەرنجمان ڕانەکێشێت، بەڵام لەوەدا کەچەند دێڕێ پاشتر دەنووسێ: (***خۆشەویستی بۆ شتە بچووکەکان، هەستێکە منداڵ باش دەیناسێت***)، بەرەو تێڕامانێکی جیاواز بانگمان دەدات.
ئەوەی کە تاراوگەکراو بەرەو کۆکردنەوەی شتەبچووکەکان و بەرەو دەربڕینە کورتە برووسکەئاساکان هاندەدات، (وەك لەیەکێك لەکۆمەڵە شیعرییەکانی شاعیری تاراوگەکراو، ئەدۆنیسدا دەیبینین)(١٠)، ڕۆحی منداڵانەو هەرگیز گەورەنەبوویەتی، کەلەهەمان کاتیشدا سەرچاوەی بەرگریکردن و بەردەوامبوونیەتی. لێرەشەوە ڕەنگە بتوانین باس لەگرنگیی فەزای شوێن بکەین و ئەمەش ببەستین بەژیانی مرۆڤی تاراوگەکراوەوە کە بوویەکی بێئەندازە هەستیارە بەرامبەر بەشوێن و ڕووبەرەکان..
ڕاستە تاراوگەکراوێك لەشارێکی وەك ستۆکهۆڵم، پاریس، لەندەن، کۆپنهاگن، ئەمستەردام و بەرلین دا، هەموو ڕووبەری گەورەی ئەو شارانەی بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی لەبەردەستایە. بەڵام ئەوەی لەدواجارا ئەو تیایدا ئارامدەگرێت و هەست بەئازادی جەستەیی خۆی دەکات، ڕووبەری گشتیی و گەورەیی ئەو شارانە نییە. بەڵکو ئەو چایخانەو باڕ و قاوەخانەو چێشتخانەو ئەنجوومەن و بەکورتی ڕووبەری ئەو (جیهانە بچووکانە)یە کەوەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ دەربازبوون لەفەزای خنکێنەری شارەگەورەکان ئامادەی کردوون و بۆ تاوێ ڕێگە بەڕۆحە منداڵانەکەی دەدەن تیایدا ئازاد و ئاسوودە بێت. وەك ئەوەی ڕووبەری شوێنەگەورەکان، شتەگەورەکان و قەڵەباڵغی دەوروبەریان، لەبەرامبەر ڕۆحی منالانەی تاراوگەکراودا وەك هەڕەشەیەك خۆیان بنوێنن. هەڕەشەیەك کەناهێڵێت ئەم لەگەڵ شت و جیهانە میناتۆرییەکەی خۆیدا بەردەوامبێت لەیاریکردن، واتە لەفەنتازیا و خەون بینیندا..

بەمیناتۆریزەکردن، لەپرۆژەی (وشەو ڕەنگ)دا، نەك هەر لەهەڵبژاردن و بەکارهێنانی ڕەنگی میناتۆریدا (شینی ئاسمانی و قاوەیی کاڵ، سەوزی گومبەدی و فەیرووزەیی)و پاشان لەبیرۆکەی تێکەڵکردنی فیگەر و خەت دا، دەبینرێتەوە، کە لەکولتووری دیداریی ( Visual ) هەموو شارستانیەتەکانی بەشەرییەتدا تێکەڵکردنێکی ناسراوە. ڕەنگە لەکولتوورەکانی خۆرهەڵات و ئیسلامیشدا، میناتۆری ئێرانی (کەچواردەوریان بەنوسینەوەی داستانەکانی فیردەوسی و شیعری شاعیرە سۆفییەکان ڕازاوەتەوە)، هەروەها ڕازاندنەوەی دەسنووسەکانی قورئان، زەخرەفەکردن و ڕازاندنەوەی سیرامیکی دیوار و گومبەدی مزگەوتەکان بەئایەت و ناوەکانی خوا، ڕازاندنەوەی کتێبە کۆنەکانی وەك مەقاماتی حەریری و کتێبی (عجائب المخلوقات)ی قەزوێنی، لەدیارترین نموونەکانی بن..(١١) بەڵکو لەم ئیشانەدا، جگە لەو لایەنانەی ناوم بردن، ڕێبوار لەسەر ئاستی بەکارهێنانی هێڵە ئەبستراکتەکانیش بەیەکداچوونێکی ( Intertexstuell ) بەرچاوی لەگەڵ شێوازە میناتۆرییەکاندا دروستکردووە. ئەمەشمان لەبەکارهێنانی (هێڵی چەماوە، بازنەیی، شێوەی چوارگۆشەیی، حەلەزوونی و فیگەرە هیلالیەکان)دا بۆ دەردەکەوێت. ئەمە جگە لەوەی لەکاتی ڕەمزاندن و نەخشاندن و پڕکردنەوەی بۆشاییەکانەدا بەهۆی دانانی (پەڵەڕەنگ، ڕیزەخاڵ و گوڵ و ئەستێرەی ورد)ـەوە، هەمان بەیەکداچوون هەستپێدەکەین(١٢)

میناتۆریزەکردن نەك بەتاڵکردنەوەی مانا نییە لەشتەکان بەهۆی پرۆسەی بچووککردنەوەوە، بەڵکو خودی خەسڵەتی (بچووکبوون) دەکاتە تایبەتمەندیەکی گرنگیی شتەکان. چونکە هەموو شتێکی بچووك لەیەك کاتا هەم (گشتێك)ی سەربەخۆیە و هەم (بەشێك)ی دابڕیوویشە لە گشتێك.. ئەمەش ناوەڕۆکی بەسەرهاتی هەردوو بەشە پێکهێنەرەکەی ئەم پرۆژەیەیە. واتە ئەمە چارەنووسی هەریەك لەڕەگەزی (وشە و ڕەنگە) لەم پرۆژەیەدا، کە هەریەکەیان لە بنەمای خۆیان و ماڵی ڕاستەقینەی خۆیان دابڕیوون و لێرەشدا بەجووت گشتێك پێك دەهێننەوە. ڕەنگە ئەم پرۆژەیە پێش هەموو شتێك بەسەرهاتی

جودایی (وشه و ڕەنگ)مان بۆ بگێڕێتەوە، کەهەریەکەیان لەشوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا، جیهانێکی سەربەخۆ پێکدەهێنێت و کەچی وا لێرەدا بۆتە بەشێکی پچڕاو لەدنیایەکی گەورەتر. چونکە نە ڕووبەرە ڕەنگیەکانی ڕێبوار لەچوارچێوەی یاسا ڕەسمییەکانی نومایشدانی هونەریدا پێشکەشکراون، نە تێکستی بەشداربووەکانی دیکەش لەکەناڵی ڕاستەقینەی خۆیانەوە بەئێمە گەیشتوون. ئەگەرنا فۆرمی ئەوەی یەکەمیان دەبوو پیشانگایەکی ئاسایی هونەری بێت، لەکەرەستە تەقلیدیەکانی ڕەسمکردن پێکهاتبێت و لەهۆڵی گالێری و مۆزەخانەکاندا پێشکەش بکرێت. هەروەها دەبوو فۆرمی پێشکەشکردنی ئەوەی دووەمیشیان ناو چوارچێوەی کتێب و دیوانە شیعرییەکان بێت !

لێرەوە پرۆسەی بەمیناتۆریزەکردن، پرۆسەی دابەشکردنی ڕێژەییانەی شوێنە. هەمەڕەنگی بەخشینە بە فەزا و فرەڕەهەندکردنی ڕووبەرە تاکڕەهەندەکانە. دژی داگیرکردنی ڕووبەرە لەلایەن تاقە فیگەرەوەو دژی تەعبیرکردنە بەئیمکانیەتە ڕەهاکانی یەك جۆر زمان (لێرەدا زمانی هونەری وێنەکێشان). پانتایی میناتۆری، وێڕای بچکۆلەبوونە جەستەییەکەی، دڵێکی گەورەی هەیە کەجێگەی زیاد لەدەنگێك و زیاد لەڕازێکی تیا ئەبێتەوە. پرۆسەی جێگەکردنەوەیە بۆ پارچەو بەش و ئەندامە پەرتەوازەکان. پێبەخشینەوەی ماڵێکە بەئاوارەکان و جووتکردنەوەی تەنیا و پەڕاگەندەکانە لەسەرزەوی پێکەوەبوونێکی تر. بەبێ ئەوەی لەتایبەتمەندییەکانی خۆیان دابماڵێت و بەبێ ئەوەی فەردبوونیان بخاتە ژێر زەبرەکانی گرووپەکردنەوە. ئەم پرۆژەیە داواکارییەکە بۆئەوەی بە گوتەی ئادۆرنۆ، بۆ ساتەوەختێ لەناو ناخی خۆماندا تاراوگە ئەزموون بکەین و وەك ئاوارەیەك خەون بە ماڵێکەوە ببینین(١٢) چونکە تەنیا ئەوانەی ماڵیان نییە دەتوانن بیر لەدابەشکردنەوەی ڕێژەییانەی شوێن بکەنەوە بۆ کۆکردنەوەی (جیاوازیی)یەکان. ئایا هەرئەمەش نییە خەونی هەمووتاراوگەکراوێك؟! وەئایا هونەر ئەو تاقە جیهانە نییە کەڕێگەمان پێدەدات بەردەوام بین لەخەون بینیندا؟

## 4. پۆستکارت و سنوورەکانی لە ئاڵوگۆڕکردندا:

من لەپێشاندا قەبارەی ئیشەکانم دابەشکرد بەسەر دوو ڕووبەردا و یەکێکیانم ناونا ڕووبەری ڕەنگی و ئەویتریشیان ڕووبەری گشتی. هەر لەوێشدا نوسیم دەکرێت ئەمەی دواییان بەقەبارەی پۆستکارت ناوبەرین. مەبەستی من لەو ئاماژەکردنە، هێندەی ئەوەی کردنەوەی دەلاقەیەکە بۆ قسەکردن لەسەر سنوورەکانی کارکردی پۆستکارت و شکاندنی ئەو سنوورانە لەم پرۆژەیەدا، شتێکی دیکە نییە. واتە نامەوێت تێکەڵ بەگفتوگۆیەکی سەرقاڵکەر ببم لەسەر ئەندازە جیاوازەکانی پۆستکارت و قسەکردن لەسەر ئەوەی، ئایا پۆستکارت ڕەهەندی ئیستاتیکی هەیە، یان نە ، هێندەی گەرەکمە ئاماژەیەکی خێراو گشتی بەشێوەی بەکارهێنانە مێژووییەکەی بدەم وەك ئەوەی لە قۆناغی گەشەی پیشەسازی و ئابووریی مۆدێرینەکردنی کۆمەڵگای خۆرئاواییدا ڕوویدا. دیارە ئەمەش بەومەبەستەی لەدواجاردا بتوانم ئەم لێدوانە بخەمە خزمەت ڕەخنەیەکەوە لە بواری *ڕاگەیاندنی مۆدێرن* و پەیوەندی ئەم پرۆژەیەی ڕێبوار بەو ڕەخنەیەوە.






Heligoland: one of the earliest postcards designed in colour, 1889. In the collection of Rev. W. R. Saunders, England.

لەبنەمادا سەرهەڵدانی پۆستکارت لەلایەن سیستەمی پۆستخانەوە سەریهەڵداو کارکردەکەشی ئەوەبوو کە پەیامێکی خێراو برووسکەئاسا لە کەسێکەوە بگەیەنێتە کەسێکی دیکە. بەکارهێنانی یەکەمجاری پۆستکارت، وەك کەناڵێکی گەیاندنی پەیام، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم.

بەتایبەتیش کاتێ ڕێبوارەکان و سەربازەکان لەکەشتییەکان دادەبەزین و لەبەندەرەکانەوە هەواڵی خۆیان بۆ بنەماڵە و کەسوکاریان دەناردەوە(١٤).

بەڵام بەسەرهەڵدانی دیاردەی گەشت و گوزار و گەشەسەندنی پیشەسازیی تۆریزم، وەك یەکێ لەشێوازەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن بۆکەشفکردنی دنیاکانی تر، بەتایبەتیش دوای داهێنانی کامێرای وێنەگرتن، شێوەی بەکارهێنانی پۆستکارتیش گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هات. چیدی ئەم میدیایە هەر پەیامی نێرەری نەدەگەیاند، بەڵکو لەپاڵ ئەوەشدا لۆکالیزەی دیداریانەی ( *Visual* ) ئەو شوێنەشی دەکرد کەلێوەی نێردرابوو. نەك هەر شایەتێ بوو لەسەر سەلامەتی و بارودۆخی نێرەر، بەڵکو بووە ئامرازێکیش کەدەیتوانی بەهۆی دیمەنە چاپکراوەکەی سەری، بەشێ لەو ئەتمۆسفێرە پیشانی وەرگر بدات کەلێوەی نێردرا بوو. واتە لەپاڵ ئەوەدا کە خەبەرێکی دەگەیاند: (*من ئێستا گەیشتوومەتە بەندەری کۆپنهاگن*) کارکردێکی ڕاگەیاندنیشی (اعلامی)، جێبەجێ دەکرد: (*ئەمەش وێنەی ئەو شوێنەیە کە ئەم پۆستکارتەم لێوە ناردووە*)!.

ئەم کارکردەش پەیوەندییەکی توندی هەبوو بەپەرەسەندنی پرۆسەی بەموڵکایەتیکردنەوە. چونکە دەبوو ئەو شتەی هی ئێمەیە بکرێتە سەنەد و بەڵگە، لەمەشدا پرۆسەی بەوێنەکردن (Visualizing) یارمەتییەکی چاکی ئەدا. بۆنمونە: چیدی (درەختی بنەماڵە)بەس نەبوو بۆ پیشاندان و سەلماندنی پشت و تەباری خێزان، بەڵکو هەڵواسینی هیرارکیانەی وێنەکانیان بەدیواری ژووری دانیشتندا، وەك نەریتێکی چەسپاوی لێهات، کە نیسبەتی ئێمەی بەوێنەگیراوەکانەوە پیشاندەداو دواجاریش پەیدابوونی (ئەلبوومی خێزان) ڕووخسارێکی بەرجەستەتری بەم موڵکایەتیکردنە بەخشی. هەروەها چیدی بەس نەبوو بزانرێ چ کۆشك و هوتێل و باخێکمان هەیەو لەناو کامە دیمەنی سرووشتیدان، کام ڕووبار بەبەردەمیا دەڕوات و کام چیا لەپاڵیایەتی و هتد. بەڵکو دەبا هەموو ئەمانە ببینرێن و بکرێنە وێنەیەکی پۆستکارتی. سەرنجڕابکێشن و ببنە بەڵگە لەسەر ئەو بەهەشتەی کە چاوەڕێی ڕێبوار و

گەشتکەرەکانی دەکرد. جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەش بەو ڕۆڵە بدرێ کە پۆستکارت لەسەردەمی کۆلۆنیالیزمدا بۆ (فەنتازیاکردن)ی گرووپە کۆلۆنیکراوەکان گێڕای، بەتایبەتیش فەنتازیکردنی ئیرۆتیکیانەی جەستەی ئافرەتان. لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بەکارهێنانەی پۆستکارت، ئەوە پیشاندەدات کە پۆستکارت پانتاییەکی سەرەکی بووە بۆ وێناکردنی ئافرەتان وەك (ئەوی دی ئیرۆتیکی) لە خەیاڵی چینی باڵای کۆلۆنیالیستەکاندا. ئەمەش بەوەی وێنەکانی سەر پۆستکارت هەردەم ئافرەتانی (بۆنمونە جەزائیری) نیوەڕووت پیشان دەدان و لەم ڕێگەیەشەوە نیگای کۆلۆنیالیستی لەئاست جەستەی ژنانی کۆلۆنیکراودا برسی دەکرد. لێرەشەوە فەنتازیکردن تاقە ڕێگایەك بووە، چونکە نە یاسای (حەریم) ڕێگەی بە نزیکبوونەوە و نە مەبدەئی کۆلۆنیالیزم بە تێکەڵبوونی خوێنی ئەورووپی و کۆلۆنیکراوەکان ڕازی دەبوو(١٥)
دەکرێت لەم نمونانەوە ئەو ئەنجامگیرییە بهێنینە دەست کە پێماندەڵێت، پۆستکارتیش وەك هەر کەناڵێکی تری ڕاگەیاندن لەسەردەمی مۆدێرنیتەدا، تێکەڵ بەزنجیرەی تۆڕەکانی پرۆپاگەندە، سەپاندنی ئایدیۆلۆژیەکانی بازاڕ و مەسرەفکردن و هەروەها بەسرووشتیکردن(تـطـبـيـع)ی میکانیزمەکانی دەسەڵات و مۆنۆپۆڵەکردن بوو.



بێگومان دیاردەی دروستبوونی پۆستکارت لەناو کولتووری ئەورووپیدا، پەیوەندییەکی گرنگیشی هەیە بە خواستەکانی مۆدێرنیتەوە، کەیەکێك

لەئەنجامەکانی، خێرایی بەخشینە بەهەموو پەیوەندی و ئاڵوگۆڕەکان. نێرەری پۆستکارت، هەروەك ئێستا، دەبوو ڕاز و پەیامەکانی بەکورتی، چڕی و ڕوونیی دابڕێژێت و نەهێڵێت لەکاتی نوسیندا، خرۆشانە هەستییەکانی ناوەوەی جڵەوی لەدەست وەربگرن. لەم ڕوویشەوە، دەتوانین بڵێین: پۆستکارت بەهۆی بەرتەسکیی ڕووبەرەکەیەوە، *یەکەمین ئەو مەشقانەی لەبواری نووسیندا فێری مرۆڤ کرد کە ڕایدەهێنا لەسەر (خۆ دیسیپلینکردن)*. ڕەخنەو هەراسانبوونی ڕۆمانتیکەکانیش لەمۆدێرنیتە، ڕێك لەو سنووردارییەوە هاتبوو کەئەم دیاردەیە (واتە مۆدێرنیتە) بەسەر دەربڕینی هەستیارانە و خرۆشانە مەعنەویەکاندا دەیسەپاند. هەڵبەت پیشەسازی پۆستکارت لەگەشەی زیاتری خۆیدا، بەتەواوی لە نێرەر خۆش بووە لەوەی بنووسێت. چونکە ئێستا بۆ هەموو ئەو بۆنانەی پۆستکارت تیایاندا هۆی پەیوەندییە، پەیامەکە بەنووسراوی ئامادەیەو هێندە بەسە بیهاوینە سندووقی پۆستەوە(١٦)

پۆستکارت وەك میدیایەك و وەك بەشێك لەسیستەمێکی ئاڵوگۆڕکردنی پەیام لەنێوان مرۆڤەکاندا، بەدەست دوو عەیبی گەورەوە دەناڵێنێ: یەکەمیان ئەوەیە کەڕەوتی ئەو پەیوەندییەی دروستیدەکات، بەناتەواوی دەمێنێتەوە. واتە توانای نیە بۆنمونە وەك دەزگای تەلەفۆن و بێتەل لەدووسەرەوە پەیام بگەیەنێت و ئاڵوگۆڕێکی بازنەیی زیندوو دروستبکات. هەروەها بەرهەمێکی هونەریش نییە تا بتوانین لەبەر تیشکی هێڵکارییەکەی ڕۆمان یاکۆبسندا بیخوێنینەوە:

***زەمینە***

***نێرەر ـــــــ پەیام ـــــــ وەرگر***

***هێماکان***

***کەناڵ (١٧)***

چونکە کارکردی بەرهەمی هونەری لەم هێڵکارییەدا، گەیاندنی خەبەرێك نیە بەوەرگر، یان بەتەماشاکەر و خوێنەر. ئەگەر لەو هێڵکارییەدا هونەرمەندمان خستە جێگەی نێرەر و بینەرمان خستە شوێنی وەرگر، ئەوە هێشتا تابلۆ دانابەزێتە سەر ئاستی پەیامێکی (خەبەری)، کە لەلایەن هونەرمەندەوە ڕەوانەی بینەر کرابێت. بینەریش بەهەوڵدان بۆ ناسینی کەناڵ و ئاشنایی دروستکردن لەگەڵ زەمینەی پەیامەکەدا، بتوانێت هێماکانی بکاتەوە. پەیامی بەرهەمی هونەری، پەیامێك نیە لەنێوان نێرەر و وەرگردا تەنیا هەر پێویستی بەهێما زمانییە هاوبەشەکان بێت بۆ تێگەیشتنیان لەیەکتری. بەڵکو ئەزمونێکی ئیستاتیکی سەربەخۆیە کەدەشیێت بۆ کردنەوەی هێماکانی پێویست بە زیاد لەتێڕامانێك بکات و زیاد لەجارێکیش هەوڵدان بۆ کردنەوەی ڕاز و نهێنیەکانی.

ئەگەرچی، پۆستکارت هەر لەبنەماوە کارکردی خۆی وەکو میدیایەك بۆگەیاندنی هەواڵ و وەك هۆیەکی سازدانی پەیوەندیش خۆی دەناسێنێ، کە وەرگر بتوانێت لەزووترین کاتدا هێماکانی بکاتەوەو لەو زانیاریانە تێبگات کە نێرەر ناردوونی[18] ) بەلام توانای نییە ئەم پەیوەندییە بکاتە پەیوەندییەکی دوولایەنی و ببێتە زەمینەیەکی هاوبەش بۆ بەیەك گەیشتن لەیەك کاتدا. پۆستکارت دەنێردرێت بەڵام ناگەڕێنرێتەوە. پەیامەکەی ناچار بەگوێگرتنمان دەکات، بەلام گوێمان لێناگرێت. پێماندەڵێت نێرەر لەچ حاڵێکدایەو لەکوێوەو کەی پەیامی بۆناردووین، بەلام ناتوانێت هەواڵی ئێمەی وەرگر بگەیەنێتەوە بە نێرەر. هەربۆیەشە کاتێ لەخوێندنەوەی پەیامی پۆستکارتێك دەبینەوە، ئیتر دەبێتە بەشێ لەشتە زیادە و کەڵەکەبووەکانی ناو ژیانمان. یاخود ئەگەر نیگارەکەی سەری زۆر سەرنجمان ڕابکێشێت (واتە بکەوینە ژێر کاریگەریی لایەنە دیدارییەکەیەوە)و نێرەریش کەسێکی ئازیزمان بێت، ئەوە لەباشترین حاڵەتدا، بە لادیوارێکدا هەڵیدەواسین.

### ٥. ئۆرگینالّییەت لەنێوان (خەبەر) و (خۆدەربڕین)دا:
مادام پۆستکارت لەڕووی بەکارهێنانە مێژووییەکەیەوە، لە سیستەمێکی ئالّ و گۆڕی مۆدێرندا نیشتەجێ دەکرێت و، مادام سنووری نوسین تیایدا تەسك کراوەتەوەو ئەوەی لەسەری دەنووسرێت چوارچێوەیەکی خەبەری هەیە، ئەوە ناتوانێت ببێتە پانتاییەك بۆ خۆدەربڕین. لێرەشەوە عەیبی دووەمی پۆستکارت دەردەکەوێت. چونکە من چەمکی خۆدەربڕین لەپەیوەندی بە(ئۆرگینالّیەت)ـەوە بەکاردەهێنم. ئۆرگینالّیەتیش بەو پانتاییە پێناسەدەکەم، کە بوارمان دەداتێ شوێندەست و مۆرکی ناوەوەی کەسایەتی خۆمانی لەسەر جێبهێلّین. یاخود دەتوانم بلّێم: ئۆرگێنالّیەت لەخۆدەربڕپیندا بریتیە لەو پرۆسەیەی کەتیایدا دەتوانین بەشێوەیەکی ئازاد دەقێکی سەربەخۆ بخولّقێنین و تانەوپەڕی ئیمکان مۆرکی کەسایەتی و هەستیاریی ئیستاتیکیانە و فیکریی خودی خۆمانی، بەشێوەیەکی ئاگا، یان لەنائاگاییەوە پێوە شەتلّ بکەین.
با ئەمە لەڕێگەی چەند نموونەیەکەوە پتر ڕوونبکەمەوە:
کاتێ مێژوونووسەکانی فەلسەفە، ئەو بیروڕا سیاسیانەی لەناو کتێبی *کۆمار*دا هاتوون، دەکەنە پارسەنگ بۆ ساخکردنەوەی ئەو بیروڕایانەی لەو نامانەدا هاتوون کەبەناوی ئەفلاتوونەوە تۆمارکراون، ئەوە لەبەرئەوەیە کە بیروڕاو جیهانبینی سیاسی و ئیداریی ناو گفتوگۆی کۆمار، وەك ئۆرگینالّیەتی بیری ئەفلاتوون، تەماشا دەکەن. یاخود کاتێ لەناو مێژووی ئیسلامدا مشتومڕی زۆر لەسەر حەدیسەکانی پەیامبەر بەرپا دەبێت و شارەزایان دابەشیاندەکەن بەسەر (*احادیث الصحیحە و احادیث الغیر الصحیحە*)وە، ئەوە ڕێك لەبەر ئەوەیە کەبڕوایان وایە، هەندێ حەدیس هەن ئۆرگێنالّیەتی خۆدەربڕینی (محەمەدی)یان تیا نییەو هەرلەبەرئەوەش بەهەلّبەستراو و (کاذبە) ناویان دەبرێن.. یاخود کاتێ لەدەستوخەتی نامەو دەقەکانی نوسەرێکدا، هەستیاری و کاراکتەری نوسەری ئەودیو ڕۆمانەکانی وەك (*کۆشك، مەسخ و دادگاییکردن*) دەبینرێنەوە، ئەوە ڕێك سەروکارمان هەیە لەگەلّ ئۆرگینالّیەتی خۆدەربڕین و چۆنێتی شوێنپەنجە جێهێشتنی (کافکا) بەدەقی بەرهەمەکانییەوە. هەروەها

بەکارهێنانی چەمکی ساخکردنەوە لەکاتی ئیشکردندا لەسەر بۆنمونە: دەسنووسەکانی دیوانی نالی، جۆرێکە لەگەڕان و پەیجوویی بەدوای ئەو ئۆرگینالّییەتەدا کە ئێمە لەشیعرە ڕەسەنەکانی دیکەی نالییەوە پێی ئاشنابووین. ئەو ئاشنایەتیەش هەستیارییەکی هێندە ناسکی لەئاست زمانی دەربڕینی ئەو شاعیرە مەزنەدا لەلا دروستکردووین، کە قاییل نەبین هەموو جۆرە شیعرێ وەك شیعری نالی قەبووڵ بکەین.
کەواتە ئەگەر ئۆرگێنالّیەت مەرجی سەربەخۆبوونی دەق بێت، ئەوە هیچکاتێ لەسەر ڕووبەری پۆستکارت دەقێکی سەربەخۆ ناخولقێ. ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی سەرهەڵدانی دەقی سەربەخۆ دەبەستین بە درێژی و کورتییەکەیەوە. بەڵکو لەبەرئەوەی پۆستکارت هۆیەکی خەبەرگەیاندنەو خەبەریش وەك بنیامین گوتویە (*لە ئان و ساتا زیندووە*)(١٩)، هەر کە ڕاگەیەنرا، دەمرێ.. بەمانایەکی تر: پۆستکارت بوارمان نادات خۆمانی لەسەر *دەربڕین*، بەڵکو ناچارمان دەکات لەسەر خۆمان خەبەرێ *رابگەیەنین*. کەخۆمان دەردەبڕین، درێژبوونەوەیەك دەدەینە خۆمان لەناو تێکستدا کەدەشێت ئۆرگینالّیەتی ئێمەی تێدا ببینرێتەوە. بەڵام کاتێ لەسەر خۆمان خەبەرێ ڕادەگەیەنین، ئەوە (خۆمان) لەو خەبەرە(جیا)دەکەینەوە. فێلّی خەبەر ئەوەیە هەمیشە لەو شتە جیابۆتەوە و دابڕ بووە کەڕایدەگەیەنێ، لاوازییەکەیشی ئەوەیە هەمیشە پێویستی بەوەیە لەپێش خۆیدا ڕووداوێ ڕوو بدات، تا خۆی لێ جیابکاتەوەو ببێتە خەبەر لەسەر ئەوەی ڕوویداوە.. بەڵام خەبەر هەلگری جۆرێکیشە لەزەبروزەنگ، کەتوندڕەوترینیان ئەوانەن تەنیا یەکجار بەگوێمان دەگەن.. تەنیا یەکجار، چونکە چیدی ئەو ڕووداوەی ڕایدەگەیەنن دووبارە نابێتەوە:
*باوکت مرد*.
لەهەموو ژیاندا یەکجار ئەم خەبەرەمان پێدەگات، ئیتر دوای ئەوە بێدەنگییەکی ئەبەدی و حەسرەتی نەبڕاوەی ناو بیرەوەری..

**کارکردی ئاڵوگۆڕیانەی پرۆژەی (*وشە و ڕەنگ*):**

کاتێ لەتێگەیشتنمانەوە بۆ کارکرد(فۆنکشن)ی پۆستکارت دەڕوانینە کارکردی ئیشەکانی ئەم پرۆژەیەی ڕێبوار سەعید، ئەوە هەنگاویشمان ناوە بۆ قسەکردن لەسەر ئیشەکان وەك (میدیا و کەناڵێکی دەربڕینی پەیام)، کە لەناو سیستەمێکی ئاڵوگۆڕکردندا نیشتەجێ دەکرێت. ئەم ئاڵوگۆڕییەش بەپلەی یەکەم ئاڵوگۆڕێکە لەنێوان نێرەر کە(هونەرمەند)ـە و وەرگر کە(هەموو بەشداربووەکان)ی دیکەن، ڕوودەدات.. بەڵام کارکردی ئەم ئاڵوگۆڕکردنە بەپێچەوانەی ئەو ئاڵوگۆڕەی بەهۆی بۆنموونە (پۆستکارت)ـەوە دێتە دی، کارکردێکی جیاوازە. لێرەش بەدواوە هەوڵدەدەم لەدوو خاڵدا لەو جیاوازییە بدوێم. هەڵبەت ئەمەش هەربەو مەبەستە نا، کەسنوورەکانی ئاڵوگۆڕکردنی پۆستکارتی (وەك میدیایەك لەکۆمەڵگای هاوچەرخدا)، پیشانبدەم. بەڵکو بەو نیازەش پیشانی بدەم هونەری تاراوگە بوارێکی دەوڵەمەندتری ئاڵوگۆڕپێکردنی ڕازوخواستەکانمان لەگەڵ یەکتردا دەخاتە بەردەست و زەمینەی پێکەوەبوونێکی ڕاستەقینەترمان بۆ دەڕەخسێنێ لەچاو ئەو زەمینەیەدا کە بوارەکانی ڕاگەیاندن ئیدیعای ڕەخساندنی دەکەن.. نیازیش بەم پێکەوەبوونە ڕاستەقینەیە لەکۆمەڵگایەکدا کەئایدیۆلۆژیەتی زاڵ بەردەوام تیایدا ئیدیعایەی (بەگوندبوونی جیهان)و پرۆسەی (بەجیهانیکردن) بەهۆی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دەکات، چەندین جار زیاترە. ئەمەش نەك لەبەرئەوەی لەو ئیدیعایەدا چەمکی (جیهان) بەوردی پێناسە نەکراوە و هێشتا دەکرێ بپرسین: جیهانی کێ و کام گرووپ؟، بەڵکو لەم جیهانە پێناسەنەکراوەشدا سیستەمەکانی چاودێریکردن و لێپرسینەوە هەموو پێکەوەبوونێکیشیان هەڵگێڕاوەتەوە بۆ حاڵەتی (کۆنترۆڵی مرۆڤەکان بەسەر یەکترییەوە)..

ئێستاش بۆ ئەوەی خەسڵەتە ئاڵ و گۆڕییەکان (*Communicativ*) ی ئەم پرۆژەیە (وەك نموونەیەك بۆ هونەری تاراوگە)، ڕوونبکەمەوە، دەبێت بپرسم: ***ئەو خاڵانە کامانەن کەئەم پرۆژەیە هەڵگریانەو وەك میدیایەك جیای دەکەنەوە لەشێوەی ئاڵوگۆڕکردن بەهۆی میدیاکانی ترەوە؟***

یەکەم خاڵی جیابوونەوەش ئەوەیە بگوترێ، ئەو ئاڵوگۆڕەی ئەم پرۆژەیە پێکیدەهێنێ، ئاڵوگۆڕێکی یەکلایی نییە و لەپرۆسەی پەرەسەندن و شێوازگرتنی خۆیدا، ڕەوتێکی بازنەیی پێکهێناوە. ئەم ڕەوتە بازنەییەش ئیمکانی داوەتە هەریەك لە نێرەر و وەرگرەکان تا لەیەك چوارچێوەدا نەمێننەوەو هەردوولا ئاکتیڤ بن، واتە نێرەر توانای هەبێ ببێتە وەرگر و وەرگریش بتوانێت لە ڕۆڵی نێرەردا چالاك بێ.. ئەم ڕەوتە بازنەییەش جگە لەوەی دەوڵەمەندییەك دەداتە (ڕێژەییبوونی مانا) لەسەرجەمی پرۆژەکەدا، ئاواش مافی یەکسان دەداتە هەردوولای بەشدار بوو تا شوێنگەی خۆیان لەگەڵ یەکدا بگۆڕنەوە. گرنگیی ئەم ڕەوتە هەر لەوەدا نییە کە ڕێبوار ئیشە ئۆرگێناڵەکانی خۆی دەنێرێتە لای وەرگرەکان و بەمەش لەڕووی ئەخلاقییەوە بەرپرسیاریان دەکات لە ناردنەوەیان، بەڵکو گرنگییەکە بۆ ئێمە لەخودی ئەو گۆڕانەشدایە کەلەو گواستنەوەیەدا بەسەر ئیشەکاندا دێت و لەهەمان کاتیشدا ڕۆڵی وەرگرەکان دەکات بە نێرەر.

ئەگەر بمەوێ ڕوونتر بدوێم ئەوە پێویستە بڵێم: پەیامێکمان هەیە لەنێرەری یەکەمەوە دەچێتە بەردەستی وەرگرەکان، ئەم پەیامەش لەناو سیستەمی نیشانەناسی دیداریدا نیشتەجێ دەکرێت. بەڵام ئەوەی دەگەڕێتەوە لای نێرەر هەمان پەیام نییە. بەڵکو پەیامێکی تەواو نوێیە و لە خانەی سیستەمی نیشانەناسی زمانیشدا نیشتەجێ دەکرێت. کاتێکیش دوو سیستەمی نیشانەناسی لەسەر یەك پانتایی و کەناڵ جێگەیان دەکرێتەوە، نەك هەر لەبەردەم پرۆسەیەکی (دیموکراتیانە)ی ئاڵوگۆڕداین کەتیایدا خەسڵەتەکانی دەربڕین لەسیستەمی یەکەمدا (واتە ڕەنگ، هێڵ و مۆتیڤ) نابنە مەرج لەبەردەم خەسڵەتی دەربڕین لەسیستەمی دووەمدا (واتە ڕیزکردنی دێڕ و وشەکان بەپێی گراماتیکی ئەو زمانانەی پێیان نووسراون)، بەڵکو لەبەردەم دوو جۆر لە(ئۆرگیناڵیەتی خۆدەربڕین)یشداین.

لەم ئاستەی خوێندنەوەکەشدا دەتوانم بڵێم: ئەگەرچی پرۆژەکە دەیەوێت هەڵگری هیچ مەرج و سنوورێك نەبێت لەبەردەم ئەوانیتردا، بەڵام دواجار

ئۆرگینالییەتی خۆدەربڕین لەسیستەمی نیشانەناسی یەکەمدا، (واتە خۆدەربڕین لەڕووبەرە ڕەنگییەکاندا) بۆتە مەرجێکی بنەڕەتی بۆ خۆدەربڕینی ئۆرگینالیانە لەسیستەمی نیشانەناسی دووەمیشدا (کە دەقە نووسراوەکانە).
ئەمەشمان بەوەدا بۆ ئاشکرا دەبێت، کە ڕێبوار نایەوێت بەشداربووەکانی دی بەتایبەتی لەسەر (ناوەڕۆکی ئیشەکانی بنووسن)، نایەوێت سنوور دابنێت بۆ ئەو زمانەی پێیدەنووسن، نایەوێت دەستنیشانی بکات لەکوێی ڕووبەرە گشتیەکەی بەردەمیاندا بنووسن و بەکام جۆری قەڵەم بنووسن..، بەڵکو دەیەوێت بەشداربووەکان ڕووبەرە ڕەنگیەکە ***(لەیاد بکەن)***، (***بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە خراپ بوونی تابلۆکە. کاتێکیش دەست دەکەن بە نوسین، وامەست بکەن تابلۆکە مسۆدەیەکە، تاکو نووسینی شیعرەکە یان ئەو فیکرەیە(ی دەینووسن) زیاتر خۆڕسك بێت. گەر هەر هەڵەیەکیش بکەن بەبێ دوودڵی ڕەشی بکەنەوەو بەردەوامبن لە نووسینی ئدێی داهاتووی نوسینەکەیاندا***) (٢٠).
کەواتە ئێمە لەبەردەم پرۆژەیەکی ئاڵوگۆڕداین کەبواری هەڵەکردنیشمان بۆ دەهێڵێتەوە! بەڵام ئەوەی ئەم پرۆژەیە وەك مەرجێکی بنەڕەتی قوتی دەکاتەوە ئەوەیە، کەدەبێت بەشداربووەکان بە(***دەستوخەتی خۆیان بنووسن و کۆپییەکی نووسخە تایپکراوەکەش لەگەڵ ئۆرگێناڵەکەدا بگێڕنەوە***) (ئەمە لەو نامە ئینگلیزییەوە وەرگیراوە کە ڕێبوار بۆ بەشدارببوەکانی ناردووە).
نامەوێت بچمەناو باسکردنی دەلالەتەکانی جیاکردنەوەی (ئۆرگێناڵ) لە (کۆپی)، بەڵام داواکارییەکەی ڕێبوار بۆ بەکارهێنانی دەست وخەت لەسەردەمێکدا کە ئامێرەکانی نووسین (کۆمپیوتەر، تایپرایتەری ئەلەکترۆنی و هتد)، لەبازاڕدا ڕۆژگاری زێڕینی خۆیان تەی دەکەن و ڕۆژانە لەڕووی هەندەسییەوە لەپەرەسەندندان، جێگەی سەرنجە.
من پێشتر گوتم: ئۆرگینالییەتی خۆدەربڕین لەسیستەمی نیشانەناسی یەکەمدا، (واتە لە ڕووبەرە ڕەنگییەکاندا) بۆتە مەرجێکی بنەڕەتی بۆ خۆدەربڕینی ئۆرگینالیانە لەسیستەمی نیشانەناسی دووەمیشدا. دەمەوێت ئێستا شتێ بۆسەر ئەم حوکمە زیاد بکەم و بڵێم: کەواتە بەکارهێنانی دەستوخەت

لەسیستەمی نیشانەناسی دووەمدا، نەك هەر مەرجێکی(گراماتیکی) ئەو زمانە جێبەجێ دەکات کەتێکستەکانی پێدەنووسرێن، بەڵکو دەشبێتە نیشانەی ئامادەکردنی خاوەن دەستوخەتیش وەك فەردێك لەسەر ڕووبەری گشتیی ئیشەکان. دەستوخەت وەك شێوەیەکی بەرجەستەکردنی خود لەپانتایی تێکستی نووسراوداو دەستوخەت وەك نیشانەی ئامادەبوونی تاکەکان لەناو پەیوەندیەکەدا.. بەمەش هاوسەنگییەك لەنێوان هەردوو سیستەمە نیشانەناسییەکەدا دروست دەبێت و چوارچێوەیەکی (شەخسی و تایبەت و ئۆرگێناڵ) دەداتە سەرجەمی ئاڵوگۆڕەکە: سیستەمی نیشانەناسی یەکەم خۆی لەبەردەم سیستەمی نیشانەناسی دووەمدا ئاوەڵادەکات، تا شاعیر و نووسەر و هونەرمەندەکانی دیکە بەدەستی خۆیان ئەو شتە بنووسن کە دەیانەوێ بە بەشداریکردنی شەخسیی ئەوان لەم پرۆژەیەدا لەقەڵەم بدرێ. لێرەشەوە قەبووڵکردنی ئەوان بۆ بەشداربوون، قەبووڵکردنە بۆ بەکارهێنان و خۆتەرخانکردنی شەخسی بۆ ئەو بوارەی کەدەتوانن تیایدا (شوێندەست و مۆرکی ناوەوەی کەسایەتی خۆیان)ی لەسەر جێبهێڵین. یاخود دەتوانم بڵێم، ئەو قەبووڵکردنە بریتیە لەتێکەڵبوون بەپرۆسەیەك کە تەنیا جێگەی حزوورێکی ئۆرگێناڵی تێدا دەبێتەوە، حزوورێ کە ناچاریان دەکات خۆیان بن: بەشێوەیەکی ئازاد دەقێکی سەربەخۆ بخوڵقێنین کە تائەوپەڕی ئیمکان مۆرکی کەسایەتی و هەستیاریی ئیستاتیکیانە و فیکریی خودی خۆیانی، بەشێوەیەکی ئاگا، یان لەنائاگاییەوە پێوە شەتڵ بکەین.

لێرەوە و لەهەناوی ئەم داواکارییەدا خۆزگەیەکیش دەبینینەوە بۆ سڕینەوەی هەموو ئەو سنوور و دیوار و ڕێگرانەی ژیانی مرۆڤی هاوچەرخ، کەناهێڵن پێکەوەبوونی ڕاستەقینەیان لەنێواندا دروست ببێت و ناچاریان دەکات بە دروستکردنی ماوەکان و پەرەپێدان بەتەکنیکەکانی خۆ لەیەکتری هەڵەکردن و بێموبالاتی پیشاندان.. ئەنجامی ئەمەشمان لەتەنیایی و نامۆبوونی کوشندەی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا بۆدەردەکەوێت. هەموو ئەمەش لەکاتێکدا کە عەقڵی بەڕێوەبەری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی وەك تەلەفزیۆن، ئەنتەرنێت و سەتەلایت و

هتد، بەردەوام مژدەی ئەوەمان پێدەدات: کە لەهیچ سەردەمێکدا مرۆڤایەتی هێندەی ئێستا ئاگاداری بارودۆخی خۆی نەبووە و سنوورەکانی نێوان وڵات و کولتوورەکان و میللەتانی جیاواز هێندە تێکنەشکێنراون.. بەڵام ڕەنگە ئەمە لە بانگەشەیەك زیاتر هیچیتری لەپشتەوە نەبێت، چونکە ئەم عەقڵییەتە نەك هەر نەیتوانیوە ماوەکان بسڕێتەوەو بە پەیوەندی ئینسانی پڕیان بکاتەوە، بەڵکو بۆتە هۆی دروستکردنی بەدگومانی و ڕەواجدان بەحوکمی پێشینەی کەلتوور و مەڵبەندەکانیش لەئاست یەکتردا. ئەمە جگەلەوەی بەهۆی میکانیزمە ئابوورییەکانیەوە و لەپێناوی بەرفراوانکردنی کەرتی سەرگەرمکردندا، هاتووە (واقیعی جیهان)یشی هێناوەتە سەرئاستی (واقیعێکی نمایشی)ی ڕووت، کەدەشیێت وەك هەر فیلم و نومایشێکی دیکە کاتی خۆمانی لەگەڵ بەسەر بەرین، باشترین نمونەی ئەم قسەیەش نمایشەکانی جەنگی کەنداو بوون کەوەك بارانی ڕەحمەت بەسەر کەناڵە تەلەفزیۆنیەکانی وەك (CNN)دا بارین (٢١).

## ٦. هونەری تاراوگە:

قسەکردن لەسەر (هونەری تاراوگە) بەهیچ جۆرێك جیاکردنەوەی ئەم هونەرە نییە لە هونەر و کایەی هونەر بەگشتی. چونکە دواجار، کاتێ هونەرمەندەکانی تاراوگەش دەیانەوێت بەرهەمەکانیان نومایش بدەن، ئەوە خۆیان لەبەردەم جێبەجێکردنی هەموو ئەو پرنسیپە هونەری، ئیستاتیکی و تەکنیکیانەدا: پرسپێکتیڤ، شێوازی دابەشکردنی ڕەنگ و ڕووناکی، هاوسەنگی لەنیشتەجێکردنی فیگەر و هێڵەکاندا و ئیلتیزامکردن بە سنووری نێوان ستایلە هونەرییەکانەوە و هتد.) دەبیننەوە، کەپێویستە لەو بەرهەمانەدا هەبێ، هەر هونەرمەندێ خوازیارە نومایشیان بدات. ئەمەش بەمانای ئەوەیە هیچ شتێکی دەرەکی نیە تا شفاعەت بۆ بەرهەمەکان بکات، لەجەوهەری ئیشەکان (وەك ئیشی هونەری و ئەزموونی ئیستاتیکی)، خۆیان زیاتر..

دەبێ هەر لەئێستاشەوە ئەوە ڕوونبێت، مەبەستم لەچەمکی هونەری تاراوگە هەرتەنیا هونەرێك ناگرێتەوە کە (ڕیشەیەکی بێگانە بەئەورووپای هەیە،

خۆرهەڵاتیانەیە، جیهانی سێهەمییە، هونەرمەندەکانی مسوڵمان، بودی، هیندۆیی و ئەفەریقایین) و چەمکی حازربەستی لەمجۆرە. چونکە دەشیێت بەهەموو ئەم خەسڵەتانەشەوە ئەو هونەرە، هونەرێ نەبێت کەئێمە دەمانەوێت لەژێر چەمکی (هونەری تاراوگە)دا کاتیگۆریزەی بکەین. لەڕاستیشدا کەم نین ئەو ڕووبەرە پڕکراوانەی بەهۆی ئەو خەسڵەتانەوە خاوەنەکانیانی لەناوبانگ و پارەشدا خەنی کردووەو لەباشترین هۆڵەکانیشدا نومایش دەدرێن ( پاشتر ئەم خاڵە پتر ڕووندەکرێتەوە). کەواتە پێویستە ئەم چەمکە لەمەودایەکی بەرفراونتردا بەکار بهێنین تا (هونەری بەپەراوێزبوو، هونەری ئاماتۆر)و هونەری هەموو ئەو هونەرمەندە ئەوروپاییانەش بگرێتەوە، کە سیستەمی ئۆرگانیزەکردن، میکانیزمەکانی بەبازاڕکردن و بیرۆکراتیەتی دەزگاکانی هونەر، بواری پێویستی نەفەسدانی نەداونەتێ و لە ژێر زەبری چالاکییە هونەرییە ڕەسمییەکاندا، تاراوگەی کردوون.. لێرەشەوە، ڕەنگە لەدواجاردا مەبەستم لەچەمکی (هونەری تاراوگە) ئاستێکی مەعنەوی و هەستیارانەی ڕۆحی و بەرجەستەبوونی ساتەوەختێك بێت لە(بوون)ی مرۆڤ لەناو ژیاندا، یاخود دەربڕینی جیهانبینیەکیش بێت کە بکەوێتە (ئەودیو) جێبەجێکردنی تەکنیکەکانی سازدانی تابلۆوە.. ساتەوەختێك کە لەبەردەم تابلۆدا پێمان بسەلمێنێ: ئەو هونەرمەندەی ئاوا ئەم بەرهەمەی خستوینەتە پێشچاو و بەمجۆرەش لەڕەچاوکردنی تەکنیکە هونەرییەکاندا دەست ڕەنگینە کە لەکارەکەیدا دەیبینین، خاوەنی تێڕوانین و لێکدانەوەیەکی فیکریشە بۆ ژیان و مرۆڤ و کێشەکانی [1].

ئەگەر ئەم بەشەی پێناسەکەمان پشتگوێ خست، ئەوە تەنیا باسی هونەرێکمان کردووە کە تەکنیکە هونەرییەکانی بەرێکوپێکی تیادا ڕەچاو کراون، کە هێڵ و پرسپێکتیڤەکردن، دابەشکردنی ڕەنگ و ڕووناکی و پڕکردنەوەی ڕووبەری تابلۆی، بەو پەڕی دیقەتەوە تیادا جێبەجێکراوە، بەڵام لەڕوانین و لێکدانەوەیەك بۆ ژیان و مرۆڤ بەدەرە.. کەواتە مەبەست لە(هونەری تاراوگە) لەیەك کاتا تەکنیك و پرسپێکتیڤەکردنی تەکنیکیشە بۆ بەرجەستەکردنی مانا و

ڕاڤەکردنی هونەرمەند بۆ ژیان و دەورووبەری ئینسانی خۆی.. لەیەک کاتا فراوانکردنی ئەزموونی ئیستاتیکی ڕووتەو لەهەمان کاتیشدا دەربڕینی ئەندێشەیەک لەسەر ژیان و دیاردەکانی. هەم ناوەڕۆکی ئەو (ڕیوایەتانە)مان مەبەستە کە هونەری تاراوگە ئاشکرایان دەکات، هەم (شێوەی ڕیوایەتکردن)ـەکەشیان. پێویستە لەیەک کاتا هانمان بدات بۆ بەرپرسیاربوون لەئاست پەیامەکەیدا، لەهەمان کاتیشدا بەهۆی جوانکاریەکانیەوە، چێژمان بداتێ..

کۆمیدیاکەش لەوەدایە زۆرجار خودی تاراوگەییبوونی بەرهەمەکان دەبێتە ڕێگرێک لەبەردەم قەبوولکردنیاندا وەک هونەرێ کەهاوشان بەنومایشدانی کارەهونەرییە ڕەسمییەکانی ئەوروپا، بۆ نومایشدان بشێێن!.. دەکرێت بەهێمنی خۆمان ئامادە بکەین بۆ تێگەیشتن لەهۆی ئەم بارودۆخە، کە پەیوەندییەکی توندی هەیە بەسیستەمی ڕێکخستن: (ئۆرگانیزەکردن)، دابەشکردنی کار و کایەی پسپۆڕی (تخصص)ـەوە، لەکۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا:

بێگومان سیستەمی ئۆرگانیزەکردن لەخۆرئاوا، سیستەمێکی گشتگرەوەی چەسپاوەو هیچ چالاکییەک بەبێ جێبوونەوەی لەناو ئەم سیستەمەدا، مەحاڵە بەئامانجەکانی خۆی بگات. لەجەوهەردا، ئۆرگانیزەکردن وێڕای ئەو مانایەی زاراوەکە لە زمانی ڕۆژانەدا هەڵگریەتی، بەمانای دابەشکردنی پرۆسەکانی ئیشکردن و وردکردنەوەیان بۆ بچووکترین کەرت و یەکەش دێت. ئەمەش بەنیازی ئەوەی لەڕەوتی گەیشتن بەئامانجەکاندا ڕێبگیرێ لە شتە چاوەڕواننەکراوەکان و بارودۆخە لەپڕ و پێشبینی نەکراوەکان. لێرەشەوە لەسیستەمی ناوبراودا، نەک هەر ژمارەیەک کەس ئەرکی جێبەجێکردنی کەرتەکانی ئیشکردن دەگرنە ئەستۆی خۆیان، بەڵکو بەرپرسیاریش دەبن لەئاست شوێنگەی پسپۆڕیی خۆیان لەسەرجەمی پرۆژەکانیشدا. چونکە بەوەی ئەوان شوێنگەیەک لەپرۆسەیەکی ئیشکردندا قەبوولّ دەکەن، ئەوە سەرجەمی پاشخانی کولتووری و ئەکادیمی خۆشیان وەک بارمتە لەو پرۆسەیەدا دائەنێن. ئەمەش بەجۆرێ کە هەموو کەمتەرخەمییەک لەجێبەجێکردندا، دەبێتە هۆی

دروستکردنی گومانێکیش لەئاست شوێنگە ئەکادیمی و پسپۆڕییەکەیاندا، (زۆرجاریش دۆڕاندن و لەدەستدانی بەوەی لەکار دەردەکرێن).. هەربۆیەشە ئێمە دەبینین کە هونەرمەندی پیشەیی و پسپۆڕە جۆربەجۆرکان و تەکنیکاری کەرتە جیاوازەکانی بەرهەمهێنان، هێندەی بەتەنگ بەئەنجامگەیاندنی بێعەیبی پیشەکەیانەوەن، هێندە بەلایانەوە گرنگ نیە ئەنجامی کۆی کارەکەیان دەچێتە خزمەت چ پرۆژەیەکی ترەوە، دەبێتە تەواوکەری چ پرۆسەیەکی بەرهەمهێنانی دیکەو هتد، کەبێگومان ئەوانیش لەڕووی ئەخلاقییەوە لێی بەرپرسیار دەبن. بەمانایەکی تر، سیاسەتی دابەشکردنی کار بۆسەر بچووکترین بەشەکان و بەپیشەییکردنی هەموو کەرتەکان، بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی نابینایییەکی مەعریفی و وەدیهاتنی بۆشایییەکی ئەخلاقیش لەئاست سەرجەمی ئەو ئامانجانەدا کە پسپۆڕ و شارازاکان لەژێر ترسی گومانکردن لەشارەزایییەکەیان، وزەی کار و زانینی خۆیانی بۆ تەرخاندەکەن (٢٢)

هونەریش کەرتێکی ئیشکردن و بەرهەمهێنانە، کە هەمان میکانیزمی بەسەردا دەسەپێنرێت. هونەریش لەپرۆسەی نومایشداندا وەك هەر کەلوپەلێکی تر پرنسیپەکانی بەبازاڕکردنی (Marketing) بەسەرا دەسەپێت و لێرەشەوە بەبێ ئیرادەی خۆی و بەدەر لەو نرخانەی هەڵگریانە و جیاواز لەنییەتی هونەرمەند خۆی، بەشداری پێدەکرێت لە فراوانکردنی ئاسۆکانی بازاڕ و چەسپاندنی تێگەیشتنی سەرمایەدارانە بۆ هونەر(٢٣). بەمانایەکی تر: لەپرۆسەی نومایشدانی هونەرییشدا، ئەرکی جێبەجێکردنی ئەم میکانیزمانە خراوەتە سەرشانی پسپۆڕ و پیشەیییەکان. واتە ئەوانەی بەپلەی یەکەم مافی هەڵبژاردنی ئیشە هونەرییەکانیان هەیە بریتین لەو (ئێکسپێرت) و شارەزایانەی لەلایەن دەزگا ڕەسمییەکانی هونەر و ڕاگەیاندنەکانەوە: (گالێری، مۆزەخانە و هۆڵەکانی نومایشدان و کەناڵی تەلەفزیۆن و بڵاوکراوە هونەرییەکانەوە)، کاریان پێدراوەو مووچەیان دەدرێتێ. ئەم کەسانەش جگە لە واستەبوونیان بە مەرجەکانی بازاڕەوە: (واتە حسابکردنی وردی ڕێژەی تەماشاکەران وەك کڕیار، گریمانەی فرۆشتنی بەشێکی تابلۆکان و جەختکردنەوە لەسەر هونەری پرۆفێشنال)، ئەوە

زەخیرەی زەینییشیان بەزۆری بەو چەمك و زاراوە ڕەخنەیی و پارسەنگی هەڵسەنگاندنانە پڕبۆتەوە، کەبەتایبەتی لەمێژووی قوتابخانە و ئاراستەکانی هونەری ئەورووپیدا بەرهەمهاتوون و ئیشیان پێکراوە. واتە شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئێکسپێرتەکان لەو هەڵبژاردنەیاندا، بەرهەمی هونەری لەبەر ڕۆشنایی ئەو چەمکانەدا هەڵدەسەنگێنن کە لەناو کولتووری ئەورووپیدا بەرهەمی هونەرییان لەسەرەوە کاتیگۆریزە دەکرێت و نرخی ئیستاتیکیانەی ئەو بەرهەمانەیان لەسەرەوە پێناسە دەکرێت: سوریالی، دادایی، ئێکسپریشیۆنی، هونەی پۆپ، هونەری ئەبستراکت و هونەری پۆست مۆدێرن و هتد. دەسەڵاتی دانپیانراو و چەسپاوی ئەم چەمکانەیە کە وادەکات شارەزاو کڕیارەکان، بەپلەی یەکەم ئەو بەرهەمانەیان بەلاوە سەرنجڕاکێش بێت کە لەژێر یەکێك لەو چەمکانەدا بۆیان خانەبەندی دەکرێن.

**- هۆکاری گرنگیدان بە هونەری تاراوگە:**

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەچەندین وڵاتی ئەورووپیدا شایەتی گرنگیدانین بەهونەری (غەیرە ئەورووپی) و بەتایبەتیش هونەری هونەرمەندانی تاراوگە، واتە هونەرێ کە بەئاسانی لەناو سیستەمی ناوبراوی کاتیگۆریزەکردندا جێگەی نابێتەوەو لەزۆر نموونەشدا پرۆسەی بەرهەمهێنان لەلایەن مامۆستا و بنکەی پەروەردەکردن و خوێندنی پیشەییەوە چاودێری نەکراوە. بۆیە دەکرێت بپرسین ئەو خەسڵەتە چییە لەهونەری تاراوگەدا، کە وێڕای تۆڕەکانی بێرۆکراتیەتی کایەی هونەر، هێشتا وادەکات لەئێستادا بەرهەمی هونەرمەندانی تاراوگە بەشێوەیەکی ڕێژەیی وپەراوێزی لەناو بازاڕی هونەری ئەورووپیدا جێگەی خۆی بکاتەوە؟

شتێکی بەڵگەنەویستە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئێمە لەبەردەم چەندین گریمانەداین، کەهەوڵدەدەم بەبێ ڕەچاوکردنی پاش و پێشخستنیان، گرنگترینیان لەچوار خاڵدا کۆبکەمەوە.

١. **گریمانەی ئەخلاقی:** گرنگیدانی ڕێژەییانە بەهونەر و هونەرمەندانی تاراوگە لەلایەن دەزگا ڕەسمییەکانی هونەرەوە، مێژووی گەشەسەندنی خۆی هەیە. واتە پلەی ئەم گرنگیدانەی ئێستا چەند قۆناغی جیاوازیی مێژوویی خۆی تەیکردووە تا بەم ئاستەی ئێستای گەیشتووە. ڕەنگە سەرەتای ئەم مێژووە بریتیبێ لە *بێدەنگبوون* و لە *یادکردنی* تەواوی هونەرێك بەناوی هونەری تاراوگەوە، ڕەنگە زۆربن ئەو هونەرمەندانەی هەرگیز بواریان بۆ نەڕەخسابێ کارەکانیان لەشوێنە ڕەسمییەکاندا نومایش بدەن، لەناو فەرهەنگەکانی هونەردا ناویان نەهاتبێ، هیچ دەزگایەکی بڵاوکردنەوە ئامادە نەبووبێ بەرهەمەکانیان بڵاوبکاتەوە، ڕۆژنامەکان موبالاتیان پێنەکردبن و دەیان چیرۆکی تراژیدیانەی تری لەم بابەتە، کەهەموویان بەنیسبەت گەشەی ژیانی هونەرییەوە گرنگیی خۆیانیان هەیە. بۆیە دەتوانیین بڵێین لەپشت ئەم گرنگیدانەی ئێستاوە چەپاندنێکی ئەخلاقی هەیە لەبەرامبەر هونەرمەندەکانی تاراوگەدا. ئەم چەپاندنە ئەخلاقییە چیدی نایەوێت لە ئاست درووشمگەلی وەك (مافی مرۆڤ) و لەبەردەم زۆربوونی ژمارەی بێگانان و خواستەکانی (کۆمەڵگای فرەکولتووری)دا بۆ قەبووڵکردنی جیاوازیی، بەبێ وەڵام بمێنێتەوە، بەرهەمی هونەرمەندەکانی سەربەکەمایەتیە غەیرە ئەورووپییەکان پشتگوێ بخات و ویژدانی خۆی ناڕەحەت بکا.. کەواتە گریمانەی ئەخلاقی بۆ ئاوڕدانەوە لە هونەری تاراوگە، بەرهەمی ئەو فەرامۆشکردنەیە کە لەڕابردوودا ستراتیژی دەزگاو لایەنە ڕەسمییەکان بووە لەئاست هونەرمەندانی تاراوگەدا و هونەری ئەویتردا. ئەمەش بەڵگەی پابەندبوونێکی فەندەمەنتاڵیستانەی دەزگاکانی هونەرە بە (مێژووی هونەری ئەورووپی)یەوە وەك تاکە مێژوویەکی خاوەن نەریت لەجیهاندا.

٢. **گریمانەی پیشەیی:** پرسیار لە پیشەیی بوونی هونەر و پرۆفیشنالییەتی هونەرمەند، مەرجێکە، کایەی هونەری بەدەزگاییبوو (Institutional Art) لەبەرامبەر هونەرمەنداندا ئیشی پێکردووە و هەتا ئێستاش ئەم مەرجە گرنگیی خۆی هەیە. هەمیشە ڕابردووی پیشەیی و ئەکادیمیانەی هونەرمەندی بێگانە لە بەجیدیگرتنی کارەکانیدا ڕۆڵی خۆی بینیوە و بەدگومانیی دەزگاکانی هونەر لەو ڕابردووە، گەلێك کێشەی ڕۆحی و پراکتیکی بۆ هونەرمەندانی تاراوگە خوڵقاندووە. هەڵبەت لەپشت گریمانەی پیشەیی و پرۆفێشناڵیبوونەوە، دوو مەبەست هەیە: یەکەم پیشە وەك سەرچاوەیەکی ئابووری بۆ ژیان و دووەم *پرۆفێشناڵیزم*، بەمانای تەواوکردنی خوێندن لەیەکێك لە زانستگاکانی جیهانی دەوڵەمەندا کە ئیعتیرافی پێکرابێت. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ موبتەلابوونی عەقڵیەتی داوەریکردنی ئێکسپێرتەکانی هونەر، بە میکانیزمەکانی بازاڕ و گەڕانی هەمیشەییان بەدوای بەرهەمی ئەو هونەرمەندانەی لەپاڵ بەرهەمەکانیشیاندا، سوود لەناوبانگیشیان وەرگیراوە.

لەگەڵ پەرەسەندنی ڕەخنە لەبەدەزگابوونی هونەر، لەگەڵ خۆسەپاندنی هونەرمەندانی غەیرە پرۆفێشناڵ و لەگەڵ گەڕانەوەی بەردەوامیش بۆ خەسڵەتەکانی ناسنامەی ئەتنیکی لەکۆمەڵگای فرەکولتووریدا، ئەمڕۆ ئەم گریمانەیە خۆی لەبەردەم ناچاریی پیاچوونەوە بەپرنسیپەکانیدا، دەبینێتەوە. بەڵگەی ئەمەش لەو بایەخدانەدا دەبینینەوە کە بەشەکانی ئەتنۆگرافی مۆزەخانەکان و هەندێ گالێری و زانستگای هونەری، بەکردنەوەی پیشانگای هونەرمەندی سەربەنەتەوەو گرووپە ئەتنیکیە جیاوازەکانی دەدەن.

٣. **گریمانەی سەرسووڕماندن:** گەڕان بەدوای هونەری سەرسووڕهێنەر، ئیگزۆتیك و جیاوازدا، خولیایەکی هەمیشەیی کولتووری ئەورووپیی بووە. سەردەمی کۆلۆنیالیزمیش بە لوتکەی گەڕان و کۆکردنەوەی بەرهەمە

دانسقەکانی ئەم هونەرە دادەنرێت. هەر لەسایەی ئەم بزاڤە ئۆرگانیزەکراوەی کۆلۆنیالیستەکانیشدابوو، کەئەمرۆکە زۆربەی سیمبوولە ئاینی و نەتەوەییەکانی گەلانی کۆلۆنیکراو لەو مۆزەخانە و دەزگایانەدا دەبینینەوە، کە بەهەزاران فرسەخ لەشوێنی ڕاستەقینەی خۆیانەوە دوورن.(٢٤). بەڵام ئەوەی لەسەردەمی ئێستادا، واتە لە قۆناغی پۆست مۆدێرنیتەدا، دەزگاکانی هونەر هاندەدات بۆ گرنگیدانیان بە ئیگزۆتیکیەتی (غرائبیە)ی هونەر، بریتیە لەو خواستە تێرنەبووەی کۆمەڵگای مۆدێرن بۆ تاقیکردنەوەی زۆرترین مەوداکانی ئەزموون و پێویستی مرۆڤی هاوچەرخ بەگۆڕینی خێراخێرای دەمامکەکانی و (چێشتەکردن)ی زۆرترین ئیمکانیەتەکانی سەرگەرمبوون و کات بەسەر بردن و چێژوەرگرتن. ئەم خواستە تێرنەبووە توانیویەتی لە ئێستای بازاڕیشدا گۆشەیەك بۆ هونەری جیاواز و سەرسووڕهێنەر بکاتەوە. ئەگەرچی بۆ ئەمەش گەلێك مەرجی تایبەتی لەئارادایە کەدیسانەوە لەلایەن هەڵسووڕێنەرانی بازاڕەوە لەبەردەم بەشداربووەکاندا قوت دەکرێنەوە.. بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەو گرنگیدانە، پێویستییەکی ناوخۆیی بازاڕی هونەریشە بەئامادەکردنی بەرهەمی جیاوازتر لەو بەرهەمانەی لەزەمینەی کولتووری بڕیاردەری هەمان بازاڕدا بەرهەمدێن. ئەمەش یارمەتیدەرە بۆئەوەی ئاستەکانی کێبەڕکێی کڕین و فرۆشتن بەرز ببێتەوە. ئەم بارودۆخەش وامان لێدەکات بڵێین: ڕەنگە چیدی هەر لەبەر ڕەگەزی ئیگزۆتیکی و غەرابەت نەبێ، کەهونەی بێگانان ئاوڕی لێدەدرێتەوە، بەڵکو قەیرانەکانی هونەری بەدەزگاکراویش لە بەبازاڕکردنی خۆیدا، ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە و ناچاری دەکات هەمیشە بەدوای دژە وەهمییەکانیدا بگەڕێ تا خۆیان پێ بەراوورد بکات.. هەربۆیەشە لەئاستێکی تردا دەبینین ئەم بازاڕە لەپاڵ سەدان جۆری لەیستۆکە(لعابە) ڕەنگاوڕەنگەکانی کەمپانیای(واڵت دزنی)دا، کە لەسەر پێشکەوتووترین هەندەسەی کۆمپیۆتەری بەرهەمهاتوون، شوێنێکی پەراوێزیش بەو ئامێرە دەستکردانە دەبەخشێ کە مناڵانی گوندەکانی

ئەفریقا و چین و تیبتیا لە (پەڕۆ و تەل و تەختە و سەرەسۆدە)، دروستیان کردوون..

٤. **گریمانەی پڕوپاگاندەکردن:** هیچ گومان لەوەدا نییە کەگرنگیدانی دەزگا ڕەسمییەکانی هونەر بە بەرهەمی هونەرمەندانی تاراوگە، ئەنجامێکی ململانێی ناوخۆی ناو کایەکان و پۆزیشنی ئەو دەزگایانەیە: واتە ململانێی نێوان مۆزەخانە (گەورەو بچووکەکان)، ململانێی نێوان (گالێرییەکان و هۆڵەکانی نومایشدان) و نێوان (مۆزەخانە و گالێرییەکان) و هتد. لەئەنجامی ئەم ململانێ و کێشمەکێشەی ناو کایەکانیشەوە، جۆرێ لەگرنگیدان بە (هونەری تاراوگە) سەرهەڵدەدات، کەزۆرجاریش لەسیمای پشتگیریکردنێکی ئەخلاقیدا (*Moral Support*) خۆی بەیاندەکات: (وەك ئەو چالاکییانەی لایەنە خەیرییەکان و ڕێکخراوی پەنابەران و کەنیسەو هەندێ دەزگای دیکە، بواریان بۆ دەڕەخسێنن.

بۆ تێگەیشتن لە ململانێی ناوەکی و دەرەکی کایەکان، لێکۆڵینەوەکانی سۆسیۆلۆژی فەرەنسی پیر بۆردیۆ گرنگییەکی زۆریان هەیە(٢٥).

بۆردیۆ ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، کە کایەکۆمەڵایەتیەکان هەمیشە لەناکۆکیدان و وزەی تازەبوونەوەو بەردەوامیی خۆشیان هەر لێرەوە بەدەست دەهێنن، کە هونەریش یەکێکە لەو کایانە.. هونەر و دەزگاکانی هونەر، نەك هەر لەسەر مافی پێناسەکردنی چۆنایەتی(کواڵیتە)ی هونەر و دابەشکردنی پانتایی کایەی هونەر شەڕیانە، بەڵکو ململانێیەکی توندیشیان لەسەر پرۆسەی بەبازاڕکردنی بەرهەمی هونەری لەنێواندایە. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم پرۆسەیە نەك هەر لەدابینکردنی بودجەدا یارمەتیان دەدات، بەڵکو سوومعەی ئەو دەزگاو لایەنانەش بەرز دەکاتەوە. ئەمەش چێژێکی زۆر دەداتە چۆنێتی تێگەیشتنی دەزگاکان لەخۆیان، کاتێ لەراپۆرتی ساڵانەدا نەك وەك پڕوپاگەندە، بەڵکو وەك خاڵێکی پۆسەتیڤ لەسەر خۆیان دەیخەنە ڕوو. چونکە ئەمە دەریدەخات کەدەزگاکانی هونەر، وێڕای کۆششیان بۆ گەیشتن بەئامانجە تایبەتیەکانی خۆیان و

فراوانکردنی کایەی خۆیان، توانیویانە ئامانجێکی کۆمەڵایەتیش بەدەست بهێنن، کە شکۆی ئەوانی پێبەرز دەبێتەوە.
ڕێك ئالێرەشدا گرنگیدانیان بەهونەری تاراوگە، گرنگیدان نییە لەپێناوی (نرخە هونەرییەکان)دا، بەڵکو گرنگیدانە لەپێناوی ئەو پڕوپاگەندەیەدا کە لەڕێگەی بەکارهێنانی هونەری ناوبراوەوە بۆ سومعەی کۆمەڵایەتی خۆیان پێویستیان پێیەتی.. هەمان میکانیزمیش لەناو کارگەو ئیدارەکانیشدا خۆی دووبارە دەکاتەوە، ئەمەش کاتێك دروشمی وەك: (میهرەبان بوون لەگەڵ ژینگەی دەوروبەر)، (پاراستنی مافی ئاژەڵان) و (پیس نەکردنی ئاوی خواردنەوە) دەبێتە ویردی سەر زاری هەمان ئەو ئیدارەو کارگانە.. دەزگای (پۆلیس)یش سوودێکی زۆری لەهەمان میکانیزم وەرگرتووە، چ بۆ بردنەسەرەوەی بودجەی ساڵانەی خۆی بەناوی (کڕینی ئامرازی پێویست بۆ نەهێشتنی خراپەکاری) و چ بەناوی (ئارامکردنەوەی بارودۆخی ڕۆژانەی کۆمەڵگا)..
بەڵام وێڕای ئەو چوار خاڵەی سەرەوە، هێشتا دەتوانین بڵێین هۆی سەرەکی گرنگیدانی ڕێژەییانەی دەزگاو لایەنە ڕەسمیەکان بەهونەری تاراوگە، بریتیە لە(*تاراوگەییبوونی*) ئەو بەهەمانە. خەسڵەتەکانی تاراوگەییبوون دێن تاهەندێ لەو پارسەنگ و چەمکانە تێکبشکێنن کە تائێستا وەك چەمکی بەدیهی لەبواری هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەریدا ئیشیانکردووە. مادام هونەری تاراوگە هونەرێکە جیاوازە، *ڕێژەگەرایە، سنوورشکێنە، مینماڵیزەی خۆی دەکات، لەئاست سیستەمەکانی ئاڵوگۆڕ و پەیوەندیدا هەڵوێستگرە، تێکەڵێکە لە کەلەپوور و هاوچەرخێتی، لەیەك کاتا ناسنامەیەکی تایبەت و یەکێکی هاوبەشی هەیە و.. مادام لەئاستی ماناشدا پێکەوەبوون و دیالۆژی نێوان فەرهەنگەکان و هاوکاریی مرۆڤەکانی بەمەبەستی وەدیهێنانی ژیانێکی تەباو ئاشتیخواز، کردۆتە ناوەڕۆکی خۆی*[٣]، *ئەوە ناشتوانێت لەناو سیستەمی ڕەخنەیی و چەمك و خانەبەندیکردنی دەزگا چەسپاوەکانی هونەری زاڵدا نیشتەجێ بکرێ.* ڕێك لەم بارودۆخەشدا، ئەم هونەرە بێڕەگ و ڕیشە و لەدەرەوە ڕا هاتووە، ئەم هونەرە بێ دەزگاو بێ پشتیوان و بەپەراوێز بووە، دەبێتە ئەو ئاوێنەیەی کەهونەری

جێگیر و بەدەزگابوو، هونەری نیشتەجێ و خاوەن دەسەڵات، ناچارە خۆی لەبەرامبەردا ببینێتەوە. ئەنجامە سەرەتاییەکانی ئەمەش لەپێداچوونەوە بەو چەمك و سیستەمی داوەری و پارسەنگی هەڵسەنگاندنانەدا دەبینینەوە کە تائێستا لەکایەی هونەردا چەمك و سیستەمی بەڵگەنەویست بوون. ئەگەرچی ئەم بەخۆدا چوونەوەیە، جارێك لەژێر ناوی گریمانەی ئەخلاقیدا چەپاندنەکانی خۆی ڕایی دەکات و جارێك وەك دانپیانان بەتوانای ئەکادیمی هونەرمەندەکانی تاراوگەدا خۆی دەردەبڕێ و جاری سێهەم بەبەڵگەی (غەرابەت)ی ئەم هونەرەوەو لەجاری چوارەمیشدا وەك وەرەقەیەك لەململانێی ناو کایەکانیدا بۆ دروستکردنی هاوسەنگی بەکاری دەهێنێت..

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە لەپشت هەموو ئەمانەوە، هونەری تاراوگە هێدی هێدی بەڕێگاوەیە بۆ ئەوەی وەك کایەیەکی هونەریی سەربەخۆ، جێگەی خۆی بکاتەوە. هونەرێ، کەبەپێچەوانەی ویستی دەزگاکانی هونەر و ڕێکخراوە خەیری و هیومانیستەکانەوە، چیدی نایەوێت لەپاڵ مێژوویەکی گەورەتر و لەپەراوێزی کێشەی سیاسی ئەو وڵاتانەی هونەرمەندەکانی لێوەهاتوون، یاخود ئەو کێشانەی هونەرمەندەکان لەڕێگەی پرۆژەو کارەکانیانەوە دەریاندەبڕن: (وەك کێشەی ئافرەتان، پیر و پەککەوتەکان، بێگانان و هتد)، ناوی بهێنرێت و هەڵسەنگێنرێت و پێناسە بکرێت. چونکە ئەمە نەك هەر بەپەراوێزکردنی نرخە ئیستاتیکییەکانی هونەرە، بەڵکو پێچەوانەی ویستی هەموو ئەو تێزە ڕەخنەیی و تیۆریە هاوچەرخانەی هونەر و ئیستاتیکایشە، کەئەمڕۆ لەخۆرئاوادا بۆ قسەکردن و هەڵسەنگاندنی جیهانی بەرهەمی هونەری ئێشیان پێدەکرێت.

بەم پێیەش بەکارهێنانی سیفەتی (تاراوگە) لەپاڵ (هونەر)دا و پڕوپاگەندەکردن و هەوڵدان بۆ دارشتنی (تیوریەك لەسەر هونەری تاراوگە)، بەمانای زیادکردن و پێوەلکاندنی چەمکێکی (دەرەکی و خواستراو) نیە تا شتێکی زیاترمان لەسەر هونەر پێبڵێت. بەڵکو ڕەهاکردن و دۆزینەوە و تەقاندنەوەی تواناو وزەیەکی شاراوەی هونەر خۆیەتی کە لە (ساتەوەختی تاراوگەبوون)یدا بەرجەستە دەبێت و خۆی دەردەبڕێ. ئەم وزەو توانایەش هەم ناوەڕۆکی ئەو هونەرە دەگرێتەوەو

هەم ئەزموونە ئیستاتیکیەکەشی. هەربۆیەشە هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی خەسڵەتەکانی هونەری تاراوگەو پرسپێکتیڤەکردنیان لەسەر پرنسیپی تیۆری، ناکرێت لەدەرەوەی تێگەیشتن و چاوپۆشیکردن بێت لەو تیۆریانەی کەئێستا بە تیۆری هونەر دەیانناسین. چونکە بەوەی بەتایبەتی قسە لەسەر خەسڵەتە تاراوگەییەکانی هونەر دەکەین، خۆمان ناخەینە دەرەوەی بەگشتی قسەکردن لەسەر ئەزموونی ئیستاتیکی لەهونەردا.

** **

بەمجۆرەش، کاتێ بەرهەمی هونەری لەئاستی دەربڕینە تاراوگەییەکەیدا دەخوێنینەوە، بەهیچ شێوەیەك ڕەهەندە ئاڵوگۆڕکەرەکەی پشتگوێ ناخەین. چونکە ئەمە کارێکە گەلێك کێشەمان بۆ دروستدەکات. بەڵام لەوە مەترسیدارتر ئەوەیە کە تەنیا وەك هۆیەکی ئاڵوگۆڕکردن تەماشای هونەری تاراوگە بکەین. چونکە بەمەیان هونەر کاراکتەری هونەربوونی خۆی لەدەست ئەدات و دەهێنرێتە سەر ئاستی (کەناڵێکی پەیوەندیکردنی ڕووت). لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەو ڕاستیەدا بنێین کە هونەری تاراوگە بەپێی سرووشتی خۆی و بەمەبەستیش، دەیەوێت (هونەرێکی پەیوەندیکەر)بێت، بەبێ ئەوەی هەموو بەهای خۆی لە پەیوەندیکردندا بچووك بکاتەوە..
بەمانایەکی تر، هونەری تاراوگە خۆی ناتوانێت ببێتە سیستەمێکی ئەڵتەرناتیڤ بۆ سیستەمەکانی ئێستای ئاڵوگۆڕ کردن، چونکە بەمە هونەربوونی خۆی و سەربەخۆیی ئەزموونە ئیستاتیکیەکەی خۆی دەدۆڕێنێ. بەڵام هونەری تاراوگە دەتوانێت بەردەوام هانمان بدات بۆ بیرکردنەوە لە سیستەمێکی (ئایدیاڵی)ی پەیوەندیکردن. واتە سیستەمێ کە لەواقیعدا کاری پێناکرێت چونکە سرووشتی ئایدیاڵیبوونەکەی ڕێگەی ئەمە نادات. بەڵکو زیاتر وەك ئیمکانێکی تیۆری بۆ ڕەخنەگرتن لەکەموکوڕی سیستەمە ئاڵوگۆڕییەکانی ئێستا، کە میکانیزمەکانی وەك (مانیپۆلێزەکردن، چاوبەستکردن، ڕووتکردنەوە و ڕواڵەتکاری) بەڕێوەی دەبەن.. لێرەشەوە هونەر، وێڕای ڕەهەندە مەعنەوی و ئیستاتیکیکەی، دەتوانێت هەڵگری ڕەهەندێکی پراکتیکیش بێت بۆ بەشداریکردن لەگۆڕینی هەل

و مەرجەکان و بەگژداچوونەوەی بارودۆخە سەپاوەکانی ئێستاشدا. ئەگەر ئەمە بە گۆڕینی ئەو هەلومەرجانەش کۆتایی نەیەت، ئەوە بەلای کەمەوە زەرووڕەتی ئەو گۆڕانەمان بەبیر دەهێنێتەوە و ڕێگای چارەسەرسازی هاوبەشمان وەك ڕووبەرێکی کراوە لەبەردەمدا بەرجەستەدەکات. لەوکاتەشدا ڕەنگکردن و پڕکردنەوە و شوێنپەنجە جێهێشتن لەسەر ئەو ڕووبەرە دەبێتە هەڵبژاردنێك لەبەردەم هەرکامێکماندا.

هونەری تاراوگە بەهۆی خەسڵەتە (نیسبیگەرا، تۆلەڕانس و کرانەوە)کەیەوە بۆ (کۆکردنەوەی بەشە دابڕاوەکان و دروستکردنی ماڵێکی هاوبەش) بۆیان، هەروەها لەبەر ئەوەی توانای هەیە سنوورە بەدەزگابووەکانی هونەر تێکبشکێنێ و ئاڵوگۆڕکردنی یەکلایی بگۆڕێ بەئاڵوگۆڕی بازنەیی و هەمەلایەنی، ئەوە توانایشی هەیە پەیوەندیەکانیش بەئامادەیی و خۆدەربڕینی ئۆرگێنالیانەی تاکەکان پڕبکاتەوە(٢٦)

** **

پڕۆژەی (وشەو ڕەنگ) لەدوا ئامانجی خۆیدا، بانگهێشتنێکە بۆ بەرفراوانکردنی ڕووبەری ئاشتی و نیشتەجێکردنی جیاوازییەکانە لەناو خەونی داهاتوویەکی مرۆڤانەتردا. ئەمەش نەك بەهۆی فەرزکردنی ناوەڕۆك بەسەر شێوازدا، یاخود زاڵکردنی مانا بەسەر ئەزموونی ئیستاتیکیدا، بەڵکو لەڕێگەی دروستکردنی هاوسەنگییەوە. ئەگەرچی دواجار ئەمەش لەبەرژەوەندی ئەزموونە ئیستاتیکییەکاندا کەوتۆتەوە. چونکە ڕووبەرە ڕەنگیەکان، نەك هەر بوونەتە هۆی بەدەنگهێنانی مانا لەتێکستەکاندا، بەڵکو بوونەتە هۆی تەقاندنەوەی ئەزموونی ئیستاتیکی بەشداربووەکانی دیکەیش. ئەمەش ئەو توانا و وزە شاراوەیەی هونەرە کەلەسەر عەردی تاراوگە خۆی بەیاندەکات و سیفەتی تاراوگەبوونی پێدەبەخشێت. سیفەتێ، کەهەڵگری خەونێکە بۆ پاشەڕۆژ و ئامانجیشی ئەوەیە: (هەوڵدانێك بێت بۆ کۆکردنەوەی دیدی شاعیرانی سەر بەنەتەوەی جیاواز بەرامبەر بەهونەری وێنەکێشان، یان بەمانایەکی دی: ڕەنگ

و هێڵێ بتوانێت یەکیەتیەکی جیهانیی لەنێوان شاعیرانی جیاوازدا کۆبکاتەوە)(٢٧
)
دەکرێ لەدواجاردا بپرسین ئەم هەموو جەختکردنەوەیە لەسەر(شیعر و شاعیران) لەپێناوی چیدا؟!
تەنیا بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆمان دەردەکەوێت ئەم پڕۆژیە لەجەوهەری خۆیدا چەندە پڕۆژەیەکی دژ بە ئەفلاتوونگەراییە لەهونەردا. چونکە لەکاتێکدا ئەفلاتوون شاعیرانی بەتۆمەتی شێواندنی زەینی لاوەکان، لەکۆمارەکەی کردنە دەرێ، ئەوە ئەم پڕۆژەیە خۆی دەکاتە کۆماری شاعیران: شیعر وەك خودیی ترین دەربڕینی تاکەکەس و وەك ئۆرگێناڵترین حزووری مرۆڤ لەجیهاندا. ئایا لەدواجاردا هەموو پڕۆژەیەکی هونەری بەرزیش، هەوڵدانێك نیە بۆ ئاشتکردنەوەی مرۆڤ و خودە چەوساوەکەی بەژیان؟

## 7. پێشزەمینە فەلسەفییەکانی
## (*خوێندنەوەی هونەری تاراوگە*):

لەڕاستیدا ئەگەر خەسڵەتی (بانگهێشتن)مان خستە پاڵ هونەری تاراوگەو بە پێکهێنەری پاناتییەکی هاوبەشمان دانا بۆ پێکەوەبوونی ئەزموونی کولتوورە جیاوازەکان، وەك ئەوەی لەبەشەکانی پێشوودا خاڵە تیۆریەکانیم خستنە ڕوو، ئەوە دەتوانین سەرەتای ئەم خەسڵەتە هونەرییە بگێڕینەوە بۆ مێژووی ئەفسانەیی و دینی مرۆڤایەتی. کەم نین ئەو سیمبوولە ئەفسانەیی و دینی و کولتووریانەی کە لەنێوان گەلان و شارستانیەتەکاندا بەردەوام لە کۆچ و جێگۆڕکێدابوون و لە نزیکخستنەوەی ژیارەکاندا ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە. ئەم سێمبوولانەش نەك هەر بەدیهێنەری بۆنە و کەش و مەراسیمی چوون یەکبوون لەناو گەلاندا، بەڵکو بەدیهێنەری وێنای چوون یەك و تێگەیشتنی هاوشێوەیش بوون لەسەر دنیای باڵا و هێزە سرووشتیە ڕامنەکراوەکان و خۆزگەی نەوەکانی مرۆڤ بۆ ژیانێکی جیاواز لە ناو داهاتووشدا.. لەناو ئەم دیاردانەشدا دەکرێت بوونی باڵندەیەکی ئەفسانەیی وەك (فینیکس، یاخود سیمرغ) و بۆنەیەکی وەك

ووشکەساڵی و دۆعای باران، یاخود جەژنەکانی سەری ساڵ (نەورۆز) بە نمونە بهێنینەوە یاد، کەهەموو ئەمانە لەناو زۆربەی کولتوورەکاندا بەدرێژایی مێژوو لە هاتوچوودا بوون و بۆنەو کەشی چوونیەکی کۆمەڵایەتی، دینی و ئیستاتیکییان لەناو ئەو کولتوورانەدا هێناوەتە دی.. لێکۆڵینەوە لەم دیاردانەش لەدوا شیکردنەوەدا پێماندەڵێت، ئەزموونی ئیستاتیکی لەشێوە سەرەتاییەکەی خۆیشیدا هەر ڕۆڵی هێنانەدی زەمینەی هاوبەشی بۆ پێکەوەبوون و نزیکخستنەوەی مرۆڤەکان بینیوە. ئەوەش باسێکە دەچێتە خانەی مێژووی هونەرەوە و ڕەنگە زۆر خاڵی بەسوودیشمان بۆ ڕوونبکاتەوە.. بەڵام ئەوەی من لێرەدا دەمەوێت پتر لەسەری بوەستم، بریتیە لەو پێشزەمینەیەی کە لە ئیستاتیکای فەلسەفیی هاوچەرخدا زەخیرەی ئاخاوتنمان لەسەر هونەری تاراوگە دەداتێ..

لەڕاستیشدا ئەگەر نەشگەڕێینەوە بۆ (مێژووی هونەر)، ئەوە هێشتا دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین: قسەکردن لەسەر هونەری تاراوگە و بەرهەمهێانی خوێندنەوەیەکی تایبەت بۆئەو هونەرە کەتواناى هەبێت گوتارە ئیستاتیکی و فیکریەکانی ئاشکرا بکات، لەئاسمانەوە نەهاتووە. پەرچەکردارێ نیە لەئاست ئاخاوتنە باوەکان لەبارەی هونەرە جوانەکانەوە، کردنەوەی (گیتۆیەکی تیۆری) نیە بۆ هونەری تاراوگە و دڵخۆشکردنێکی سادە نیە بەڕۆڵی هونەر لەنزیکخستنەوەی کەلتوورەکاندا لەژێر فشاری ڕەگەزپەرستی و فاشیزمی هاوچەرخدا و هتد.. بەڵکو دەکرێت ئەو قسەکردنە پێشزەمینەی خۆی لەناو فیکری فەلسەفی و گوتاری ئیستاتیکی هاوچەرخدا دەستنیشانبکات و ڕەوایەتی زۆربەی ئیدیعایە تیۆریەکانیشی لەهەمان پێشزەمینەوە بەدەست بهێنێ..

جێگەی سەرنجە لەساڵانی شەست بەدواوە، گفتوگۆ لەسەر ئەم جۆرە چەمکانە کراوە و لە هەشتاکان و دەیەی نەوەدیشدا جارێکی دی فەیلەسووفەکان و هەندێك لەهونەرمەندان و ڕەخنەگرانی هونەر لەئەورووپا، بەشێوەیەکی دی کێشەکانی هونەر و ڕۆڵی هونەر لەکۆمەڵگاو پەیوەندی ئەمانەیان بەژیانی مرۆڤەوە هێنایەوە بەرباس.. بۆ ئەم مەبەستەش چەندین تێرمی فیکری و

فەلسەفی و ئیستاتیکی تازەیان هێناوەتە بەرهەم و ئەمەش بەپلەی یەکەم لەپێناوی ئەوەدا کە ئاسۆی (ئیستاتیکای فەلسەفی) لەناو فیکری هاوچەرخدا، لەو سنوورانە ڕزگار بکەن کەدەسەلاتی چەمکە گشتیەکانی وەك: (شارستانیەتی ئەوروپی) و (مێژووی هونەری خۆرئاوا) لەم مەڵبەندەیا خستوێتیە بەردەمی.. جیاوازیی گوتارەکان و بۆچوونی خاوەنەکانیان هەرچەند لێکەوە دوور بێت، ئەوە لە هەڵوێستی ڕەخنەییاندا بەرامبەر بە (بارودۆخی هونەر)، (بەدەزگاییبوونی هونەر) و (بەکەلوپەلکردنی بەرهەمی هونەری)، یەکدەگرنەوە. زۆربەیان لەئاست هرووژمی بەبازڕکردنی هونەر و هێنانەخوارەوەی پێناسەی نرخی بەرهەمی هونەری بۆسەر ئاستی (هێڵ و ڕەنگ و پڕکردنەوەی بۆشایی)، هەراسانن و بەگشتی دژی ئەو سیاسەتە کولتووریانەن، کە دەوڵەتەکان و دەزگا هونەرییەکانی وەك مۆززەخانەکان، پەیڕەوی لێدەکەن. هەروەها بەتوندی دژی ئەوەن لەسەر ئاستی دابەشکردنی شوێن و جوگرافیاوە باس لەئەزموونی ئیستاتیکی هونەر بکەن(٢٨).

ئامانجی ئەم خوێندنەوانە ئەوەیە کەدەیەوێت فراوانیەکی زیاتر بداتە ئاسۆ شیکاریەکانی خۆی و مانای (چەمکی هونەر و ئەزموونی ئیستاتیکی) بەپێویست لەناو سنووری (هونەری ڕەسمی) و (مێژووی هونەری ئەوروپی)دا نەهێڵێتەوە، کە سنوورێکە مانای چەمکی هونەری بەدەوری خۆیدا قفڵ کردووە. بەمانایەکی دیکە ئەم تێڕوانینە نوێیە دەیەوێت لە سەکۆی (لەخۆڕوانین)ـەوە بیەڕێتەوە بۆ دەشتایی (ڕوانینە ئەویتر) و بۆئەمەش چەمکی نوێ و ڕەهەندی نوێ بۆ (ڕوانینەکانی) بەرهەم بهێنێ.. ئەم شوێنگۆڕکێ و ڕوانینەش لە (ئەویتر)، جگەلەوەی (خودئاگایی گوتاری ئیستاتیکی) پیشاندەدات، یان بەگوتەی نووسەرێك نیشانەی (گەشەکردنی ئەخلاقیانەی تیۆرە)یە، ئەوە خۆئامادەکردنێکیشە بۆ تێگەیشتن لەبەهای (جیاوازییەکان) و گرنگیدان بەتایبەتمەندیی ئەزموونە ئیستاتیکییەکان لەپەیوەندییان بە پێشزەمینەی کولتووریی خۆیانەوە. پاشانیش لەو پەیوەندییەدا کە دەیانبەستێ بە پانتاییە گەردوونیەکان و هەمەڕەنگی کەلتوورەکانەوە..

ڕەنگە لەم بارەیەوە تیۆرەکەی فەیلەسووف ئیتالی ماریۆ پیرنیۆلا (٢٩) جێگەی گرنگیپێدانێکی زۆر بێت، کە لەزنجیرەیەك باسدا خستویێتیە ڕوو. خاڵی جەوهەری لە فەلسەفە ئێستاتیکەیەکەیدا ئەوەیە کە دەڵێت: دەبێت ئیتر: (تۆپۆلۆژیای هونەر لەسەر بنەمای ئیتنۆئیستاتیکا *ethnoaesthetics* وەبێت). بۆئەوەی زەمینەیەکی ڕوونتریشمان بۆ تێگەیشتن لەم خستنەڕووەی ماریۆ بێتە دەست، هەوڵدەدەم لێرەدا گرنگترین خاڵە تیۆریەکانی کورت بکەمەوە.

## - ئیتنۆئیستاتیکا و هونەری (ترانزێت)

ماریۆ، سەرەتا ڕەخنە لەو بۆچوونە دەگرێت کە لە فەلسەفەی هونەردا بۆچوونێکی نەگۆڕ بووەو دەڵێت، لەماوەی دووسەد ساڵی ڕابردوودا بیرکردنەوە لەهونەر پابەندی دۆزینەوەی پەیوەندی بووە لەنێوان هونەر و سەردەم، نیشتەجێکردنی مێژووییانەی بەرهەمەکان و ڕیزکردنی ئاراستە هونەرییەکان، یاخود ئیشکردن بووە بە زاراوەگەلی وەك (پۆست) و (تازە). هەموو ئەمانەش هەڵگری تێڕوانینێکی (مێژوویی)ن بۆ چالاکی هونەری و هەوڵدانن بۆ بەرهەمهێنانی مێژوویەکی (یەکدەست) بۆ هونەر. ئەم بۆچوونەش چیدی ناتوانێت بەشێوەی جارانی بەردەوامبێت، چونکە بەرفراوانبوونی ڕەهەندی شوێن و کاتیگۆریەکانی (هاوکاتیبوون) (synkron) لە توێژینەوەدا، مەرجی تازەیان سەپاندووە. ئەم مەرجانە ناچارمان دەکەن ئەمجارەیان لەڕوانگەی (تەبایی ژیانی پێکەوەیی)ەوە بیر لەهونەر بکەینەوە، نەك لەڕوانگەی (تەبایی ڕیزکردنی ڕەوتەهونەرییەکان)ەوە و خانەبەندیکردنیان لەناو مێژووی ژیانی گەلاندا. بەمانایەکی دی ئەوەی لەمەودوا سەرنجڕاکێش دەبێت (مێژووی هونەر) نییە کە تیایدا هەوڵدراوە تەباییەك بدرێتە قوتابخانەو ڕەوتە هونەرییەکان و نیشتەجێکردنیان بەپێی ڕیزبوونیان (لەکاتدا (diakron) (٣٠)، بەڵکو بەدیهێنانی تۆپۆلۆژیایەکی هونەرییە، کە (بتوانێت زۆرترین شێوەی جیاوازیی و زۆرترین دژایەتی ئەزموونە هونەریەکان لەڕوانگەی بەردەوامی و سنوورەکانیانەوە، بخوێنێتەوە و ڕاڤەیان بکات)(٣١).

یەکەمین زەمینەش بۆ ئیشکردنی ئەم تۆپۆلۆژیا نوێیە بەرەو ڕووی ئەزموونی ئیستاتیکی گرووپ و کەمەنەتەوەییەکانمان دەکاتەوە: کە ئەزموونێکە دەیەوێت پردێك لەنێوان شوێن و فۆرمەکان، مەڵبەند و بەکارهێنانی زمان و لەنێوان زۆن و شێوازە هونەرییەکاندا هەڵبەستێ. بەم پێیەش تۆپۆلۆژیای هونەر دەبێت لەسەر بنەمای (ئیتنۆئیستاتیکی)یەوە بێت، کە (بنەمایەکە پێش هەمووشتێك ئاماژە بۆ ناسنامەی تایبەتی کولتوورەکان دەکات، لەخەسڵەتە جیاکارەکانیان دەکۆڵێتەوەو لەخەمی پارێزگاریکردن و ڕێز لێنانەوەیاندایە. هەموو ئەمەش بەس نیە، بەڵکو زۆریش گرنگە هەل ومەرجی پێویستیان بخرێتە بەردەست، ئیمکانیەتی ڕاگواستنیان بۆ بڕەخسێنرێ و لەهەمان کاتیشدا هانی بەکارهێنانیان بدرێت)(٣٢). بەمانایەکی تر، ئەم تۆپۆلۆژیا تازەیە کۆمەڵێ پرسیاری نوێشی لەگەڵ خۆی هێناوە کە ناشێت بەهۆی گەڕانەوەمان بۆ (سەرچاوە)ی ئەزموونە هونەریەکان و دەستنیشانکردنی (ماڵی هەمیشەییان)ـەوە، وەڵامیان بدەینەوە. چونکە گەڕانەوە (بۆ سەرچاوە)ی سەرەکیی ئەزموونە هونەرییەکان، خۆی لەخۆیدا بریتیە لە خنکاندنیان لەیەك شوێندا کە هەم بۆیان دەبێتە لانك و هەم بەگۆڕیش..

ماریۆ پێیوایە چیدی ناتوانرێت تێگەیشتن لە ئەزموونی هونەری بەهۆی پابەندبوون بە(سەرچاوە هەمیشەییەکان)، (ڕەگوڕیشەچەسپاوەکان) و گێڕانەوەیان بۆ (ماڵی نەگۆڕی خۆیان) بێتە دەست، چونکە ئەمکارە دەبێتە هۆی کوشتنی ئەو دینامییەت و جوڵەیەی هونەر دەکاتە هونەرێکی گەڕۆك و کۆچەر. لەبەرئەوەی ئەزموونی هونەری لەئێستادا بەتوندی پابەندە بەجووڵە و کۆچکردن و شوێنگۆڕکێ، خۆ دەربازکردن و خۆ تازەکردنەوەوەی بەردەوامەوە. چونکە (تەنیا لەم ڕێگەیەوە دەتوانین خۆمان لەو ڕاڤەکردن و ئەنتۆلۆژیا هونەریە ڕزگار بکەین، کەهەرئەوەندە دەزانێت چەند بەرهەمێکی هونەری دەستەبژێر بکات و دابڕیانکات و تا ئاستی ڕەها، ڕەوایەتیان بداتێ. هەرچی بەرهەمەکانی تریشە لەناو چوارچێوەیەکی بێ پەیوەندی بەو دەوروبەرەوە بناسێنێ کە لێوەی هاتوون)(٣٣).

مەبەستی ماریۆ لەو ئەنتۆلۆژیایە ئەو تێڕوانینەیە کە لەسەدەی نۆزدەیەمەوە لەخۆرئاوا، هەمیشە بەدوای یەك ناسنامەی خاوێن و نەگۆڕدا بۆ هونەر گەڕاوە و ئەمەش وای لێکردووە نەتوانێت میکانیزمەکانی مارگینالیزەکردن و بەپەراوێزکردنی هونەری کەلتوورەکانی تر ڕەتبکات. ئەمەش خەسڵەتێکە پەیوەندی بە سرووشتی (نیشتەجێبوو/ثـــا بـــت)ی ئەو ئەنتۆلۆژیایەوە هەیە. بەڵام لەئێستادا هونەر خەسڵەتی (جێگۆڕکێ و کۆچەری و گەڕۆکی) بەخۆیەوە گرتووەو ئەمەش وادەکات ئاسان نەبێت هونەر لەناو یەك ناسنامەدا خۆی سەقامگیر بکات.. (کۆچەرەکان هەرگیز بەدوای سەرزەوییەکی هەمیشەییدا ناگەڕێن، بەڵکو هەمیشە خەون و هیوای دۆزینەوەی ئەو عەردانە لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن کە هێشتا نەدۆزراونەتەوە).. لێرەشەوە بیرکردنەوە لە هونەر چەند ئەرکێکی تازەی بۆ هاتۆتە پێش، کەیەکێك لەوانە ئەوەیە (بیر بکاتەوە لە ئیمکانی گونجاندن و متووربەکردنی کولتوور و ڕەهەندە هونەرییەکان بەیەکتر، کە بتوانرێ بەڕوونی لەیەکتر جیا بکرێنەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی گۆڕانی ڕەهایان تێدا هاتبێتە دی). لێرەدا جەستە هونەری و کولتوورییەکان پاش و پێش ناخرێن، بەڵکو دەچنە ناو یەکەوە بەبێ ئەوەی لەیەکتردا بتوێنەوە..

ماریۆ ڕازی نابێت بەوەی ئەم جوڵەیە لەهونەری هاوچەرخدا بە(کۆچ) یاخود گواستنەوە(ترانسپۆرت) ناو بەرێت، بەڵکو ناوی دەنێت (ترانزێت) و بەمجۆرەش ئەمەمان بۆ ڕووندەکاتەوە: (کۆچ، *واتە ڕۆیشتنی خودێك کە لە خاڵی سەرەتاوە دەبزوێت بۆ شوێنی مەبەست. لەکاتێکدا ترانسپۆرت بریتیە لەبردنی(یاخود بزواندنی) بابەتێك لە شوێنی خۆیەوە بۆ شوێنێ کە* ***بڕیاری لەسەر دراوە بۆی بچێت***)(٢٤).بەپێچەوانەی ئەمەوە، (ترانزێت) بریتیە لەشوێنی هاوبەشی نێوان دوو خاڵ، هەم شوێنی گەیشتنە و هەم شوێنی لێوە دەرچوون. شوێنی گۆڕانە لەنێوان دوو خاڵدا کاتێ هەردووکیان ئامادەبن..

بەڵام مەبەست چییە کاتێ دەگوترێت هونەر (چالاکیەکی ترانزێتی)یە؟ و ئەم زاراوەیە چیمان لەسەر هونەر بۆ ڕووندەکاتەوە؟

ـ زمانی ماریۆدا، ئایدیای (بەترانزێتکردن)ی هونەر، چەند خەسڵەتێکی یستاتیکی گرنگی ئەو هونەرەمان بۆ ئاشکرا دەکات: یەکەمیان ئەوەیە کە یشتر باسمکرد و بە ڕزگاربوون لە (ئەنتۆلۆژیا دێرینەکەی هونەر) ناوی برا، کە ەنتۆلۆژیایەکە، دێت تا لەڕێگەی موتڵەقیەت بەخشین و کاتیگۆریزەکردنی ەندێ بەرهەمی هونەری و نەریتی ڕەوەتە هونەرییەکانی ناو شارستانیەتی ۆرئاواوە، هەموو بەرهەم و نەریتی هونەری شارستانیەتەکانی دی دەخاتە ەراوێزەوە. خەسڵەتی دووەمی ئایدیای بەترانزێتکردنی هونەر ئەوەیە، کە ەڵدەستێ بە پەیوەندی دروستکردن، تێهەڵکێشکردن و گرێدانی ئەزموونە یستاتیکیە جیاوازەکان بەیەکترەوە، نەك هەوڵدان بۆ(باتێکردن) و بە شان وباڵ ەڵدانی (شاکارە هونەرییەکان) و بەرهەمەکانی لوتکە، وەك ئەوەی لە ەنتۆلۆژیای هونەردا دەیبینین. بەمانایەکی تر، ئایدیای بەترانزێتبوونی هونەر بریتیە لەنزیکبوونەوە لەو شتانەی کە (ناکامڵ و بەکار نەهاتوون) و لە ئەنجامی (هەڵنەبژاردن)ـەوە فڕێدراون و لەکار خراون.. ئەم ئایدیایە هەوڵی خۆی بۆ ئەوە تەرخان ناکات تا بەرهەمە هونەرییەکان لەژێر یەك ڕەوت و نەریتدا ناونووس بکات و هەمان ئاستی ژیانیان بۆ لەپێشچاو بگرێت. بەڵکو هەوڵی خۆی بۆ ئەوەیە، کە شتە ئامادەکان بگوازێتەوە، لەیاسای ڕەوت و قوتابخانەکانیان دابماڵێت و بەرزیان بکاتەوە بۆ بارودۆخێك کەتیایدا شتە (چاوەڕواننەکراو) و (دووبارە نەبووەکان) سەرهەڵبدەن(٣٥).

بەم پێیەش، ماریۆ پرسیار دەکات: ئەگەر هونەر چالاکیەکی ترانزێتی بێت ئەوە، هەموو سنوورە (پێش ـ هونەرییەکان)، (پارا ـ هونەرییەکان)، خۆڕسکی و عەفەوی و (پۆست ـ هونەرییەکان) زۆرترین سەرنج ڕادەکێشن و گەورەترین ئیزعاجکردنیش (پرۆڤۆکەیشن) لەگەڵ خۆیان بەرهەم دەهێنن. چونکە لەکاتێکدا ئەنتۆلۆژیای هونەر تەنیا گرنگی دەدا بە (ئازادی لە داهێنان)دا، ئەوە ئایدیای بەترانزێتبوونی هونەر گرنگییەکی زۆر دەدات بەو (فشار و ستەم)ـانەی کە تەکنیك و میکانیك و پیشەکان دەیخەنە سەر پرۆسەی داهێنان. لەکاتێکدا ئەنتۆلۆژیای هونەر لەناو (بەرهەمە شاکارەکان)دا بۆ (زانین)و (حەقیقەت)ێکی

دڵنیاکەری عەقڵانی دەگەڕێت، ئەوە ئایدیای هونەری ترانزێتی لەبەرهەمە بەناو (سەرەتاییەکان (*primitiv*) و بەرهەمی (منداڵان) و (شێت) و (بیمارەکان)دا بۆ ئەو ڕەگەزە ناعەقڵانی و (ناڕاست) و (نەزانین) و دڵنیانەبوونانەدا دەگەڕێت، کەچاوەڕواندەکرێت لەو بەرهەمانەدا هەبێت.

لەم ڕووەیشەوە چەمکی (ئیتنۆئیستاتیکا)، چەمکێك نییە بۆ بەراووردکردنی ئەزموونی هونەری کەلتورە جیاوازەکان بەیەکتر و جیاکردنەوەیان، بەڵکو چەمکێکە بۆ لەبەرچاوگرتنی خەسڵەتی تایبەتی هەر ئەزموونێك لە(سەربەخۆیی خۆیدا)و بەپێی ئەو ئاسۆ جوانکاریانەی لەگەڵ خۆی دەیانهێنێ.. ڕەنگە بتوانین بڵێین، چەمکێکە بۆ سەرلەنوێ چاوگێڕانەوەو بیرکردنەوە لەپرۆسەی (بەجیهانیبوون) و فراوانکردنی ئاسۆکانی کولتووری هاوبەشی مرۆڤایەتی بەیارمەتی ئیستاتیکای فەلسەفی.. هەروەها ئەم چەمکە پشتیوانەیەکی تیۆریشە بۆ (خوێندنەوە)یەکی سەربەخۆی هونەری تاراوگە و یارمەتیدەرە بۆ خەملاندنی زمان و چەمکی کارا بۆ ئەو خوێندنەوەیە.. چونکە خوێندنەوەی هونەری تاراوگە خوێندنەوەیەکە نایەوێت ببێتە بەشێ لەمێژووی دەزگاکان، یان دەسەڵاتیان فراوانتر بکات و ببێتە فەسڵێ لەو ئەنتۆلۆژیایەی ئەو دەزگایانە لێوەی دەڕواننە بەرهەمی هونەری.

** ** **

لێرەشەوە خوێندنەوەی ئێمە بۆهونەری تاراوگە، لەگەڵ هەموو خاڵە هاوبەشەکانیشدا، هێشتا لەگەڵ ئەو خوێندنەوەیەدا جیاوازە کە ئیستاتیکای فەلسەفیی هاوچەرخ (وەك لەنمونەکەی ماریۆدا بینیمان) بۆ ئەنتۆلۆژیای خۆی دەیکات. چونکە ماریۆ لەناو نەرێتێکی فەلسەفی و ئیستاتیکییەوە داوای گۆڕان دەکات بۆ فراوانکردنی پاناتیی چەمکەکانی هەمان نەرێت. لەکاتێکدا ئێمە دەمانەوێت سەرەتای خوێندنەوەیەکی ئیستاتیکی بهێنینە بەرهەم کەبتوانێت تاراوگە بەپێی مەرجە ئیستاتیکەکانی خۆی بخوێنێتەوەو توناکانی بتەقێنێتەوە. خوێندنەوەکەی ماریۆ لەگەڵ هەموو خاڵە درەخشانەکانیشیدا کە دەچنە خزمەت مەبەستەکانی ئێمەوە، هێشتا خوێندنەوەیەکە لەناو نەرێتێکی

ئیستاتیکی جێگرتوودا، لەکاتێکدا خوێندنەوەی ئێمە جگە لە بەرهەمەکانی هونەری تاراوگە هیچ زەمینەیەکی جێگرتووی نەگۆڕی نییە.. ماریۆ و تیۆریسینەکانی وەك ئەو، لە(ناو) کولتووری خۆیان و لەپێناوی هەمان کولتووردا، داوای مافی هونەری بۆ (ئەویتر) دەکەن و مەودای فیکری و ئیستاتیکی خۆیان بە باسکردنی (ئەویتر) دەوڵەمەند دەکەن، لەکاتێکدا ئێمە وەك تاروگەکراوێك مەحکوومین بەوەی باس لە ئەزموونە ئیستاتیکییەکانی (خۆمان) بکەین و هتد..

بۆیە دەبێت بەشێوەیەکی وردتر پەیوەندی خوێندنەوەکەمان بە هونەری تاراوگەوە ڕوونبکەینەوە، کەلەهەمان کاتیشدا خستەنە ڕووی خاڵی (هاوبەش و جیاوان)ی دیکەیە لەنێوان خوێندنەوەکەی ئێمەو خوێندنەوە ئیستاتیکیە فەلسەفیەکانی تریشدا:

ئەگەر هونەری تاراوگە هێزی خۆی لەپەراوێزبوونیەوە بۆ هونەری ڕەسمی و هونەری جێگرتوو بهێنێتە دەست و خەسڵەتەکانی ببنە هۆی (بەخۆداچوونەوە)ی سیستەمە چەسپاوەکانی هەڵسەنگاندن، ئەوە هەر خوێندنەوەیەك کەدەیەوێت باس لەم هونەرە بکا، دەبێ (پەراوێزبوونی خۆی لەپاڵ هونەری تاراوگەدا قەبووڵ کردبێ).. ئەمەش بەمانای ئەوەیە، زمانی ڕەخنە و ئەو دەستەواژانەی لەخوێندنەوەی خەسڵەتەکانی ئەم هونەرەدا بەکاردەهێنرێن، ناتوانن هیچ زیادەیەك بخەنە سەر (تاراوگەییبوونەکەی))، یاخود لەو خەسڵەتانە کەم بکەنەوە. خوێندنەوە ناتوانێت مانایەکی زیاتر و ڕاشکاوتر بڵێ لەوەی کە خودی ئیشە هونەرییەکان بەیانی دەکەن و ناشتوانێت ئەو هونەرەمان پێئاشنا بکات، ئەگەر لەهەمان کاتدا ئاشناشمان نەکات بەخۆی.. هەر زمانێ کە دەیەوێت بناخەی خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانە بۆ هونەری تاراوگە دابڕێژێت و لەسەر چۆنێتی ئەو شتەی لەو هونەرەدا هەیە گوتارێك بهێنێتە ئاراوە، ئەوە لەپێشەوە خۆی بەوە مەحکووم کردووە، گوتارێك بێت لەدەرەوەی گوتاری ڕەسمی و لە دەرەوەی سیستەمی هەڵسەنگاندنە چەسپاوەکان.

لێرەشەوە چارەنووسی هونەری تاراوگە دەبێتە چارەنووسی خوێندنەوەکانیش بۆ ئەو هونەرە. چونکە بەوەی ئەو خوێندنەوەیە (هونەری تاراوگە) دەکاتە بابەتی خۆی، دەکەوێتە دەرەوەی کایەی (ڕەخنەی هونەری جێگرتوو)یشەوە. واتە خوێندنەوەکانیش دووچاری هەمان ئەو بەربەستانە دەبن کە خودی هونەری تاراوگە لەناو کایە ڕەسمیەکانی هونەر و دەزگاکانیدا دووچاریانە. بەم پێیە دەبێت خوێندنەوە ڕەخنەییەکانیش هەندێك لەو شەڕانە لەکایەی (ڕەخنەی هونەری ڕەسمی)دا بکەن، کە هونەری تاراوگە لەکایەی (هونەری بەدەزگابوودا دەیانکات. چونکە لەناو کایەی ڕەخنەی هونەریی ڕەسمیدا، هەمان ئەو پرنسیپە جێگرتووانە ئامادەن کە میکانیزمەکانی سانسۆر، بەبازاڕکردن، ڕواڵەتگەرایی و پرۆفێشناڵیزم دەیانبات بەڕێوە. لەوێش هەمان ئەو ئێکسپێرت و شارەزا پیشەییانەی ڕەخنە هەن، کەوەك مووچەخۆری ڕۆژنامە و گۆڤار و کەناڵەکانی تەلەڤزیۆن و بڵاوکراوەی مۆزەخانە و گالێرییەکان دامەزراون. ئەمانیش بەهەمان ئەو زەخیرە زمانییەوە تەعبیر لەهونەر دەکەن کە زمانی ڕەسمیی دەربڕینە. ئەمانیش لەکایەیەکی داخراودا خۆیان دەبیننەوە کە لەشەڕی بەردەوامی ناخۆیی و دەرەکی خۆیدایە لەسەر فراوانکردنی پێناسەکردنەکان و بەدەستهێنانی ناوبانگ و سومعەی زیاتر بۆ دەزگاکانی..

بۆیە هەموو خوێندنەوەکان بۆ هونەری تاراوگە، سەرەتا لەناو ئەو ڕۆژنامەو گۆڤار و بڵاوکراوانەدا لەدایك دەبن کەخۆیان لە پەراوێزدان و بەتیراژی کەم و ئاستی تەکنیکی هەژار دێنە چاپکردن. لەلایەن ئەو ڕۆژنامەنووس و نووسەر و ڕەخنەگرانەوە دەنووسرێن کە نووسین سەرچاوەی ژیانیان نییە.. کەنووسینەکانیان، بەهۆی ئەوەی لە کەناڵەکانی دەربڕینی پەراوێزەوە هاتوون، بەساناهی نابنە سەرچاوەی بنکەکانی فێرکردن و خوێندن. هەروەها نووسینەکانیان بە نازانستی، غەیرە پرۆفێشناڵ و بێ پرنسیپ تاوانبار دەکرێن و مەحکوومیشن بەوەی بەزمانێکی ستانداردی جیهانگرەوە نووسرابن..

هەموو ئەمانە پێماندەڵێن، دەبێت بۆچوونەکەی (سۆزان سۆنتاگ) لەمەڕ ئەرکی ڕەخنەگری هونەرییەوە سەرلەنوێ دابڕێژینەوە، کە لەسەرەتای ئەم باسەدا

ئامارژەم پێکرد و تا بەشێکی زۆری ئەم لێکۆڵینەوەیەش ببووە سەرمەشقی من لە ڕاڤەکردنەکانمدا بۆ پرۆژەی (وشەو ڕەنگ) وەك نمویەك بۆ هونەری تاراوگە. ئەو بۆچوونەش دەیگوت: *پێویستە ئەرکی ڕەخنەگر ئەوەبێ کە پیشانی بدات ئەو شتەی هەیە، چۆن هەیە. یان بەشێوەیەکی ڕاشکاوتر: پیشانی بدات ئەوەی کە لەبەرهەمی هونەریدا هەیە چییە، نەك مانای چییە.* ئێستا دەڵێم پێویستە ئەم بۆچوونە سەرلەنوێ دابڕێژینەوە چونکە: خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی هونەری تاراوگە، نەك هەر پێویستە هەوڵدانێك بێت بۆ پیشاندان و ئاشناکردنی بەرهەمەکە وەك ئەوەی کەهەیە، ***بەڵکو دەبێت هەوڵدانێکیش بێت بۆ ئاشناکردنی خۆیشی وەك ئەوەی لەپەیوەندی لەگەڵ ئەو هونەرەدا هەیە.*** یان بەشێوەیەکی ڕاشکاوتر: دەبێت لەپاڵ پیشاندانی (چییەتی) هونەری تاراوگەدا، چییەتی خۆیشی ئاشکرا بکات. چونکە خوێندنەوەی هونەری تاراوگە، نەك هەر لەچوارچێوەی خوێندنەوەیەکی (ڕەخنەیی)دا نامێنێتەوە، بەڵکو تێکەڵیش دەبێت بە چەمکە فەلسەفیەکان و لە تیۆریزەکردنی ئیستاتیکای فەلسەفیشدا بەشداری دەکات.

١٠و١١ ١٩٩٨ لەندەن



## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١. لێرەدا چەمکی هونەری شێوەکاریی لەبەرامبەر سەرجەمی ئەو هونەرە خۆماڵییەدا بەکاردەهێنم کە بەدرێژایی مێژوو لەکولتووری ئێمەدا پراکتیزە کراوەو بەتایبەتیش لەهونەری قاڵی، بەڕە، لباد، جاجم، پۆپەشمین، سرکەیی و بەرماڵ چنیندا ڕەنگی داوەتەوە. هەروەها هەمان شێوەی مومارەسەکردنی ڕەنگ و هێڵ و فیگەر لە نەخش و نیگاری سەر دەرگا و بنمیچی ماڵان و ڕازاندنەوەی دەستنووس و گەلێ شوێنی دیکەشدا هەیە، ئەمە جگە لە هونەری خاڵکووتان و ئارایشی ڕووخسار و دەست و پێ بەهۆی خەنە و ڕەنگە خۆماڵییەکانەوە. دەکرێ هەموو ئەمە لەژێر سەردێڕی بەکارهێنانی خۆماڵیانەی ڕەنگدا کۆبکەینەوە.

٢. بەڵام چەمکی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن لە ژیانی مرۆڤی کوردا، چەمکێکی سەدەی بیستەمییە و یارمەتیمان دەدات وەك کایەیەکی سەربەخۆ باس لەهونەری ناوبراو بکەین. سەرەتاش ئەم چەمکە تەنیا بۆ شێویەکی هونەری وێنەکێشان بەکار هاتووە کە هونەری هاوشێوەسازییە(تەقلید). بەپلەی یەکەمیش هاوشێوەسازی دیمەنەکانی سرووشت و دیاردە کۆمەلایەتیەکان.. بەمانایەکی تر چەمکی ناوبراو ناونیشانێکی بەرفراوانەو توانیویشێتی هێدی هێدی لەپرۆسەی گەشەسەندنی خۆیدا زۆربەی چالاکیە هونەرییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی: (شێوەکانی پەیکەرتاشی، هەڵکۆڵین، گرافیك و هتد) لەژێر سێبەری خۆیدا کۆبکاتەوە.

٣. بۆنمونە ئەوەی سەرنجی دەزگا کوردییەکان لەسەر هونەر ڕادەکێشێ، بریتییە لە ڕەنگدانەوەی کارەساتەکانی وەك هەڵەبجە و ئەنفال لەئیشی هونەرمەندەکاندا، نەك گرنگیدانیان بەڕەوتی سەربەخۆی هونەر لە کوردستان. ئەمەش پێماندەڵێت کە هونەر پێناسەی خۆی نەك بەهۆی ئەو نرخ و بەهایانەوە کەهەڵگریانە، بەڵکو بەهۆی نوێنەرایەتیکردنی نرخ و بەهای جیهانی دەرەوەی خۆیەوە بەدەست دەهێنێ. ئەم دیدە لەو کاتەلۆگە ڕەنگینەشدا بەرجەستە بووە کە ئەنستیتوتی کورد لەپاریس بەناوی (هونەر و ئەنفال)ـەوە بلاویکردۆتەوە. جێی سەرنجە کە زۆرن ئەو هونەرمەندە شێوەکارانەی کوردیش کە لە گفتوگۆو لێدوانەکانیاندا، پێناسەی ئیشەکانیان بەئاماژە

کردن بۆ بارودۆخی سیاسی کوردستان، دەکەن و بەمەش چاودەپۆشن لە ئەزموونی ئیستاتیکی و بەرهەمهێنانی تێڕوانینێکی فیکری لەسەر هونەر.

٤. بیری ئیستاتیزەکردنی سیاسەت، یاخود جێکردنەوەو دەربڕینەوەی مەبەستە سیاسیەکان لەچوارچێوەیەکی ئیستاتیکیدا، لەلای والتەر بنیامین بەتوندی بەستراوە بە خاڵی بەرپاکردنی(شەڕ)ەوە. چونکە: (شەڕ و تەنیا شەڕ دەتوانێت ئامانجێك بۆ بزووتنەوە بەکۆمەڵییەکان دەستنیشان بکات بەبێ ئەوەی سیستەمی کۆنی پەیوەندیەکانی خاوەندارێتی گۆڕانی بەسەردا بێت). فاشیزم ئەو ئایدیۆلۆژیە بوو کە دەیویست (مۆبێلیزەی پرۆلیتاریا بکات و جەماوەر بتوانن خۆیان دەرببڕن، بەڵام بەبێ ئەوەی بەمافی خۆیان بگەن). بەم پێیەش هونەر نەك هەر دەبێتە پانتاییەك بۆ دەربڕینی ئەزموونی ئیستاتیکی ژیانی مرۆڤ، بەڵکو دەبێتە هۆکارێ بۆ جوانکردنی ئەو سیاسەتەی ئامانجی وێرانکردنی ژیانە لەڕێگەی بەرپاکردنی شەڕەوە. تێگەیشتنی فاشیزمانە لەهونەر، بەشێکە لەسرووشتی هەموو ئەو ئایدیۆلۆژییە دەسەڵاتدارانەی وەك بەعس کە مەیدان و شوێنە گشتیەکان، بەرنامەکانی ڕاگەیاندن و پارکەکانی شار و تەنانەت کاتژمێرە دەستییەکانیش، بەدیمەنی وێنەی سەرکردە و پێشەوا و کەسایەتیە ئەفسانەییەکان و پەیکەرەکانیان دەڕازێننەوە. لەمەڕ چەمکی (ستاتیزەکردنی سیاسەت)ـەوە، بڕوانە:

Walter Benjamin: Kulturindustri, (udvalgte skrifter)- Claus Clausen, Rhodos, 1973: p. 85-86

٤ بڕوانە:

Soren kjorup: Menneskevidenskaberne, RUC: 1996, p. 175

٥. ئەم نامەیە کە لە ڕۆژی ٥/٨ی ١٩٩٨دا دارێژراوە، جگە لەزمانی کوردی، بەزمانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەرەنسی و عەرەبیش نوسراوەو دەکرێت وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی لە پێکهاتنی پرۆژەکەدا تەماشای بکرێت.

٦. دەلالەتی پانتاییە نووسراوەکان و شێوەکانیان لەمەش زیاتر دەڕوات. دەتوانین لەوێدا نەك هەر پلانی ئاگایانەی نووسەرەکانمان لەسەر چۆنێتی شکڵی دێڕەکاندا بۆدەرکەوێت، بەڵکو لەسەر ئاستی نائاگایشدا، ئەو ترسەیان دەبینینەوە لەچۆنێتی

مامەڵەکردنیان لەسەر ڕووبەری ڕەنگی. ترسێك کە ڕێگەیان پێنادات ئەو سنوورە پیرۆزە تێکبشکێنن کەلە پاناتایی کولتووری خۆیاندا لەسەر( تابلۆ) لایان دروستبووە. بێگومان ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو داخوازییەی لێرەدا ئاراستەیانکراوە بۆ بەکارهێنانی ڕووبەرە ڕەنگییەکان وەك مسۆدە.. پرسیار ئەوەیە: ئایا دەکرێت ئەو ترسە بە ترس لەئازادیی خۆدەربڕین لێکبدەینەوە؟! پێموایە ئەمە بوارێکی ترە بۆ سەرلەنوێ خوێندنەوەی ئەم ئیشانە.

بۆ ئاشنایی زیاتر لەمەڕ (خەت و ستاتیکا)وە، بەشی چوارەمی ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بەتایبەتی لە ل ٢٠٧ بۆ ٢٢٧ زۆر خاڵی وردی تیایە:

- ألبرتين گاور: تأريخ خط. برگردان ع. مخبر، ك. صفوى: تهران، ١٣٧٦، مركز.

ناونیشانی هەمان سەرچاوە بە ئینگیلیزی:

Albertine Gaur, A history of writing 1984, The British Library London

٧. ئایدیالترین جۆرەکانی پێکەوە بوون و تێکەڵبوون، تێکەڵبوونی ئیرۆتیکی دوو مرۆڤە بەیەکتر. ساتەوەختێ کە ئاستی پێکەوەبوون، هەموو دەمامکەکانمان پێدائەکەنێت و ڕووتمان دەکاتەوە. دەکرێت سەرجەمی ئەم پرۆژەیە سەرلەنوێ لەبەر تیشکی ئەم ڕوانینەشدا بخوێنرێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر زانیمان کاراکتەرە ڕەمزییەکانی (خەت و ڕەنگ)، لەمەدا گەلێ نهێنیمان بۆ ئاشکرا دەکەن: خەت بە درێژبوونەوەکەی، بە خۆداچەندنەکەی لەسەر ڕەنگ و بەو جۆرەی کەوەك تەلبەندێکی پارێزگاریکردنی ڕووبەری ڕەنگ دەردەکەوێت، هەڵگری ڕەگەزێکی نێرانەیشە. لەکاتێکدا ڕەنگ و نەرمیی شێوەی هێڵەکان بەهۆی پانبوونەوە و لەوێدابوونیان، وەك زەمینێکی کراوەی تیاچەندن و بەپیتبوونەوە دەردەکەون: زەمینی مێیەتی.. ئەم دابەشبوونە دوانەییە بەسەر نێرینەیی و مێیینەیدا لە خودی هێڵ و خەتی تابلۆکانیشدا (پێش لەسەر نووسینیان) دەبینرێنەوە: لە هەندێ کاتدا ڕەنگەکان کاراکتەری مێیینەیی بەخۆیانەوە دەگرن و لەهەندێکی تریشدا هێڵەکان دەبنە ڕەگەزی نێرینە، یاخود بە پێچەوانەوە.

٨. بۆ ئەوەی تێرمی تاراوگە لەلایەن منەوە نەبێتە تێرمێکی ئامادەی سەپاو بەسەر کارەکاندا، دەمەوێ ئاماژە بکەم بۆ گفتوگۆیەك کەتیایدا ڕێبوار ئاگایی خۆیمان بەرانبەر بەسانەوەختی تاراوگە لە هونەردا بۆ ڕوون‌دەکاتەوە:

***پرسیار: دوورەوڵاتی وەکو بابەت تا چ ڕادەیەك لەکارەکانتا ڕەنگیداوەتەوە، چۆن باسی ئەزموونی دوورەوڵاتی خۆتمان بۆ دەکەیت؟***

***وەڵام: ئێمە لەهەندەراندا درەختی بێ ڕەگین، ڕەگ داکوتانیش کاتی دەوێت، قوربانی دەوێت. بۆئەوەی هەمیشە هەست بکەم ڕەگم لەخاکی وڵات ماوەو ماڵئاوایيم لێنەکردووە، هەمیشە ڕەنگ دادەنێم، هێڵ دەکێشم. هەرکاتێکیش ئەو هەستەم لانەما، ئەوکاتە هەستدەکەم لەدوورەوڵاتم.***

بڕوانە: گۆڤاری یەککگرتن: ژ ١٧/ ١٩٩٥،ل: ٣٦١

٩. بڕوانە:

١. Susan Sontag: Under saturns tegn, 1978 in: Tanke Streger (Essays om Walter Benjamin) Modtryk: Aarhus 1989, p. 20-21

١٠. ناوی کۆمەڵە شیعرییەکە بەمجۆرەیە: (احتفاً بالاشياء الواضحات الغامضات، ١٩٩٨ بيروت) وەرگێڕانێکی ناسکی کوردیی ئەم کۆمەڵەیە بەم ناونیشانە لەبەردەستایە: ئەدۆنیس: ستایش، و. لە عەرەبییەوە موحسین ئەحمەد عومەر. بڕوانە: گۆڤاری دەروازە، ژ: ٢، ١٩٩٤، ل: ١٨٤-١٩٣.

١١. بۆخوێندنەوەیەکی وردی دەلالەتەکانی (ڕازاندنەوەی میناتۆری) ئەم دوو وتارە گەلێك زانیاری گرنگیان تێدایە:

ـ اسعد عرابی: المفردات التشكيلية المتوسطية في الفن الاسلامي

ـ اسدالله شيرواني: الكلمة والصورة في الاسلام (هەردووکیان لەم گۆڤارەدا بڵاوکراونەتەوە: مواقف: ٤٦-١٩٩١ ص: ٨٩ - ١٤٣

١٢. جێی سەرنجە کە ڕێبوار لەژیانی ئاسایی خۆیشیدا، گرنگییەکی تەواو ئەدا بەکۆکردنەوەی شتە دانسقەو کەم وێنەکانی وەك دەسنووسی شاعیران، پۆستکارتی ڕەنگاوڕەنگ، ستامپی پەنجەمۆر، تێکستیل، پارچەدار، قیبلەنوما، زەرەبین، تاقمی هەندەسە، قەڵەمی جۆراوجۆر و هەروەها سێتی پیتچنینی چاپخانەو ئامێری کۆنی وەك کامێرای وێنەگرتن!

١٣. بڕوانە:

Adorno, T: Minima Moralia, (Ovest N. Larsen og Arno Victor N. Copenhagen 1987 p. 24

١٤. پۆستکارت یەکەمجار لە١ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٦٩ داهێنراوە. ساڵی ١٨٩٤ قەبارەی پۆستکارت بریتیبووە لە ٤ و٣لەسەر٤، بە ٣و سێ لەسەر ٤ ئینج. قەبارەی ستانداردی ئێستای پۆستکارت بریتیە لە ٥و ١لەسەر ٢ بە ٣و ١ لەسەر ٢ ئینج. بۆ سەرەتایەك لەمەڕ مێژووی پۆستکارت و جۆری بەکارهێنانەکەیەوە بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە:

-Robert Wall: Ocean liner Postcards 1900- 1945, Antique collectors Club. 1998 p: 9-10

- Encyclopaedia Britannica, William B. Publisher p 319

هەروەها بۆ تێڕوانینێکی نۆستالیژیانە و تاڕادەیەك ناڕەخنەگرانە، بەڵام ڕوونکەرەوەی گەلێ خاڵ لەسەر (یەکەمین پۆستکارتەکان، هونەرییبوونی پۆستکارت، پۆستکارت و هونەری شەعبی و وێنەی پەیامدار و دەربڕینی هەستیارانە لەسەر پۆستکارت) بڕوانە ئەم کتێبە:

- Richard Carline: Pictures in the Post (The story of the Picture Postcard and its place in the History of Popular Art) 1959, New edition . Gordon Fraser, London. 1971.

١٥. لەم بارەیەوە بڕوانە:

- Anna R. K: Sexualitet og

n & forskning 4/ 1997 imperialisme in Kvinder, k

١٦. نمونه دیارەکانی پەیامی ئامادەش بریتین لە: Hapy berth day

-Best wishis،

Just wishing You a lovely day

١٧. ئەو وتارەی یاکۆبسن هێلکاری و ڕوونکردنەوەکانی تێدا پێشکەشکردوون، بەم ناونیشانەی خوارەوەیە:

- زبانشناسی و شعرشناسی لەکتێبی (زبانشناسی و نقد ادبی)، برگردان: م. خوازان و ح. پاینده، تهران ١٣٦٩ ص: ٥٧- ٥٨.

١٨. ناوبردنی پۆستکارت بە (میدیا)یەك، هەر تەنیا نیشتەجێکردنی نیە لەناو سیستەمێکی ئالوگۆڕکردندا، بەڵکو ئاماژەکردنیشە بەڕۆڵی پۆستکارت وەك ئامرازێکی پەیوەندیکردنی ملیۆنان کەس بەیەکترەوە. بۆنمونە لە بەریتانیا و تەنیا لەماوەی یەك ساڵدا ژمارەی (٦٧٠٠٠٠٠) ملیۆن پۆستکارت فرۆشراوە. بڕوانە هەردوو ئەو سەرچاوەیەی لە پەراوێزی (١٤)دا ئاماژەیان بۆکراوە.

١٩. بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە:

- والتر بنیامین: نشانه‌ای به رهایی(مقالات) ت: بابك احمدی، نشر تندر، تهران ١٣٦٦، ل: ٢٠٨

Walter benjamin: Fortalleren og andre essays, Peter Madsen. - Gyldendal 1996, p. 45

٢٠. نامەکەی ڕێبوار سەعید، ٥/٨- ١٩٩٨.

٢١. فەیلەسووفی فەرەنسی (ژان بۆدریار) ئەم بارودۆخە ناودەنێ (Simulation) و بەمجۆرەش ڕاڤەی دەکات: (سیمۆلاشیۆن بۆمن ئەو دۆخە سەرسووڕهێنەرەی شتەکانە، کەتیایدا سەرچاوەکەیان و ئەو ئامانجانەی بۆیان دروستبوون بەسەریەکدا دارماون، یاخود نێوترالیزە بوون، کەچیدی ناکرێت بەهیچ جۆرێك پرسیار لەبارەی حەقیقەتەوە بکرێت، یاخود بەلای کەمەوە ئێمە ئیتر ناتوانین پرسیاری ئەوتۆ بکەین، چونکە چیتر هیچ شتێ نە

بەتەنیا ساختەیە و نە بەتەنیاش دروست). بەمانایەکی تر، چیدی ئێمە سەروکارمان لەگەڵ خودی واقیعدا (reality) نییە، بەڵکو لەواقیعێکی (وێنەیی بەرهەمهێنراو)داین.. هەموو شتێ بۆتە ئاڵوگۆڕ و هیچ پنتێکی جێگیر و چەسپاو نەماوە. هەموو جوڵەیەك یاریکردنێکە و بەشداریکردنێك لەو یاریەدا کە پێشتر یاساکانی بڕیاریان لەسەر دراوە. (هیچ بڕیارێکی سیاسی نەماوە، هیچ ڕایەکی گشتییش نییە کەمانایەك، یاخود چاوگێکی سیاسی مابێت. ئەوەی کەهەیە بریتیە لەو مامەڵەو سەودا ئاڵوگۆڕکارییەی لەسەر شاشەکانی وێنە دێتە ئەنجام. لەوێدا سەوداو ئاڵوگۆڕکردن دێتە ئەنجام. لەوێدا یاری دەکرێت.. هەموو شتێ بۆتە یارییەکی تەلەفزیۆنی و ئاڵوگۆڕکاری و لەمڕۆشدا هەموو شتەکان دەکەونە ژێر هەمان کاتیگۆرییەوە، هەڵبەت ئەمە ئەگەر خۆیان لەهەمان شوێنەوە سەریان دەرنەهێنابێت). ئەم واقیعە بەرهەمهاتووەش (خۆی لەبری واقیعی ڕاستەقینە داناوە)و خۆی سەرچاوەی خۆیەتی و تەنیا ئاماژەش بۆ خۆی دەکاتەوە. واقیعێ کە بۆدریار ناوی دەنێت (Hyperreality) و (بەرزەواقیع) و واقیعێ کە (واپیشاندەدات) کە واقیعە.. بۆ درێژەی ئەم تێزە گرنگەی فەیلەسووفەکەمان بڕوانە ئەم دوو وتارەی خوارەوە:

Virusteori- En fri talestrom, Hinsides det sande og det falske eller Billedets onde €nd in{Billedets onde €nd}Det KGL. Dansk Kunstakademi, Kopenhagen 1990, pp 7- 16. - pp.130- 141+

٢٢. یەکێك لەڕادیکاڵترین و وردترین ئەو ڕەخنانەی لەمبارەیەوە بەرهەمهاتبێت، ڕەنگە ئەو وتارەی (دۆناڵد جوود)ی بێت کەڕاستەوخۆ پەنجە دەخاتە سەر گەلێك لەو قەیرانانەی هونەری ئەوروپی لەئێستادا بەدەست ڕەوتی هونەری پشتگیریکراو[ ]ەوە، گیرۆدەیان بووە. جوودی سەرەتای وتارەکەی بەمجۆرە دەستپێدەکات: (زۆر لەپیشانگا گەورەکان نەلەسوودی هونەر و نەلەخزمەتی گشتدان. هەرگیز تێگەیشتنێکی ڕاست لەسەر بارودۆخی ئێستای هونەر ناخەنە ڕوو... هونەرمەندەکانیش زۆربەکەمی کۆنترۆڵیان هەیە

بەسەر ئیشەکانی خۆیانداو تادێت ئەم کۆنترۆڵەش کەم و کەمتر دەبێتەوە).

ئەمەش پەیوەندی هەیە بەوەی ئەمڕۆ چی لەهونەر چاوەڕێدەکرێت؟ ئەوەی ئەمڕۆ لەهونەر چاوەڕێدەکرێت و زۆربەی هونەرمەندەکانیش بڕوایان پێی هێناوەو مووچەی لێدەخۆن بریتیە لەوەی، هونەر ببێتە کەناڵێکی ڕاگەیەنەر و ڕوونکەرەوە، ببێتە ئامرازی گەیاندنی زانیاری: (گەیاندنی زانیاریش هونەر نیە. مووچە وەرگرتن هونەر بەرهەم ناهێنێ... گەیاندن لەهونەردا هەمیشە فێڵ و ساختەیەکە، چونکە ئەوەی دەگەیەنرێت بریتیە لەڕوانگە و خاڵی هەڵسەنگاندنی پیشانگا ڕێکخەرەکان: (پسپۆڕەکانی هونەر، تابلۆناسەکان، هونەرکڕەکان)، کە دەیانەوێت بەردەوام لەگەڵ شەپۆلی مۆدێلەکانی بازاڕدا بڕۆن. باشترین بەرهەمی ئەمکاتە هەرگیز لەئێستادا پیشان نادرێت. پیشانگارێکخەرەکان، ئەو هونەرە دەدەن بەکردن کەخۆیان مەبەستیانە... ئەوان وادەزانن هونەر تەنیا سەکۆیەکە بۆئەوەی ئەم ستایل لەسەری جێگەی ئەویتر بگرێتەوە).

هۆی ئەمەش ئەوەیە هونەریش بۆتە بەشێك لەسیستەمێکی گەورەتر و خشتێکە لەپڕکردنەوە و پتەوکردنی ستراکچەرێکی بەرفراوانتردا. هەموو هەوڵی پیشانگاو مۆزەخانەگەورەکانیش بۆ ئەوەیە ئەو ستراکچەرە گەورەترو فراوانتر بکەن: (پیشانگاگەورەکان هەوڵدانن بۆ نیشاندان و سەلماندنی ئەوەی کەهێشتاش (وێڕای هەموو شتێك)، دەکرێت هونەر بەدەزگابکرێ و بسەلمێنرێ کە ئەویش بەشێکە لەهەمان سیستەمی ئابووری و هەمان سیستەمی پەروەردەو هەمان سیستەمی کولتووری). بەڕای (جوودی) ئەم میکانیزمانە هەروا بێکاریگەرنین، بەڵکو دەبنە هۆی سەرهەڵدانی ئەو تایبەتکار و لێزانانەش کە بەو لۆژیکە بیربکەنەوەو لەسەرهەمان خواستیش جۆرێ لەهونەر بەرهەم بهێنن. جۆرێ لەهونەر کە: (چیدی نابێت ڕەخنەی لێبگیرێت، چونکە لەژێر سایەی پارێزگاریی دەزگاکاندایە). لەبەرئەوە دەبینین ئەمڕۆ بەلێشاو هونەری تایبەتکارەکان، هونەری (بەکردن دراو) و هونەری ڕازاندنەوە، دێتە بەرهەم و ئەمەش نەك هەر دەبێتە هۆی (خستنەکەناری هونەری چاك و

بەپەراوێزکردنی ڕۆڵی ئەم هونەرە وەك ئەوەی لەئێستادا دەیبینین، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی هونەری باش بۆ یەکجارەکی نەمێنێت و لەناو بچێت).

لێرەوە (جوودی) پێیوایە هونەری باش، (واتە باش لەپەیوەندی بە کۆنتێکستە کۆمەڵایەتیەکەیەوە)، لەپەراوێزی ئەو شتەدایە کەئەمڕۆ بەشێوەیەکی جیهانگرەوە مۆزەخانەو دەزگاکانی پێ پڕدەکرێتەوە. بەلای ئەوەوە بەرهەمە هونەرییە باشەکان ئەوانەن کەپێش هەمووشتێك بەشێکن لە(مێژووی هونەر) نەك (مێژووی دەزگاکان)، لەسەردەمی ئەمڕۆشدا کە مێژووی هونەر لەدەزگاکانەوە دەنووسرێت و بەچاودێری ئەوان تۆماردەکرێت و بەرهەمدەهێنرێت، ئەوە دەبێت هونەری ڕاستەقینە لەپەراوێز و کەناردا بمێنێتەوە...

_ [] :بروانة- Donald Judd:

Udstilingsstrid{Kunstforum nr. 100, april- Maj –

1989}:Kasper Nefer Olsen in:{Billedets onde nd}Det

KGL. Dansk Kunstakademi, Kopenhagen 1990, pp 103-

129

٢٣. ئەمەش لەبەر ئەوەی لەتێگەیشتنی سەرمایەدارانەدا بۆ هونەر، نرخەکان بەپێی ئەو ڕۆڵە دادەنرێن کە لەبازاڕی ئاڵوگۆڕکردندا پێیان دەدرێت. بەم پێیەش هونەر لەوکاتەوە بەهای هەیە کەدەبێتە کەلو پەل و وەك هەر کەلوپەلێکی تر لەبازاڕدا ساخ ئەکرێتەوە. جێی سەرنجە ئەم میکانیزمە نەك هەر لەدەزگاکانی وەك بڵاوکردنەوەی (کتێب)دا پەیڕەو دەکرێت و ئەرکی نوسینی ئەو کتێبانەی ***بازاڕیان هەیە*** دەدرێتە نووسەران و ناچاردەکرێن (بەپێی خواست و هەلومەرجەکانی بڵاوکردنەوە) ڕازی بن بەدەستکاریکردن و گۆڕینی ناوەڕۆکی بەرهەمەکانیان، کەبەمەش ئاستێکی کەلوپەلیانەو مەتریاڵیانەی ڕووت دەدرێتە بەرهەمەکان، بەڵکو (جەستەو خۆشەویستی و ئیرۆتیکا)ش لەژێر زەبری هەمان میکانیزمدا خۆیان دەبیننەوە و لەسەرهەمان ئەو میکانیزمانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت..

٢٤. لەپاشانیشدا هەمان بزاڤ و بەهەمان شێوەی ئۆرگانیزەکراو، بووە میراتێك بۆ بەشێکی ئەو دەوڵەتە هەرێمیانەی لەپاش کۆلۆنیالیزم کەوتنە تالانکردن و بردنی گەنجینەو سێمبوولە ئاینی و ئەتنیکیەکانی ئەو گەلانەی بەژێردەستی مانەوە. لەوانەش گەلی کورد، کە هەتا ئێستاش کۆنترۆلی میراتە کولتوورییەکەی لەژێر دەستی ڕژێمەکانی ناوچەدایە..

٢٥. بڕوانە:

Pirre Bourdieu: Distinksjonen: En sosiologisk kritik av .dmmekraften. Ovst. Annick Prieur, Oslo 1995

هەروەها بڕوانە: ڕێبوار س: (نمونەی سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخ: پیێر بۆردیۆ) لە گۆڤاری ڕەهەند، ژ. ٣ی ساڵی ١٩٩٦، ل: ٢٠٩- ٢٢٦

٢٦. ئەمەش لەکاتێکدا دوای دروستکردنی(دۆلی)و دوای کۆپیکردنەوەی جینەکان، ئەستەمە بتوانین باس لەئۆرگێنالیەت بکەین. (دۆلی) ناوی ئەو مەڕەیە کە ساڵی ١٩٩٦ بۆیەکەمجار لە ئیرلەندا، لەئەنجامی کۆپیکردنی تەکنەلۆژیای جینەکانەوە دروستبوو. ئەمەش دەرگای کردەوە بۆ قسەکردن لەسەر کۆپیکردنەوەی جینەتیکی مرۆڤیش. واتە دروستبوونی زیاد لەمرۆڤێ کە لەخەسڵەتە جینەتیکیەکاندا چوون یەك بن. لێرەشەوە دەرگا بۆ فەیلەسووفەکان ئاوەڵابوو تاکو باس لە نەمانی ئۆرگینالییەتی تاکەکەس بکەن و هتد..

٢٧. لەنامەکەی ڕێبوارەوە وەرگیراوە.

٢٨. لەمبارەیەوە تەنیا بۆنمونە ناوی هەندێ لەو وتار و باسەگرنگانە دەبەم کەدیارترین فەیلەسووف و ڕەخنەگر و سۆسیۆلۆژ و خودی هونەرمەندەکان لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە بەمەبەستی پێداچوونەوە بە بارودۆخی هونەر و هێنانەکایەی تێرمی نوێی ئێستاتیکی، فەلسەفی و ڕەخنەیی بۆ دووان لەهونەر، بەرهەمیانهێناون:

- Mario Perniola: Kunsten som neutral mutant{Larte come muntante neutro, 1993}. Denmark 1996, Det kgl. dansk .Kunstakademi, Carsten Juhl

- Niklas Luhman: Kunstsystemets evolution{Die Evolution des Kunstsysems, Kunstforum Bd 124, Nov.- Dez. 1993}: .Kasper Nefer Olsen, 1994 Denmrk

- Joseph Kosuth: Vicos Anvendelighed{historikeren som kunstner og vishedens krise}Andreas brogger, 1996.

٢٩. ماریۆ پیرنوێلا، سەربە نەوەی فەیلەسووفە ئیتالییەکانی وەك (ئۆمبێرتۆ ئیکۆ و جیانی ڤاتیمۆ)یە. لە ٢٠ي ٥ي ١٩٤١ لە (ئاستی (Asti لەدایك بووەو لە زانستگای (تۆرینیۆ) بەشی فەلسەفەی تەواوکردووە. ئەم تێکستەی من لێرەدا ئاماژەی پێدەکەم، وتارێکی ماریۆیە کە ساڵی ١٩٩٣ بۆ کەتەلۆگی چل و پێنجەمین میهرەجانی هونەری لە ڤینیسیای نووسیوە و کاستن یول، فەیلەسووف و ڕەخنەگری دانمارکی کەیەکێکە لە دۆست و هاوکارانی ماریۆ، لە زمانی ئیتالییەوە وەریگێڕاوە و چەند خاڵێکی گرنگیشی لەسەر نووسیوە. بڕوانە:

- Mario Perniola: Kunsten som neutral mutant{Larte come muntante neutro, 1993}.pp: 19-29, Denmark 1996, Det kgl. .dansk Kunstakademi, Carsten Juhl

٣٠. زاراوەکانی (synkron) و (diakron) دەکرێت وەك دوو پێچەوانە بخرێنە ڕوو، یەکەمیان واتای (هاوکاتیبوون) دەدات بەدەستەوە. بۆنمونە وەك ئەوەی کارێ بکرێت تیایدا چەند ئامێرێك، یان چەند بەشێ لەئامێرێك لەهەمان کاتدا پێکەوە ئیشبکەن. نمونەیەکی باشتر بریتیە لە دۆبلاژکردنی فیلم: واتە ئیزافەکردنی دەنگ بە وێنەکان بەمەرجێ کە دەنگەکان لەهەمان کاتی جوڵەی دەم و لێوی قسەکەری ناو وێنەکاندا، دروست بێتەوە. نمونەیەك بۆ زاراوەی دووەم بریتیە لە ناونیشانێکی وەك

(مێژووی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست)، بەجۆرێ کە ڕووداوە هاوکاتەکانی ئەو وڵاتانە وەک یەک ڕووداو تەماشایان بکرێت و بنووسرێنەوە.

٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ٢٠

٣٢. هەرئەوێ ل: ٢٠

٣٣. هەرئەوێ ل: ٢١

٣٤. هەرئەوێ ل: ٢٢

٣٥.هەرئەوێ ل: ٢٥



# هونەر و یادکرنەوە

## *بەراییەك بۆ دوان لە پڕۆژەی (٥٠٠٠ پۆرترێت، ٥٠٠٠ شەهید)ی ڕێبوار سەعید*

بۆ: شەماڵ عومەر

(1)

لەبەردەم هەموو پڕۆژەیەکی هونەریدا بۆ یادکردنەوەی (تراژیدیا)، پرسیارێك هەیە دەبێت بیکەین: ئایا دەشێت لە ڕێگەی هونەرەوە، یادی ئەو شتە بکەینەوە، یان ئەو شتە پیشانبدەینەوە کەخۆی نادات بەدەست پیشاندان و یادکردنەوەوە؟ بەمانایەکی تر، ئایا هونەر دەتوانێت ببێتە پانتاییەك بۆ یادکردنەوەی تراژیدیایەك، کەتیایدا بە هەزاران مرۆڤ بوونەتە قووربانی و چیدی وەك مرۆڤ لەئارادا نەماون؟ ئایا چ دەربڕینێکی هونەری دەتوانێت ببێتە پانتاییەك بۆ یادکردنەوەی گیانی شەش ملیۆن یەهوودی و قەرەچ و هۆمۆسێکسیواڵ و مەعلوول و کۆمۆنیست، کە لەلایەن نازییەکانەوە سووتێنران و کوژران؟ یاخود چ بەرهەمێکی هونەری لەڕێگەی زمان و ئیمکانەکانی دەربڕینی خۆیەوە دەتوانێت ملیۆنان کەس بهێنێتەوە دەنگ، کە بوونە قوربانیی ستالینیزم؟ پاشان کامە یادکردنەوەیەکیش دەتوانێت ببێتە دەربڕی تراژیدیای ئەو هەزاران کوردانەی لە ئەنفال و هەڵەبجەو شەڕی چەکداریدا، لەلایەن بەعسیەکان و هێزە کوردییەکانەوە سەریان نایەوە؟

بەمانایەکی دیکە، دەکرێت گومانمان ئاراستەی زمان خۆی بکەین و بپرسین: ئایا کاتێك دەگوترێ: *یادی* تراژیدیای هەڵەبجە []، چی لەمانای ووشەی ***یاد*** لەو ڕستەیەدا تێدەگەین؟

ڕەنگە نزیکترین مانا بۆ ئەم وشەیە بریتیبێت لە بیرهێنانەوە و زیندووکردنەوەی ڕووداوێکی لەڕابردوودا قەوماو، لە چوارچێوەی ئیمکانیەتەکانی (ئێستا)دا و

بەپێی بەڕێوەچوونی سارمۆنیایەکی بڕیار لەسەر دراو، کەئێمە لە ڕێگەیەوە دەمانەوێت سوپاس و ئەمەگ و داوای لێبووردنی خۆمان بە قوربانییەکان ڕابگەیەنین. لێرەیشەوە ناوەڕۆکی وشەی (یاد)، جۆرێ لە بەردەوامیی وەردەگرێت. چونکە بۆی هەیە ڕووداوێك لەهەموو (ئێستا)یەکی ژیانی مرۆڤەکاندا بەپێی بەڕێوەچوونی سارمۆنیایەکی بڕیار لەسەر دراو، شایانی زیندووکردنەوە و یادکردنەوە بێت. یاخود دەشتوانین بڵێین، لەبەرئەوەی (ئێستا)ی ئێمە ناتوانێت بڕیاردەربێت لە (ئێستا)ی نەوەکانی داهاتوودا، ئەوە بۆی هەیە ئەو ڕووداوەی ئێمە بەشایانی زیندووکردنەوەی دەزانین، لە(ئێستای دواڕۆژ)یشدا، هەمان گرنگیی بۆخۆی بەدەستبهێنێت. چونکە لەڕاستیدا ئێمە ناتوانین لەجیاتی نەوەکانی داهاتوو داوای لێبووردن لە قوربانییەکان بکەین و پێزانینی خۆمان لەئاست ئەو ئەرکە پیرۆزەدا دەرببڕین کە ئەوان جێبەجێیانکرد. هەر نەوەیە بەناوی خۆیەوە ئەمکارە دەکات و بەشێوازی خۆی، پەیوەندیی لەگەڵ قوربانییەکاندا دادەمەزرێنێ.

کەواتە بەم مانایە، چەمکی یادکردنەوە ناتوانێت ***دوا یادکردنەوە*** بێت، یاخود دواهەمین داوای لێبووردنی ئێمە بێت لەئاست ئەوانەدا کە گیانی خۆیان بەختکرد. چونکە هەموو یادکردنەوەیەك، هەموو زیندووکردنەوەی تراژیدیایەك، بەشێکیشە لەپرۆسەیەکی دووبارەکردنەوە، کە تیایدا ئێمە و قوربانییەکان ڕوو بەڕووی یەکتر دەبینەوە. بەڵام بۆچی هەر نەوەیە هەڵدەستێ بەم سارمۆنیایە و بەئەرکی خۆی دەزانێت لەگەڵ قوربانییەکاندا ڕووبەڕوو ببێتەوە؟ ئایا شتێکی زیاتر لەودیو ئەم یادکردنەوەوە هەیە، بێجگە لە جەختکردنەوەی ئێمە و ڕێزدانانمان بۆ ئەو شتەی نەوەکانی پێشتر تا ئاستی گیانفیدایی و خۆ بەقوربانیدان لەگەڵیا ڕۆیشتن؟ بێگومان هیچ شتێکی ئەوتۆ نییەو تاقە هاندەرێك هەر ئەوەیە کە ئێمە لە ڕێگەی ئەو سارمۆنیایەوە بەمردووەکان بڵێین: سووپاس کە ئێوە گیانی خۆتان لە پێناوی ئامانجی هاوبەش و خاك و ژیانی ئێمەدا بەختکرد. ئێمە ئێوەمان لەیاد نەچووە و مەرگی ئێوە نەبۆتە هۆی مردنی ئێوە

له ژیانی ئێمەدا، بەڵکو مەرگی ئێوە هەمیشە لەژیانی ئێمەدا ئامادەیە و ئێمەش ئامادەین لەپێناوی بەرزیی کارەکەی ئێوەدا، بەردەوامبین لە خەباتکردن.
بەم پێیەش یادکردنەوە جۆرێك لە بەردەوامیی دەسەپێنێ، واتە ئێمە بەردەوام دەبێ یادەکان بکەینەوە تا هەستنەکەین بۆ دواجار داوای لێبووردنمان کردووە و بۆ یەکجارەکی قەرزی قوربانیەکانمان داوەتەوە. چونکە ئەم هەستکردنە هەنگاوی یەکەمە بۆ پسانی پەیوەندی لەنێوان ئێمە و مردووەکاندا، لەنێوان ژیانی ئێمە ناوەڕۆکەکەیدا کە بە مەرگی ئەوان پڕ دەبێتەوە.

(2)

ئایا ڕۆڵی هونەر بەگشتی و هونەری شێوەکاری بەتایبەتی، لەبەردەم ئەم سارمۆنیای دووبارەکردنەوەیەدا چییە؟ پێش ئەوەی هیچ شتێ لەمبارەیەوە بڵێم، حەز ئەکەم ئەو وتەیەی فەیلەسووفی ئەڵمانی (تیۆدۆر ئادۆرنۆ) بەبیری خوێنەر بهێنمەوە کە گوتویە: لەدوای (ئاوشویتس)ـەوە تازە ناتوانرێت هیچ شیعرێك بنووسرێت.. بێگومان ئادۆرنۆ کەسێك نییە گوێی بۆ نەگیرێت و ڕەنگە خودی ئەم وتەیە دەمی چەندین شاعیریشی بەستبێت کە ویستویانە لەدوای ئەو تراژیدیایەوە شیعر بنووسن. یاخود ویژدانی زۆر لەو شاعیرانەیشی نائاسوودە کردبێت کە وێڕای وتەکەی ئادۆرنۆش، هەر بەردەوامبوون لە شیعر نووسیندا..
لێرەدا باسی ئەوە ناکەین ئایا پاش ئەو ڕووداوەی ئادۆرنۆ ئاماژەی بۆ دەکات، شیعر نووسرا و کێ نووسی؟ یان بۆچی تازە شیعر بەتێگەیشتنە ئادۆرنۆییەکەی نەنووسرا..؟ بەڵکو دەمەوێت بۆ ساتەوەختێك گوتەکەی ئادۆرنۆ بەشێوەیەکی دیکە دابڕێژمەوە تاکو بتوانین لە سایەیدا، پرسیاری ئێستای خۆمان لەمەڕ تراژیدیاوە، بەمجۆرەی خوارەوە بکەینەوە: ئایا لەدوای کارەساتە گەورەکانی ئەم سەدەیەوە، هونەری شێوەکاری توانی ئەو ڕەنگ و زمانی دەربڕینە بدۆزێتەوە کە بۆ کێشانی تابلۆی تراژیدیاکان پێویستی پێیان هەبوو؟ بەمانایەکی دیکە دەکرێ بپرسین: ئایا هونەر توانی ئەو شیعرە بە تابلۆ بکێشێت کە ئادۆرنۆ پێی وابوو تازە بە وشە تەعبیری لێناکرێت؟

## (3)

یەکەم خەسڵەتی هونەری شێوەکاری لەم سەدەیەدا (سەدەی بیستەم) ئەوەیە کە وازیهێناوە لەوەی کۆمەڵگا لەو ڕەسمەدا بنوێنیٚ، کە خودی کۆمەڵگا دەیەوێت خۆی تیا ببینێتەوە.. هونەرمەند چیدی خۆی ناکاتە کۆیلەی دەسەڵاتی میکانیزمەکانی تێزگەلی وەك: (هونەر ڕەنگدانەوەی ژیان و کۆمەڵە و هونەرمەندیش خزمەتکاری کۆمەڵگایە. هەندێك ئەمە َ بە بیٚ هەڵوێستی هونەرمەند لە ئاست دنیایەکدا دەزانن، کە بۆخۆی تیایدا دەژی و بەبەرچاویشییەوە کارەساتەکان ڕوو دەدەن. هەندێك دەڵێن ئەمە بچووکبوونەوەی ئاسۆکانی بینینی هونەرییە و داخرانی یەکجارەکی دەرگای هونەرە بەڕووی جیهاندا.. بەواتایەکی دیکە، ئەم بارودۆخە بەدابڕانی ئەو پەیوەندییە لێکدەدەنەوە کە هەمیشە وەك پەیوەندییەکی بەڵگەنەویستی نێوان هونەر و کۆمەڵگا، لێکدەدرایەوە. وەك دەگوتریٚ، تازە هونەر باسی واقیعی کۆمەڵگا ناکات، چونکە ئەو هونەرەی لە ئەبستراکتبووندا (تجرید)، بۆ هونەربوونی خۆی بگەڕێت، ناتوانێت لەگەڵ واقیعدا لە پەیوەندیدا بێت.. هەروەها ڕەخنەگرەکانی هونەر دەڵێن، هونەر بۆتە کۆدێکی داخراو، وەك زمانێکی لێهاتووە کەتەنیا هونەرمەندەکان لەناو خۆیاندا دەتوانن پەیامەکانی بکەنەوە و لێی تێبگەن.. ئەمەش ڕەخنەیەکە بەپلەی یەکەم بەرەو ڕووی ئەو پرۆژە گەورەیە بۆتەوە کە دەوڵەتی ئەڵمانیا دەیەوێت ساڵی ٩٩ لە بەرلین، بۆ یادی پەنجاساڵەی قوربانییەکانی (هۆڵەکۆست)ی بکاتەوە و پارەیەکی خەیاڵیشی تێدەچێت. ڕەخنەگرانی ئەم پرۆژەیە هەموو ئەو پێشنیارانەی لەپێشبڕکێی پرۆژەکەدا بەشدارییان کردووە، بەکاری (تەجریدی) ناودەبەن کە ناتوانن لەسەر تراژیدیای هۆڵەکۆست هیچمان پێبڵێن.. هەربۆیەشە ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیە کولتوورییەکانی ئەڵمانیا، لەوانەش (گوینتەر گراس)، داوایان لەدەوڵەت کردووە تا پەلە لەو پرۆژەیە نەکرێت، کەلەواقیعدا دەبێت وەك داوای لێبووردنی گەلی ئەڵمان بێت لەو قووربانیانە.. بەلای ئەو کەسایەتیانەوە، ئەو یادکردنەوەیە، پێش هەموو شتێك یادکردنەوەی (شەرم)ێکە و دەبێت ئەو کارە

هونەرییەش کە بۆ ئەم یادە تەرخاندەکرێت گەیەنەری ڕەهەندی شەرماوی ئەوتاوانە بێت کە لەئاست قوربانییەکاندا هاتە ئەنجام. ڕەخنەگرەکان دەڵێن: شەرمی کوشتنی یەهودییەکانیش ئەوەندە گەورەیە، کەپرۆژەیەکی تەجریدی ناتوانێت تەعبیری لێبکات.

ئایا بەڕاستی هونەر هێندە گۆڕاوە، هێندە دەرگای بەسەر خۆیدا داخستووە و لەکۆمەڵگا و فەزای گشتیی ژیانی مرۆڤ دوورکەوتۆتەوە، کە نەتوانێت وەڵامی کێشە فیعلییەکانی کۆمەڵگا بداتەوە، یان لە وەڵامدانەوەیاندا بەشداری بکات؟

هەر وەڵامێکی ئەو پرسیارە بدرێتەوە، نابێت ئەو ڕاستیەش لەبیر بکرێت کە پێماندەڵێت، گۆڕان لە هونەردا هاوشانیشە بە گۆڕان لە تێگەیشتنی هونەردا بۆ دەوروبەری خۆی. دەوروبەری کۆمەڵایەتی و ژیانی مرۆڤیش لەم سەدەیەدا، بە پێچەوانەی سەدەکانی ڕابردووەوە، دەوروبەرێکی سادەی خاوەن هارمۆنی نییە، وەك ئەوەی لەزۆربەی تابلۆ و دیمەنە هونەریەکانی سەدەکانی پێشوودا دەیبینین. بەڵکو واقیعی ژیانی مرۆڤ لەم سەدەیەدا، بەهۆی هەردوو جەنگی جیهانیی و هەموو ئەو ڕووداوانەش کەئەم دووجەنگە و برەودان بە تەکنەلۆژیای شەڕ بەسەر ژیانی مرۆڤایەتیدا سەپاندیان و تائێستاش دەیسەپێنن، لەمێژوودا بوو بەواقیعێکی ئاڵۆزی پڕ گرێی بێوێنە.. چیدی هونەر نەیدەویست تێگەیشتنێکی سادە و شەففاف لەسەر ئەو واقیعە ئاڵۆزە بەرهەم بهێنێت کە قەیران و کارەسات جڵەوی دەکەن و هەتا ئێستاش (ڕووداو) تیایدا ناتوانێت ڕووداو بێت، ئەگەر لەهەمان کاتدا لە (تراژیدیا)دا نغرۆ نەبووبێت. لێرەوە، ڕەنگە بەئەبستراکتبوونی هونەر پەیوەندییەکی توندی هەبێت بەو ئەرکەوە کە هونەر لەبەردەم جیهانی پڕ تراژیدیادا، بۆخۆی لەپێشچاو گرتووە. واتە ئەرکێك کە ڕێگە بەهونەرمەند نادات بەهۆی پیشاندانەوەی میکانیکیانەوە، بەهۆی (بەئاوێنەکردنی) بەرهەمەکانی خۆیەوە، لەنرخی تراژیدیانەی جیهان کەمبکاتەوە. چونکە ئەمە لەدوا جاردا کەمکردنەوەی بەهای کێشەو تراژیدیاکانەو مامەڵەکردنێکی بێمەیلانەیە لەگەڵ ڕووداوەکاندا وەك ڕووداگەلێك، کەدەکرێت بکرێنە (تابلۆ)، بکرێنە (شیعر) و بشکرێنە (فیلم)و هتد.

،لام هونەرمەندێك كە نەیەوێت ئالۆزیی واقیع لەناو بەرهەمەكانیدا سادە
كاتەوە، هونەرمەندێكە تراژیدیای خۆی لەناو هونەردا دەخولقێنێ. واتە لەو
استەدا مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەكاندا ناكات كە (دەكرێت ببنە مۆتیڤی
ەرهەمەكانی) چونكە ئەو هونەرەی بەوجۆرە پەیوەندی خۆی بە واقیعەوە
ۆزێتەوە، دەبێت هەمیشە لەسەر ڕێگای چاوەڕوانی هاتنی كارەسات و
راژیدیاكان بوەستێت، تاكو بتوانێت مۆتیڤەكانی لێوەربگرێت.. ئەم هونەرە
ونەرێكە، لەجەوهەردا خۆزگەی (ڕوودانی بەردەوامیی تراژیدیاكان)
ەڵدەخوازێت، نەك هەنگاو دەنێت بۆ خولقاندنی تراژیدیا لەهونەردا، تا بیكاتە
ێگر لەبەردەم ڕوودانی تراژیدیا لە واقیعدا.. ئەو هونەرمەندەی لەسەر ڕێگای
ارەساتەكان چاوەڕوانە، هونەرمەندێكە چێژ لەمەیدانەكانی شەڕ و ڕژانی
خوێنەكان دەبینێ، چونكە دەیانكا بە (بابەت) و لەو ڕێگەیەشەوە بەردەوامی
ەچالاكییەكانی خۆی دەدات.. واتە بۆخۆی بابەتێكی نییە، ڕوانینێكی لەسەر
راژیدیا نییە تا لەڕێگەیەوە نەفرەتی هونەر لەواقیع و ڕەتكردنەوەی بكاتە
ئامانجی خۆی.
ەداخەوە ئێمە لەدوای هەموو تراژیدیاكانمانەوە، ئەو هونەرمەند و شاعیر و
ووسرانە دەبینینەوە كە ڕۆژگارێك لەسەر ڕێگاكان بە خۆزگەیەكی شاراوەی ناو
ڵیانەوە، چاوەڕێی هاتنی تراژیدیاكان بوون.. باشترین نموونەشم بۆ ئەم قسەیە
ەو هەموو یادیكردنەوە بەلێشاوەی تراژیدیای هەڵەبجەیە لەهەموو بوارەكانی
دەربڕینی هونەری و سیاسی ئێمەدا. وەك ئەوەی هەڵەبجە تراژیدیایەك بێت
بشێت لەچەند دەربڕینێكی شیعریی زەقدا، یان بەهۆی بەكارهێنانی چەند
ڕەنگێكی خەمگین لە تابلۆدا و چەند سروودوگۆرانیی نۆستالیژیانە و چەند
درووشمێكی هاندەری خوتبەییانەوە، ئاوا بەڕوونی و شەففافی تەعبیری لێبكرێت
و ئەمەش سارمۆنیای یادكردنەوەی ئێمە بێت بۆ ئەو كارەستەمان.

(٤)

بەڵام دەبێت دووبارەی بكەمەوە كە ڕەنگە هیچ یادكردنەوەیەك نەتوانێت
شایانی ئەو تاوانە بێت كە بەرامبەر مرۆڤایەتی دەكرێت. وە ڕەنگە لە بونیادی

هەموو تراژیدیا و تاوانەکاندا جۆرێ لە ڕەتکردنەوە و ئینکارکردنی پرۆسەی (یادیکردنەوە)ش هەبێت. ڕەنگە جەریمەکان بۆیە ڕوو بدەن تا بەڕووداني خۆيان پێشمان بڵێن کە ناکرێت ببن بە بابەتێ بۆ یادکردنەوە. هەر بەڕاستیش هیچ یادکردنەوەیەك ناتوانێت باسی هەناسەی منالێکی سووتاومان بۆ بکات.
بۆیە دڵنیام لەماوەی چەند ساڵی داهاتوودا (بیرەوەری زیندوو)ی ئێمەی کورد لەسەر تراژیدیای هەڵەبجە دەمرێت. چونکە لە ئێستادا (دەزگاکانی یادکردنەوە)و ڕۆژنامەنووس و ستوون نووس و هەلۆێستخوازەکان، هەموو شتێك دەکەن تاکو بەهۆی ڕستەو دەربڕینە کلێشەییەکانیانەوە، مانا تراژیدییەکانی هەڵەبجە دابدۆشن و بۆنەو موناسەبەکانی خۆیانی پێ بەڕێخەن.. واتە مانای تراژیدیانەی ئەو کارەساتە لە دووبارەکردنەوەی کلێشەیی بەردەوام و سادە دا، بکوژن. بەڵام ئێمە وەك میللەتێك، کە لەسەردەمی قەیرانی مانەوە بەگشتی و بەتایبەتیش قەیرانی پێکهێنان و هەبوونی ناسنامەی نەتەوەییماندایین، پێویستییەکی سەختمان هەیە بەدروستکردنی بیرەوەرییەك تا لەسەر ئاستی دوورمەودا، یارمەتیمان بدات لەیادکردنەوەی تراژیدیاکانماندا. ئەمەش تاکو ئەو(بیرەوەرییە دوورمەودا)یە بتوانێت نەوەکانی داهاتوو بە هەڵەبجەوە ببەستێتەوە، کە لەهامان کاتیشدا بەستنەوەیانە بە ئێستای ئێمەیشەوە.. چونکە لەڕووی مێژووییەوە، (یادکردنەوەکان) ئەو پێویستییەن کە بەتووندی بەستراون بە ئاگایی مرۆڤەوە لەسەر سازدانی ناسنامەی نەتەوەیی خۆی. واتە قەیرانی ناسنامەی نەتەوەیی و پرسیارگەلی وەك ئەوەی: (ئێمە کێین؟ و خەسڵەت/تراژیدیای هاوبەشمان چییە؟) مەرجی هەبوونی یادەوەرییە هاوبەشەکان دەسەپێنێت. وەك ئەوەی لە حاڵەتی ئەڵمانیادا، لەدوای یەککگرتنەوەی هەردوو بەشەکەیەوە دەیبینین. ئەگەرچی ڕەنگە کردنی قەیرانی ناسنامە لە ئەڵمانیادا بە نموونە بۆ قەیرانی ناسنامەی نەتەوەیی کورد، نموونەیەکی تەواویش نەبێت. بەڵام دەشێت لەبەر تیشکی ئەویاندا پتر ئەمیان ڕوونبکرێتەوە. چونکە هەڵە ناکەین گەر بڵێین: ئەگەر دیواری بەرلین نەڕووخابا، لەوانەبوو هەرگیز لە ئەڵمانیدا باسی یادکردنەوەی هۆڵەکۆست نەکرابایە و گەلی

ئەڵمانی لەسەر ئەو بنەمایەوە بۆ خاڵی هاوبەشی خۆی نەگەڕابایە. لێرەدا قەیرانی ناسنامەیە کە وادەکات نەتەوە سەمبوولەکانی خۆی درووستبکات، یاخود یادیان بکاتەوە. دیارە خاڵی هەرە دیاری جیاواز لەنێوان نموونەی ئێمە و نموونەی ئەواندا ئەوەیە، کە گوناە و شەرم لەئاست تراژیدیای کوشتنی یەهودی و قەرەچ و خەڵکانی تر، دەبێتە خاڵی هاوبەشی نێوان هەردوو ئەڵمانیای خۆر هەڵات و خۆر ئاوا. هەربۆیەشە یادکردنەوەکەی ئەوان بە پلەی یەکەم یادکردنەوەی تاوانبارە بۆ داوای لێبوردن و پیشاندانی شەرمێك لەئاست قوربانییەکاندا. لەکاتێکدا ئێمە وەك قوربانی یادی تراژیدیاکەی خۆمان دەکەینەوە. هێشتا بەرپرسیارەکانی تراژیدیای ئێمە لە ئاستێکی شارستانی ئەوتۆدا نین کە چاوەڕێیان لێبکەین، داوای لێبوردن لە قوربانییەکانمان بکەن و یادیان بکەنەوە.. تا شەرمی تاوانەکەیان قبووڵبکەن و وادەمان پێبدەن کە هەرگیز کاری وەها دووبارە ناکەنەوە.. لەبەر ئەوە یادەکانی ئێمە، یادی خاوەن قوربانییە بۆ قوربانییەکانی خۆی، نەك یادی تاوانبار بێت بۆ قوربانیکراو.. بەم پێیەش پرۆسەی بەسێمبوولکردنی ئێمە بۆ تراژیدیاکەمان جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو بەسێمبوولکردنەدا کە دەشێت ڕۆژێك لە ڕۆژان، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی وڵاتی ئێمە بەناوی نەتەوەی خۆیانەوە پێی هەڵسن و بەڕەسمی ددان بەتاوانی خۆیاندا بنێن لەبەرامبەر قوربانییەکانی ئێمەدا.. دان پیانانێك، ئەوەتا دەوڵەتی ئەڵمانیا بە بۆنەی تێپەڕینی پەنجا ساڵ بەسەر هۆڵەکۆستدا، پرۆژەی دەکات و لە شوێنگەی نەتەوەی تاوانبارەوە، ڕووبەڕووی قووربانی دەبێتەوە.

(5)

لەڕاستیدا، سارمۆنیای یادکردنەوەکان سەر بە نەریتێکن کە نەتەوە پێویستی پێیەتی بۆ بەهێزکردنی ناسنامەی سیاسی خۆی. یادەکان لەلای ئێمە یادی سەرکەوتنن لە تراژیدیاکاندا بەهۆی بەسەمبوولکردنی قوربانییەکانەوە. چونکە قوربانییەکان ئەوانەن کە لەپێناوی هەمووماندا و لەپێناوی نەتەوەدا گیانیان لەدەستداوە. پەیامی هەموو یادکردنەوەکان ئەوەیە کە پێماندەڵێت: نەتەوە

هەمیشە شایانی ئەوەیە خۆمانی بۆ بکەینە قوربانیی. بەم پێیەش یادی قوربانیەکان دەبێت یادێك بێت کەبتوانێت نەتەوە کۆ بکاتەوە و یەکی بخات. چونکە زیندووەکان هەمیشە قەرزاربازی مردووەکانن بەوەی یەکبگرن و بەوکارەش ئەمەگداری خۆیان بۆ مردووەکان پیشانبدەن. مرۆڤ لە پێناوی هەرشتێکدا بمرێت، لەدواجاردا لە پێناوی نەتەوەدا مردووە و هەر لەبەر ئەوەیشە کە مردووەکان وەك (قارەمان)ی نەتەوە ناویان دەبرێت. هەموو قارەمانێکیش بەو حوکمەی ئەندامێکی نەتەوەیە، دەبێت وەك (تاکەکەس)ێك یادی بکرێتەوە. ئەگەرچی ئەم پرنسیپە لە مێژوودا هەمیشە پەیڕەوی لێنەکراوە. چونکە لەسەردەمانێکدا، گوتاری یادکردنەوە، نیشانەی (قارمان)ی تەنیا بەپێشەواکان، خاوەن پلەو پایەکان، ئەسحابەکان و قەدیسەکان و سوارچاکەکان دەبەخشی. هەر لەبەر ئەوەیش تەنیا ئەمانەی بە شایانی یادهێنانەوە دەزانی.. بەڵام وردە وەردە لەگەڵ زیادبوونی پێویستی نەتەوە بەلەشکری قارەمانەکانی، مەودای یادکردنەوەکانیش بەرفراونکران و ناونیشانی قارەمان بە (بێسەروشوێنەکان، نەگەڕاوەکان و بێناوەکان) و پاشانیش بە (سەربازی وون) بەخشرا.. هیچ کەسێ نەدەبوو لەبیر بکرێت کەگیانی خۆی لە پێناوی هەمواندا بەختکردووە: ***هەموو ژەنراڵێك سەربازێکە و هەموو سەربازێکیش ژەنراڵێك.*** لێرەیشەوە، (تاکە قوربانی)ی وەك دابینکەری داهاتووی نەتەوە تەماشای دەکرێت و هەر لەبەر ئەوەش نابێت مەرگی تاکە قوربانی لەبیر بکرێت. یادوەری نەتەوە، کاتێ دەبێتە یادوەرییەکی چالاك کە بتوانێت مەرگی هەموو قارەمانەکان لە خەیاڵی هەموو زیندووەکاندا، بە زیندوویی ڕابگرێت. بەمجۆرەش زیندووەکان دەبن بە داوەر بەسەر مردووەکانەوە و مەرگی ئەوان لەڕوانگەی ئێستای خۆیانەوە دەنرخێنن. دیارە لەم بارەشدا مەترسی ئەوە لەئارادایە کە یادکردنەوەکە، هاندەرە بنەماییەکەی خۆی بدۆڕێنێ و ببێتە هۆی یەکخستنەوەی زیندووەکان بەمەبەستی خولقاندنەوەی تراژیدیا و تۆڵەسەندنەوە. ئەمەش لەکاتێکدا ڕوودەدات کە داوەریکردن و نرخاندنی زیندووەکان بۆ مردووەکان، (نەمرکردنی مردووەکان)،

دەکاتە ئامانجی خۆی. واتە ئەو کاتەی زیندووەکان یەکیان گرتووە و بەیەك دەنگ دەڵێن: (نابێت مردووەکان لەبیر بکرێن و خوێنی ئەوان نابێت بە فیڕۆ بڕوات). ئەم ڕستەیە هەنگاوی یەکەمە بۆ سەندنەوەی جڵەوی سارمۆنیای یادکردنەوەکان لەدەستی گشت بەشداربووەکان و کۆنترۆڵکردنێتی لەلایەن گرووپێکەوە کە دەیەوێت لەپێناوی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیدا، بەناوی (گشت)ـەوە بدوێت و لەپێناوی (هەموو قوربانییەکان)دا بێتە دەنگ. بێگومان ڕێك لەم بارودۆخەشدایە کە قوربانییەکان وەك ئەو قارەمانانە بەنەتەوە دەناسێنرێنەوە کە لە ژێر خاکەوە، لەناو گۆڕەکانی خۆیانەوە (چاوەڕێی خۆ بەکووشتدانی ئەندامەکانی تر دەکەن). چاوەڕێدەکەن زیندووەکان بەمەرگی خۆیان بێنە پێشەوەو ئەو تراژیدیایە بەرهەم بهێننەوە کە قارەمانەکانی پێشووی لەخوێنی خۆیاندا گەوزاند.. واتە لێرەوە مانای تراژیدیا لەنموونەیەکەوە کەدەیەوێت دووبارە (نەبێتەوە)، دەبێتە (سەرمەشقێ بۆ دووبارەکردنەوە). مانای یادکردنەوەکانیش لەوەدا خۆی بەرجەستە دەکات کە بتوانێت زۆرترین ژمارە لە گەنجان کۆ بکاتەوە و بەرەو گۆڕەپانی جەنگیان بنێرێت، تا بەناوی بەرگریکردن لەبەرژەوەندی گشتی، (بەڵام لەڕاستیدا بۆ پارستنی بەرژەوەندی ئەو گرووپەی جڵەوی ڕابەریکردنی گرتۆتە دەست)، خۆیان بەکوشت بدەن.

(6)

بەردەوامیدان بەجێبەجێکردنی سارمۆنیای یادکردنەوە، بە شێوەیەکی پتەو پەیوەندی هەیە بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای شەڕەوە. ئەزموونەکانی ڕابردوو پێماندەڵێن: هەتا تەکنەلۆژیای شەڕ لەپەرەسەندندا بێت، پرۆسەی یادکردنەوەش بەو مانایەی باسیکرا، مانای خۆی لەدەست دەدات. چونکە برەوی تەکنەلۆژیای شەڕ هاوشانیشە بەزیادبوونی ژمارەی قوربانییەکان، بێسەروشوێنەکان و سەربازە نەناسراوەکان (ئەگەرچی لە شەڕی کەنداودا ئەم لایەنە هەرگیز وەکو پێویست نەخرایە ڕوو، چونکە لەشکرێك هەمووی بووە سەربازی ون). ئەنجامەکانی ئەمەش لەو ڕاستییەدا دەرکەوتوون کە

پێماندەڵێت: سارمۆنیای یادکردنەوەی ئەو هەموو هاووڵاتیانە، کارێکی ئاسان نیە.. ئاسان نیە ئەو هەموو سەربازە نەناسراوو و قوربانییە بێسەروشوێنانە، یادیان بکرێتەوە. لێرەیشەوە سارمۆنیای یادکردنەوە پێدەنێتە قۆناغێکی نوێی ژیانی خۆیەوە: قۆناغی بێمانایی یادکردنەوەکان! چیدی قوربانییەکان ناتوانن بەهۆی مەرگی خۆیانەوە ببنە نموونەی مانای تراژیدیاکان و مەرگی خۆیان بەرز بکەنەوە بۆ ئاستی بەرگریکردن لەداهاتووی نەتەوە. چونکە مانای مەرگ بەهۆی دووبارەبوونەوەی شەڕەکانەوە، کەوتۆتە بەر گومانێکی سەخت. مەرگی قوربانییەکان چیدی بەس نییە بۆ یەکخستنی زیندووەکان و کۆکردنەوەیان.. بەواتایەکی تر، لەم سەردەمەدا یادکردنەوەکان هەوڵدانن بۆ ئینکارکردنی مانا لە مەرگی قوربانییەکاندا.. (چ مانایەك لە خۆتەقاندنەوەی بەلێشاوی سەربازە ئێرانی و عێراقییەکاندا هەبوو؟ چ مانایەك لە شەڕی یۆگۆسلاڤیا و شەڕەکانی ئەم چەند ساڵەی دواییدا بدۆزینەوە؟). کەواتە ئێمە لەم سەدەیەدا بەرەوڕووی ***بێمانایی مەرگ*** بووینەوە، چونکە بەهۆی تەکنەلۆژیای شەڕەوە، گۆڕانێکی نەوعی لە شێوەی کوشتن و شێوەی خۆ بەکوشتداندا هاتە ئاراوە. ئەمەش لەو سارمۆنیای یادکردنەوانەدا ڕەنگیداوەتەوە کە داوای وەڵامێك دەکەن بۆ مەرگی قوربانییەکان، بەڵام خۆیان هیچ وەڵامێکیان پێ نییە.. وەك ئەوەی هیچ دەربڕینێك نەبێت بتوانێت مانا بەخودی کارەسات و تراژیدیاکان بدات و تەعبیریان لێبکات. پێموایە هەر ئەمەش جەوهەری مانای ووتەکەی ئادۆرنۆ بێت.

بەڵام ئەگەر گوتاری سیاسی (مەرگی قوربانی) و (مانای تراژیدیا)ی کارەساتەکانی لەسایەی تەکنەلۆژیاکانی شەڕدا گەیاندبێتە ئاستی (بێمانایی)، ئایا گوتاری ئیبداعی و داهێنەرانە چ مامەڵەیەك لەگەڵ مانای تراژیدیادا دەکات و ئایا لەدەربڕینە هونەریەکاندا مەرگی قوربانیی چۆن بەرجەستە بووە؟

# پیشانگای
# (5000پورتریت، ٥٠٠٠ شەهید)

*(بابەتی هونەر هەر بایی ئەوەندە هونەرە کە واقیع نییە)*
خۆزێ ئۆرتیگا گاسێت، ١٩٢٥

(٧)

ئێستا دوایئەوەی چاوێکمان خشاندەوە بە ماناکانی چەمکی یادکردنەوەدا و هەندێك لەو گۆڕانانەمان ئاماژە پێکرد، کە لەژێر کاریگەریی گوتاری جیاوازدا بەسەریدا هێنراون، دەگەڕێمەوە بۆ خاڵی سەرەتا. واتە بۆ هوونەر وەك پانتاییەکی یادکردنەوە و وەك زمانێ بۆ دەربڕینی مانای تراژیدیا. بۆ ئەم مەبەستەش دەمەوێ سەرنجێکی کورتی نمونەیەکی کۆنکرێتی کاریچکی هونەری بدەم، کە (یادکردنەوەی تراژیدیای هەڵەبجە)یە لە پڕۆژە شێوەکارییەکەی هونەرمەند ڕێبوار سەعید)دا(*).

لێرەوە دەمەوێت لە پرسیارێکی سادەوە دەستپێبکەم، کە دەکرێ بەمجۆرەی خوارەوە دایبڕێژمەوە:

ئەو جەوهەرە چییە لەم بەرهەمەی ڕێبوار سەعیدی هونەرمەند دا، بوارمان بۆ دەڕەخسێنێ جیای بکەینەوە لە لێشاوی ئەو بەرهەمانەی کە بۆ تراژیدیای هەڵەبجە بەرهەمهاتن و هانمان دەدات بەشێوەیەکی جیاواز بیخوێنینەوە؟

ئەوی ڕاستی بێت ئەوە چەند ساڵێکە هەوڵدانێکە بەردەوام لەناو ڕۆژنامەگەری و بواری ڕاگەیاندنی کوردیدا لە ئارادایە بۆ باسکردنی هونەرێ بەناوی (هونەری کوردستانی) و پێدەچێت هونەری ڕێبواریش لە چوارچێوەی ئەم پێناسەیەدا سەقامگیر کرابێت. بەم مانایەش هەمووومان ساڵ بەساڵ چاوەڕێی ئەو بەرهەمانە لە ڕێبوار دەکەین، کە جەخت لەسەر ئەم پێناسەیە بکەنەوە. وەك ئەوەی بترسین لەوەی، نەکا ڕێبوار ئاراستەیەکی (ناکوردستانی) لەهونەرەکەیدا بگرێت، یاخود خوای نەخواستە شەیتان بچێتە بن کلێشەیەوە و ئەم

هونەرمەندە لە کورد هەڵگێڕێتەوە. سەیرە! لە کاتێکدا هونەرمەندێك بە ڕەنج و ماندووبوونی بەردەوام، خۆی دروستدەکات ئێمە هیچمان دیارنین و خۆمانی لێ تێناگەیەنین. کەچی کاتێ ناوبانگ دەردەکات هەموو بەهی خۆمانی دەزانین و بگرە ئەوەتا بەهۆی پێناسەکانیشمانەوە بۆی، دەمانەوێت کۆنترۆڵیشی بکەین.
من پێموایە کۆکردنەوەی کارەکانی ڕێبوار لەژێر سەردێڕی (کوردستانی)دا، یەکێکە لەو شێوازانەی لە پانتایی ڕۆشنبیریی ئێمەدا کاری هونەری بەهۆیەوە کۆنترۆڵدەکرێت، کەئەمەش هەژاری ئێمە لەبواری ڕەخنەی هونەریدا دەردەخات. چونکە ئەگەر مەبەست لە چەمکی کوردستانی ئەوە بێت کە جیهان و مۆتیڤی ناو تابلۆکانی ڕێبوار بەپلەی یەکەم، جیهانێکە بۆ بینەری کورد ئاشنایە، ئەوە زۆر لە ڕاستی دوور نەکەوتوینەتەوە. بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوە بێت کە ئەو بەرهەمانە ڕەنگدانەوەی ژیانی مرۆڤی کوردن، ئەوە بەهەڵەدا چووین.
کاتێ دەڵێین جیهانی ناو تابلۆکانی ڕێبوار بۆ بینەری کورد ئاشنایە، ئەوە پەنجەمان خستۆتە سەر خاڵێك کەڕێبوار بۆخۆی بەشێوەیەکی ئاگایانە کاری بۆ دەکات، پێناسەی دەکات و لەڕووی تیۆریشەوە بەرگری لێدەکات. بەرهەمەکانی ڕێبوار، لەو کاتەدا کە سەفەری بەردەوامیی ئەون لەدنیای ڕەنگ و کەشفکردندا، ئەوە هەوڵدانی ئاگایانەشین بۆ سازدانەوەی (هونەریانە)ی ئەو جیهانە پڕ تراژیدیایەی بەپلەی یەکەم بۆ بینەری کورد ئاشنایە. بەڵام جیهانی ناو تابلۆکان جیهانی ناو واقیعی ژیانی مرۆڤی کورد نین، بەڵکو جیهانی ناو تابلۆکان خۆیانن. هەربۆیەشە هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر هونەری ڕێبوار تەنیا لەچوارچێوەی پێناسەکەی سەرەوەدا بچوك بکەینەوە و لەواقیعی کوردیدا بۆ مانای کارەکانی بگەڕێین. بێگومان بەمانایەك لەماناکان، هونەری ڕێبوار هونەرێکی کوردستانیە، چونکە لە پشت هەموو شەپۆلی ڕەنگ و بزاوتنی فڵچە و هێڵەکانەوە، ڕێبوار بۆخۆی وەك (کوردێك) ئامادەیە. ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو ناتوانێت وەك (ناکوردێك) بێت و ناسنامەیەکی دیکە بۆ خۆی دروستبکات. هەر بۆیەشە ترس لە هەڵگەڕانەوەی ڕێبوار لە کورد، ترسێکی

بێمانا و زیادەیە و نیشانەی ئەوەیە ئێمە وەك میللەتێك لە قەیراندا‌ین و بەردەوامیش پێویستمان بەوەیە جەخت لەسەر هەبوونی خۆمان وەك قەوارەیەكی سیاسی/فەرهەنگی بكەینەوە. لێرەیشەوە هەرگیز گوێ نادەینە چۆنایەتی بەرهەمی هونەرمەند و ڕۆشنبیرەكانمان، گرنگ ئەوەیە لە ڕووی چەندایەتیەوە ژمارەیان زۆر بێت، تاكو ئێمە بەردەوام بۆ نەیارەكانمانی بسەلمێنین كە هەین و كولتووریشمان هەیە و سیاسەتیشمان هەیە و شتی تریش.. ڕەنگە هەر ئەم تێڕوانینەش وایكردبێت بەرهەمی هونەری بەلێشاو لەناو ژیانی ئێمەدا سەرهەڵدات بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی مەعنەوی ئەو ژیانە !

لەم قەیرانەدایە كە ئاگایی هونەرمەند ئاستی ئاگایی ئێمە ڕەتدەكات و بەو دەستخۆشانەو پێناسانە قەناعەت ناكات كە ئێمە وەك بارانی ڕەحمەت بەسەریا دەیبارێنین. ئەگەر ڕێبوار بە نیازی فرۆشتنی تابلۆكانی (بەكورد) بەردەوام بووایە، ئەوە لە مێژبوو ناچارمان كردبوو هونەر جێبهێڵێت و خۆی فێری كاسبییەكی تر بكات! بەردەوامیی ئەو، نیشانەی ملكەچی ڕێبوار نییە بۆ ئەو پێناسانەی ئێمە بە ئاماژەكردن بۆ واقیعی كوردی لەسەر هونەر بەرهەمیان دەهێنین. هێندەی ئەوەی بەردەوامییە لەسەفەرە هونەریەكەی خۆیدا.. هەتا دێت ئەو سەفەرەیش مەترسیدار تر دەبێت و خەمەكانی هونەرمەند زیاد دەكات. ڕێبوار لەلایەكەوە، بەردەوام خەمی (بەهونەركردنی) تابلۆكانی دەخوات، واتە دەیەوێت بەرهەمەكانی پێش هەموو شتێك هونەر بن و، لەلایەكی تریشەوە خەمی چڕكردنەوە و ڕەنگاوڕەنگكردنی ئەو پێناسەیە دەخوات كە خۆی دەیەوێت لە ڕێگەی هونەرەوە بۆ جیهان و(جیهانی مرۆڤی كورد) بەتایبەتی بەرهەمی بهێنێت. ئەمەش بەواتای ئەوەیە، بەردەوامبوونی ڕێبوار بۆ سەلماندنی (هونەری بوون)ی بەرهەمەكانی، خۆی لە خۆیدا جۆرێكە لە نزیكبوونەوەی ئەو لەو پێناسەیەی كە دەیەوێت بۆ جیهانی ئێمەی بكات. ئالێرەشدا ناتوانم بڵێم كام خەمەی ڕێبوار لە پێشترە: ئایا لە دوا ئەنجامدا (جیهانی مرۆڤی كورد) و تراژیدیاكانی، تابلۆكانی ڕێبوار دەكەنە تابلۆی

هونەری؟ یاخود مانای ژیان و تراژیدیا لەتابلۆکانی ئەودا، لەجیهانی واقیعمان نزیکدەخاتەوە و لەلامان ڕەنگینی دەکات؟

(8)

یەکێك لە ئەرکەکانی (ڕەنگ) بریتییە لە دروستکردنی تەبایی و ئارامیی و هاوسەنگیی لە ژیانی مرۆڤدا. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، ئەوە دەتوانین بەلەبەرچاوگرتنی گرنگیی ڕەنگ لە هونەری ڕێبواردا، بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە بڵێین: هونەری ڕێبوار بە تایبەتی لەپێشانگای یادی (هەڵەبجە)دا، پێدەچێت نەك ڕەنگدانەوەی ژیانی مرۆڤی ئێمە نەبێت، بەڵکو هەوڵدانێکی زیرەکانەش بێت بۆ خولقاندنەوەی ئەو هاوسەنگی و ئارامییەی ئێمە لە تراژیدیای هەڵەبجەدا، لە دەستماندا و لەوێش بە دواوە بۆ یەکجارەکی لێی بێبەش کراین. بەڵام ئەو هاوسەنگییەی ڕێبوار ئیشی بۆ دەکات هەر لەپێناوی یادکردنەوەدا نییە، بەڵکو لە پێناوی بەرزکردنەوەشییەتی بۆ ئاستە جیاوازەکانی دەربڕینی هونەری. (دەم و چاوەکان)ی ناو تابلۆکانی ڕێبوار مردوو نین و تەماشامان دەکەن، هەر بۆیەشە نامان خەنە گریان، بەڵکو ئارامیمان پێدەبەخشن. تەماشاکردنی ڕووخسارەکان نامانخاتە غایەڵەی مەرگەوە، بەڵکو ژیانمان لەلا خۆشەویست دەکات. هەر ئەمەیشە خاڵی خۆ جیاکردنەوەی ڕێبوار لەسەرجەمی زمانی ئەو ئەدەبیات و وتاری سیاسی و فیلم و شانۆنامانەیش، کە لەدوای تراژیدیای هەڵەبجە، بۆ یادکردنەوەی ئەو تراژیدیایە بەرهەمهاتن و هەتا ئێستاش بەرهەم دێن... بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمانە، لە جیاتی ئەوەی دەلاقەیەك لەبەردەم مرۆڤی کوردا بکەنەوە تا بتوانێت سەرلەنوێ بەردەوام بێت و ژیانی خۆشبوێت، ئەوا ناچاری دەکات بەردەوام لە ماتەمیدا بمێنێتەوە و تازیەبار بێت.. لەجیاتی ئەوەی هێزی ژیاندۆستیمان پێ ببەخشن، خۆڵی مەرگمان بەسەرا دەبارێنن. بەڵام خاڵی جیاکارە لە یادکردنەوەکەی ڕێبواردا، ئەوەیە کە ئەو بەڕووخسار و چیرۆکی پشتەوەی ڕووخسارەکانی، کە پڕن لەبەسەرهاتی ژیانی مرۆڤی ئاسایی، خۆی لەو شەپۆلە هونەرییە جیاکردۆتەوە کە ئەوە ساڵانێکە بەناوی: یادکردنەوەی تراژیدیای هەڵەبجە ⌈وە، ناهێڵێت

ئێمەی کورد لەژووری تازیەکەماندا هەستینەوە و هەناسەیەکی کامەرانی هەڵکێشین.. پێنج هەزار ڕووخسارەکەی ڕێبوار بانگهێشتنی ئێمەیە بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ پێنج هەزار چیرۆك و بەسەرهاتدا.. ڕێبوار خۆی دەکاتە حەکایەت بێژێك تا بە حەکایەتە ڕەنگینەکانی پێنج هەزار فرسەخ ترسی مردنمان لەسەردا بکوژێت و بایی ئەوەش بە هاوسەنگی و تەبایی ژیانمان ئاشنا بکاتەوە. یادکردنەوەی تراژیدیای ئێمە، لەم پرۆژەیەدا پەیوەندی بەستنە لەگەڵ مانای مەرگی قوربانیدا وەك مەرگێك کە چیدی نابێت دووبارە ببێتەوە. مەرگی قوربانی نمونەیەکە نەك سەرمەشقێك. ئەمەش بەوەی کە ئێمەی زیندووسارمۆنیای یادکردنەوەکانمان بکەینە سەرەتایەك بۆ مانابەخشین بە ژیان، نەك نەمرکردنی مەرگ.

** **

ڕەنگە هەر ئەمەش خاڵی پێکگەیشتنی خوێندنەوە فیکرییەکانی زۆر لە نووسەرە تازەگەرەکانی ئێمە و خوێندنەوە ئێستاتیکییەکەی ڕێبوار سەعید بێت، واتە ئاگایی و ئاوڕدانەوە لە خاڵی باوەشکردنەوە بۆ ژیان لە هونەر و ڕاڤەکردنی فیکریانەدا، ئەمەش بەتایبەتی دوای ئەوەی لەواقیعدا مافی ژیانت لێدەسەنرێتەوە. من ئەم خاڵە ناودەنێم هاوچەرخیبوون، کە لەهەمان کاتیشدا بەڵگەیە لەسەر تێهەڵکێشبوونی چارەنووسی گوتاری فیکری و گوتاری ئێستاتیکی لە خوێندنەوەیاندا بۆ کۆمەڵگا و لە ڕەخنەیاندا بۆ گوتاری سیاسیی ئێمە. چونکە لە کاتێکدا گوتاری سیاسی نرخی ئەم پرۆژەیە بەوەدا هەڵدەسەنگێنێ، کە ئاخۆ هەڵەبجە چۆن لە کارەکانی ڕێبواردا (ڕەنگیداوەتەوە؟)، ئەوە خولیای خوێندنەوە ئێستاتیکی و ڕەخنەییەکانی ئێستای ئێمە ئەوەیە، گۆڕانێك لە دیدی ئێمەدا بۆ ژیان و هونەر و بەشداربوونی هونەر لە یادکردنەوەکاندا بێنێتە دی.. واتە لەکاتێکدا کە گوتاری سیاسی هەموو مانای بەرهەمی هونەری لە وەفاداریدا بۆ ئامانجە سیاسییەکان بچووکدەکاتەوە، ئەوە خوێندنەوە هاوچەرخەکان بانگهێشتمان دەکەن بۆ چوونە ناو جیهانی بەرهەمەکان و ئاشکراکردنی دەلالەتە شاراوەکانی ناویان.

ئەو دەلالەتانەی پێش هەموو شتێك بەهای کارەکان وەك کاری هونەریی سەربەخۆو وەك ئەنجامی ئەزموونی ستاتیکی هونەرمەند لە ژیاندا دەسەلمێنن.
رشیچبوار لەم پرۆژەیەیدا ئەوەی سەلماندووە کە دەکرێت (هونەر لە خوێندنەوەیدا بۆ دنیا خۆی لەدەسەڵاتی خوێندنەوەی گوتاری سیاسی ڕزگار بکات و ئەو نرخانە ڕەتبکاتەوە کە ئەو گوتارە لەسەر پرانسیپە نا ئێستاتیکییەکانەوە پێی دەبەخشن. چونکە ئەوە ڕاستە کە ڕێبوار سەرجەمی پرۆژەکەی لە پێشانگایەکدا (خستۆتە ڕوو)، بەڵام خستنەڕووی کارەکان بەمانای (ئاشکراکردن)ی نهێنییەکانی داهێنانی ئێستاتیکی نییە. نیازی ڕێبوار لە کردنی تراژیدیای هەڵەبجە بەسەرچاوەی پرۆژەکەی و پیشاندانەوەی لە پیشانگایەکدا، هەر ئەوە نەبووە یادی ئەم کارەساتە بکاتەوە و بمانخاتەوە بەردەم هەمان تراژیدیا. بەڵکو نییەتی ئەوەش بووە کە پێمان بڵێت ئەو چۆن تایبەتمەندی خۆی ئەدات بە هەڵەبجە و لە هونەردا بەرهەمی دەهێنێتەوە. واتە ئەو لە ڕێگای تراژیدیای هەڵەبجەوە، تراژیدیای هونەر و تراژیدیای خۆیمان بەیاد دەهێنێتەوە. واتە ڕیوایەتێکی دیکە لەسەر ئەو بەشەی مێژووی ئێمە بەرهەم دەهێنێتەوە کە تەواو جیاوازە لەو وەسفە ساکار و بەزەیی بزوێنانەی بەردەوام گوتارە سیاسییەکان دووبارەی چەند بارەی دەکەنەوە. بەڕاستی یەکێکیش لە خەسلەتە سرووشتییەکانی هەموو تراژیدیا گەورەکانی وەك هەڵەبجە و ئەنفالیش ئەوەیە کە لەچەندین شێوازی ڕیواتکردن و بەرهەمهێنانەوەدا بەرجەستە دەبنەوە.

ئێستاش بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە سادەکەمان کە گوتم: (ئەو جەوهەرە چییە لەم پرۆژەیەی ڕێبواردا کە بوارمان دەداتی جیای بکەینەوە لە لێشاوی ئەو بەرهەمانەی بۆ تراژیدیای هەڵەبجە بەرهەمهاتن و هانمان دەدات بەشێوەیەکی جیاواز بیخوێنینەوە؟

دەتوانم بڵێم ئەو جەوهەرەی بەپلەی یەکەم هانمان دەدات بۆ قسەکردن و ڕاڤەکردنی ئەم پرۆژەیە بریتییە لە پێویستی بەرهەمهێنانی ڕیوایەتێکی ڕەخنەیی و فیکری و ئێستاتیکی بۆ هەمان تراژیدیا چونکە تەنیا کاتێك بە

دەربڕینی هەمە ڕەنگ و بەئاستی جیاجیا دەکەوینە ڕیوایەتکردن و یادکردنەوەی تراژیدیاکانمان، ئەوە مانای مەرگە قوربانییەکانمان لە(بێمانایی) یادکردنەوە ساکارەکانی ناو ستوونی ڕۆژنامە و خوتبە سیاسیەکان و دەزگاکانی یادکردنەوە، ڕزگار دەکەین و ناوەڕۆکێکی دیکە بە چەمکی یادکردنەوە دەبەخشین.

لەندەن ١٩٩٨/٨/٤

**تێبینی: ئەم وتارە بەشداریکردنێك بوو لەو ئێوارە کۆڕەدا کە هونەرمەند شەماڵ عومەر لەسەر پرۆژەکەی ڕێبوار سەعید لە لەندەن، ڕۆژی ٢٥ی٨ی ١٩٩٨ سازیکرد.**

# یادکردنەوە
## لەنێوان (ستایش) و (پرسیار)دا
### (لە یادی سەدساڵەی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا)

**پێشەکی:**

یادکردنەوەکان تادێن پانتاییەکی فراوانتر لەناو چالاکییە کولتووری و ڕۆشنبیرییەکانی ئێمەدا بۆخۆیان دەپچڕن: هێندەنابێت یادی دەساڵەی کارەساتی هەڵەبجە کرایەوە و پێشتریش یادی چوارسەدساڵەی (شەرەفخانی بەدلیسی) و ئەوەتا ئەمساڵیش یادی سەدساڵەی دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) دەکرێتەوە.

ئایا یادکردنەوەکان چ جۆرە میکانیزم و سیستەمێکی زمانی و فیکری دەخەنە ئیش و چ تێڕوانینێکیش دەخەسێنن و پاسیڤی دەکەن؟! بەمانایەکی دیکە: ئەگەر یادکردنەوە هەڵبژاردنێك بێت، ئایا ئەوەی لەکاتی ئەو هەڵبژاردنەدا پشتگوێ دەخرێ و هەڵنابژێردرێ، چییە؟

نییەتی من لەبەشی یەکەمی ئەم باسەدا ئەوەیە: بەرلەوەی بەشداری بکەم لە(یادی سەد ساڵەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی)دا، دەمەوێ تۆزێ بە وردی سەرنج ڕابکێشم بۆ ئەو مانایەی چەمکی (یادکردنەوە) لەزمانی ئێمەدا بەخۆیەوە گرتووە. دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە، بۆچی چەمکی (یادکردنەوە) هەمیشە هاوشانە بە(ستایشکردن)و بۆ ستایشکردنیش پێویستیمان بەکام سیستەمی داڕشتنی زمانی هەیە؟ لە باسەکەی مندا ئەو سیستەمە بە سیستەمی (ئینشایی) ناو دەبرێت، کە سیستەمێکە تیایدا پرسیار ونە. لەبەشی دووەمدا، مەبەستەکانی سیستەمی ئینشایی لە سێ خاڵدا دەخەمە بەرباس و لەدیدێکی ڕەخنەگرانەوە هەڵیاندەسەنگێنم. لەوێدا بەرپەرچی ئەو ڕوانگەیە دەدەمەوە کە پێیوایە: *تەکنەلۆژیا و ئیمکانیەتەکانی چاپکردن دەبنە هۆی فەراهەمکردنی ڕۆژنامەگەرییەکی پێشکەوتوو.* لەئەنجامیشدا، بەمەبەستێکی تایبەت و بە

کورتی دەگەڕێمەوە سەر ڕۆژنامەی (کوردستان)ی بەدرخانیەکان تاکو ئاماژە بەخاڵێکی درەخشان لەو ڕۆژنامەیەدا بکەم. لەڕووی متۆدییەوە، بابەتەکەی من ناچێتە خانەی مێژوونووسیی (هیستۆریۆگرافی) ڕۆژنامەگەریی کوردییەوە، بەڵکو هەوڵدانێکی شیکاریانەیە بۆ قسەکردن لەسەر ئێستای بارودۆخی ئەو ڕۆژنامەگەرییە.

## بەشی یەکەم:
## مانای چەمکی (یاد) لەناو سیستەمی ئینشاییدا

(1)

پێشبەندی (یاد) لەبیرکردنەوەی کوردیدا زۆربەی جار بەتۆنێکی خەمگین و حەسرەتئامێز بارگاوی بووە. لەبەکارهێنانی کوردیانەی ئەو وشەیەدا، هەمیشە ئاماژەیەکی شاراوەش بۆ شتێکی (لەدەست دەرچوو)، ڕووخسارێکی (لێرەنەماو)، هەوڵێکی لە(ڕابردوودا دراوی نادیار) و خۆزگەیەکی (نائومێدبوو) دێتە گوێ. بەجۆرێ دەتوانم بڵێم، مامەڵەکردنی کورد لەگەڵ ئەو چەمکەدا مامەڵەکردن و هەنگاونانە بەرەو قسەکردن لەشێوازێك لەشێوازەکانی مەرگ و نەمان و فەنابوون. بەمانایەکی دیکە، بونیادی تراژیدیانەی ژیانی ئێمە، ڕوخسارێکی تراژیدیانەشی بە زمانەکەمان بەخشیوە و ئەمەش لەڕێگەی سارمۆنیای (یادکردنەوە)وە بۆتە یەکێك لەخەسڵەتەکانی وێنەی ئێمە بۆ ژیان. چونکە بەپێی تێزەکانی ئەم سەدەیەی فەلسەفەی زمان، ئەوە دواجار لە زماندایە کەمرۆڤ وێنای ژیان دەکات و پێناسەی بۆ دەدۆزێتەوە. ئەوە زمانە کە ئاسۆی بینین و تێگەیشتنەکانی ئێمە دەستنیشاندەکات، جیهانی ئێمە ئەو جیهانەیە کەلەسەر بنەمای ئیمکانیەتەکانی دەربڕینی زمانەوە دروست دەبێت و سنوورەکانی ئەو جیهانەش سنووری زمانین. بەکارهێنانی زمانیش کردەیەکی غەریزی نییە، بەڵکو کردەیەکی مەبەستدارە: ئامانجمان لەقسەکردن بۆ یەکتری هەرتەنیا بەرهەمهێنانی کۆمەڵێ دەنگ و وریتە وریت نیە (ئەگەرچی زۆرجار دەنگ و وریتەش پڕن لەمانا). بەڵکو خستنەڕووی جیهانی خۆشمانە لەڕێگەی

چنینێکی زمانییەوە، واتە *ڕێکخستنەوەی جیهانی ناوەوەمانە لەپەیکەری زماندا*. حەزێکە بۆ بەرهەمهێنانی مانای نوێ و خواستێکە بۆ فراوانکردنی سنوورەکانی دنیای خۆمان. بەڵام لەهەمان کاتیشدا، خستنەڕووی ماناکانی خۆشمانە لەسەر ژیان و دەوروبەر. هەموو وشە و دەنگێ لەزمانی ئێمەدا، جەختکردنەوەیە لەسەر کۆمەڵێ مانا و تووڕدانی کۆمەڵێکی دیکەیە. ڕەنگە یەکێك لە سیحرەکانی زمان ئەوەبێت، کە ناهێڵێت بێلایەن بمێنینەوە: هەموو بەدەنگهاتن و ئاخاوتنێك لایەنگیریکردنە لە مەبەستێك و چاوپۆشینێکی هەمیشەیی، یان کاتییە لەمەبەستەکانی دیکە.

بەم پێیەش ڕستەی (یادی سەدساڵەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی)، ڕستەیەکی بێلایەن نییە. بەڵکو هەڵگری پێناسەیەکە بۆ دیاردەیەك لەژیانی ڕۆشنبیریی ئێمەدا. ئەم پێناسەیەش پرۆسەیەکی بۆ دەستنیشانکردووین کە: (یادکردنەوە)یە، بابەتێکی کردۆتە ناوەڕۆکی خۆی کە: (یەکەم ڕۆژنامەی کوردی)یە و هەروەها ماوەیەکی مێژووییشی کردۆتە سنووری ئەو یادکردنەوەیە کە: (سەدساڵ)ـە.

لەم ڕستەیەدا تێڕوانینێکی تایبەت هەیە بۆ بابەتێکی تایبەت و ئەم تێڕوانینەش لەڕێگەی چنینێکی زمانی تایبەتەوە کە هەڵگری بیرکردنەوەیەکی تایبەتە خۆی ئاشکرا دەکات. واتە ئێمە بەتەنیا لەبەردەم دەربڕینێکدا نین کە مەبەستی هەر ئەوەبێت داوەتمان بکات بۆ بەشداریکردن لەبۆنەیەکدا، بەڵکو لەبەردەم دەربڕینێکیشداین، کەهەڵگری مەبەستێکی تایبەتیشە لەسەر ئەو بۆنەیە. بەمانایەکی تر، ئەو ڕستەیە لەلایەکەوە دەلالەت لە ئامادەیی سیستەمێکی داڕشتن (ئینشایی) لەزمانی کوردیدا دەکات و لەلایەکی دیکەیشەوە، بەڵگەیە بۆ نەبوونی سیستەمێکی دیکەی دەربڕین لەهەمان زماندا، کەدەشێت ناوی بنێین سیستەمی پرسیارکردن، یاخود ڕەخنەیی. چاکترە کەمێ زیاتر لەمبارەیەوە وردبینەوە.

چەمکی یاد لەسەر دووبارەکردنەوە بەندە. دووبارەکردنەوەی سارمۆنیایەك، کەش و هەوایەك، کە تیایدا ئامادەیی دەبەخشرێتەوە بەڕابردوو. لەو

سارمۆنیایەدا ئەوەی جێگەی قسەلەسەرکردنە سەنگ و قورسایی ڕابردووە. خەسڵەت و نیشانە و گرنگیی ئەو دیاردەیەن کە یادی دەکرێتەوە. هەموو ئەمەش کاتێك سەردەگرێت کە ئێمە زۆرترین زانیاری و دۆکیۆمەنت و پسووڵەمان لەسەر ئەو دیاردەیە بەدەست هێنابێت و لەڕێگەی ئاخاوتنمان لەسەریانەوە، ئامادەبوونێکی *ئێستایی* ببەخشینە ڕابردوو.

(٢)

کاتێ چەمکی یاد دەبێتە پەنجەرەی ڕوانینمان بۆ ڕابردوو ئەوە خۆشمان خستۆتە بەردەم ***یادی شکۆ و پیرۆزیی*** ئەو ڕابردووە. وەختێ دەڵێین: (یادی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی)، وشەی (یەکەم) لەو دەربڕینەدا هەربەتەنیا ژمارەی (یەك)مان بیرناخاتەوە، بەڵکو ئەو گرنگیی، ئۆرگینالیەت، دانسقەیی، ڕچەشکێنی و پیرۆزییەشمان بیردەخاتەوە کە دیاردە، ڕووداوو و شتەکانی یەکەمینیش لەگەڵ خۆیان دەیهێنن.. بەم پێیەش چەمکی (یادکردنەوە) دەبێتە ڕوانگەیەك ناچارمان دەکات بۆ ئامادەکردنەوەی ڕابردوو، زۆرترین بەڵگە و وردەکاری لەسەر ئەو دیاردەیەی یادی دەکرێتەوە، بخەینە ڕوو. ئەمەش نەك لەپێناوی گفتوگۆی ڕەخنەگرانە لەگەڵ ئەو ڕابردووەدا، بەڵکو لەپێناوی سەلماندنیدا وەك بەشێك لە ڕابردووی پیرۆزی خۆمان. بیرکردنەوەیەك کە میکانیزمی یادکردنەوە دەکاتە ڕوانگەی خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕابردوودا، بیرکردنەوەیەکە دووچاری کێشەی میتۆدی (واتە شێوەی ئیشکردن و تەیکردنی ئاستەکانی ئەو ئیشکردنە) و کێشەی مەعریفی (واتە چۆنێتی بەرهەمهێنانی زانین بەشێوەیەکی ئاگایانە و تۆکمەکردنی بەهۆی بەڵگەهێنانەوەوە)، نابێت. چونکە بەلای ئەو بیرکردنەوەیەوە ڕابردوویەك هەیە کە هی ئێمەیە و لەڕێگەی ساخکردنەوەی بەڵگەنامەکانیشیەوە پێیدەگەین. واتە کۆکردنەوەی بەڵگەنامەکان، ساخکردنەوە و داڕشتنەوەیان بەپێی سیستەمی ئینشایی و وەسفکردن و تاووتوێکردنی ستایشکارانەیان یان دەبێتە ئەرکی سەرەکی. لێرەوەیە کە (یادی سەد ساڵەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی

کوردی)، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین ڕستەی وەسفی کە دەیانەوێت (ناوەڕۆك، شێواز، ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە، شوێن و کاتی دەرچوونیان، زمانی ڕۆژنامەکە و هەلومەرجی دەرچوونی) و گەلێك وردەزانیاری دیکەمان بۆ وەسف بکەن. یاخود لەڕێگەی بەراووردکردنی کرۆنۆلۆژیانەی مێژووی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی تورکی، فارسی و عەرەبییەوە، ئەنجامی ئەوە بدەن بەدەستەوە، کە کوردیش لەبواری ڕۆژنامەگەریدا، لە (گەلانی دراوسێی ئەگەر پێشکەوتووتر نەبووبێت، لەدواتر نەبووە). بۆ ئەم جۆرە ئیشکردنەش لەسەر ڕابردوو، پێویستیمان بەخستنەکاری میتۆدی نوێی لێکۆڵینەوە نییە، هێندەی ئەوەی دەبێت وریابین لەنوسینەوەی وردبینانەی (ساڵ و ڕۆژ و ژمارە و شوێنی ڕاستەقینەی دەرچوون)ی ئەو ڕۆژنامەیەدا، کەئەمەش شتێکە هەر خوێنەرێکی ئاسایی دەتوانێت پاش خۆ ماندووکردنێکی کەم پێی هەستێ.

دیدێك کە مێژوو وەك پانتاییەکی سەربەخۆ بۆخوێندنەوە و گفتوگۆ لەگەڵکردن ناخاتە ڕوو، دواجار ناتوانێت لەگەڵ ئەو مێژووەدا ناکۆك بێت و ئەم ناکۆکیەشی وەك کێشەیەکی مەعریفی بناسێنێ. واتە ناتوانێت لەکاتی ئیشکردنیدا بەئاگاییەوە زانینێکی عەقلانی بەرهەم بهێنێت کەپێشتر نەزانرابێت. چونکە لە بنەمادا، هەموو خوێندنەوەیەکی بۆ ڕابردوو، گەڕانە بۆ دۆزینەوەی خاڵی لێکچوون، نەك جیاوازی. گەڕانە بەمەبەستی جەختکردنەوە لەسەر ئەو ڕابردووە، نەك دەستنیشانکردنی مەودایەکی ڕەخنەگرانە لەگەڵیدا. ڕابردوو لەڕوانگەی ئەو دیدەوە، زەخیرەیەکە دەبێت زیندوو بکرێتەوە تا ئێمەش سەرلەنوێ لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە. وەکو چۆن ماتەمی و کۆستە تراژیدیاکانیش بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەدەوری یەکتر کۆماندەکەنەوە و لاواندنەوەی قوربانییەکان دەکەنە ئەرکی سەرەکیمان.

لێرەشەوە، وەسف جێگەی پرسیار دەگرێتەوە، بەپیرۆزکردن و پیاهەڵدان جێگەی ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی ڕەخنەگرانە و دواجاریش، تەسلیمبوون بەڕابردوو جێگەی هەوڵدان بۆ چەسپاندنی پرنسیپی (دووبارە نەکردنەوە)ی هەمان ڕابردوو، دەگرێتەوە. ئەگەرچی پێویستە لێرەدا بڵێم، مانای دووبارە

نەکردنەوەی ڕابردوو لەو ڕوانینە سادەو پێکەنیناوییەوە نەهاتووە، کە ترسی دووپاتکردنەوە[؟]ی ڕابردوومان دەخاتە دڵەوە، بەڵکو پتر مەبەستم دووبارەنەکردنەوەی میکانیزمەکانی ڕابردووە.

(٣)

بەڵام هەرچەندە ڕابردوو شایانی ستایش و پیاهەڵگوتن و نەمرکردنیش بێت، هێشتا ناچارین بەمەبەستی (لێتێگەیشتن)یش پەیوەندی پێوە ببەستین. واتە دەبێت لەشوێنێکدا، *ڕابردوو* وەك *سەرمەشقێك* بخەینە لاوەو وەکو *بابەتێك* ڕووبەڕووی ببینەوە، کەدەشێت ڕەتی بکەین و گومان لەئاست پیرۆزییەکەیدا دروستکەین. ناکرێت ئێمە تاسەر لەگەڵ ڕابردوودا میهرەبان بین و ستراتیژی (ئاشتیی بەردەوام)ی لەبەرامبەردا پیادە بکەین.. چونکە ئەمکارە دەمانخاتە دژایەتیەکی کوشندەوە لەگەڵ ئەم (ئێستا)یەشدا، کە تیایدا ئێمە لەگەڵ یەکتر کەوتوینەتە جەنگێکی بەردەوامەوە. ئەگەر بەڕاستی ڕۆحی ئێمە هێندە میهرەبان و ئاشتیخوازە، کە لەهەڵسوکەوتماندا لەگەڵ ڕابردوو، لەگەڵ بەڵگەنامە و دۆکیۆمەنتە مردووەکاندا خۆی دەنوێنێ، بۆچی هەمان ڕۆحییەت لەمامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئێستا و لەگەڵ زیندوێتی ئێستادا، هێندە شەڕانگێز و بەدگومانە؟ بۆچی مرۆڤێکی کورد لەساتی ئێستادا ئامادەیە سڕینەوەی ژیانی مرۆڤێکی دیکەی کورد بەهەر بەڵگەیەك، بکاتە ئامانجی خۆی، بەڵام هەر ئەو مرۆڤە لەکاتی یادکردنەوەیدا بۆ مرۆڤەکانی ڕابردوو، بۆ قسەو ڕەفتاریان، بەدیار وێنە و یادگارەکانیانەوە فرمێسك دەڕێژێ و ڕۆمانسیانە دێتە دوان؟

من پرسیار لەوە ناکەم جوانی و بێگوناهی لەڕابردوودا نییە، بەڵکو دەڵێم: ئەو بیرکردنەوەیەی ڕابردوو دەکاتە سەرمەشق و هەموو توانای خۆی بۆ وەسفی شکۆمەندییەکانی ئەو ڕابردووە تەرخان دەکات، ئایا لەهەمان کاتدا بێدەستەڵاتی خۆی لەبەرامبەر بینین و ڕاڤەکردنی جوانییە شاراوەکانی ئێستاشدا ناخاتە ڕوو، یاخود هەژاری خۆی لەئاست بەرهەمهێنانی دواڕۆژدا ئاشکرا ناکات؟

بێگومان ناشیرینیەکانی ئێستا، سەرنجمان بەلای جوانیەکانی ڕابردوودا ڕادەکێشنەوە، گوشاری شەڕانگێزی و بەدگومانییەکانی ئێستا، ئارامی و هەوڵە تەباخوازەکانی ڕابردوومان لەلا شیرین دەکەنەوە. بەڵام هەڵەیەکی گەورە دەکەین گەر ئەو ڕابردووە تەنیا لە بۆتەی جوانیی و تەباییەکانی خۆیدا ببینین. ڕابردووش پانتاییەکە پڕە لەناشیرینی و دزێوی خۆی، لەچەوساندنەوە و نایەکسانی خۆی.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارەش، کەبۆچی جوانیەکانی ڕابردوو بەئێمە گەیشتوون؟، لەو هەوڵدانانەدا بدۆزینەوە کە لەڕابردوودا دراون بۆ ڕزگارکردنیان بەوەی بدرێنە دەست *ئایندە*. ئالێرەدایە ڕابردوو دەبێتە سەرمەشق و فێرمان دەکات: لەڕێگەی جوانکردنی ساتی هەنووکەیی خۆمانەوە، لەڕێگەی ڕێگرتن لە دەستدرێژییەکان، ناڕەوایەتی و چەوساندنەوەکانەوە، (جوانی) لەم ئێستایەماندا ئامادە بکەین، تا ئێستای ئێمەش لە *داهاتوودا* شایانی یادکردنەوە بێت. بەڵام بۆ ئەمکارە سیستەمی ستاییش و دارشتنەوەی وەسفی یارمەتیمان نادات و کار بەوە تەواو نابێت بکەوینە یادکردنەوەی ڕابردوو بەنیازی نەمرکردنی. یاخود ساخکردنەوەی مێژووی یەکبەیەکی بەڵگەنامەکان بەمەستی گەیشتن بە دوا حەقیقەتی ئەو ڕابردووە. بەڵکو گرنگترین خاڵ ڕەنگە تێڕامانێکی ڕەخنەییش بێت بە نیازی لێتێگەیشتنی.

(یادی سەدساڵەی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی)، هەربەتەنیا دانپیأنان و نرخاندنی بەرهەمێك و ستاییشکردنی ئەو هەوڵە گرانبەهایە نیە. بەڵکو بەگەڕخستنەوەی سیستەمێکی ئاخاوتنیشە، دووبارەکردنەوەی سارمۆنیا و کەشێکی خەمگینیشە کەتیایدا کۆمەڵێ دەستەواژە و دەربڕینی تایبەت دەبنەوە بە دەربڕین و دەستەواژەی بڕیاردەر و جەخت لەسەر *بینینێکی چەسپاوی پەسەندکراویش* دەکەنەوە، کە لەسەر پرنسیپی ستاییشکردن و نەمرکردنەوە ئیشدەکات. لەکاتی ئێستاشدا، کەم نین ئەو وتار و باسانەی لەسەر ڕۆژنامەگەری کوردی و (یادی سەدساڵە)ی دەرچوونی یەکەم ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیە نوسراون و بڵاوکراونەتەوە. ناونیشانی ئەم باسانە هەرچەندە

جیاوازیش بن، له ئیشکردن بەپرنسیپی ستایشکردن و لێرەشەوە بەگەڕ
خستنەوەی سیستەمی وەسف و داڕشتندا، یەکانگیر و تەبا دەبنەوە. هەموو
ئەمەش ئامادەنەبوونی سیستەمی پرسیار و ڕەخنەمان بۆ ڕووندەکاتەوە.
بێگومان ترس له ڕەخنە، ترسیشه لەگۆڕان و بەرهەمهێنانی ئاینده، هەروەکو
چۆن خۆ بەدوورگرتنیشه لەبەرهەمهێنانی فیکریدا.

بەشی دووەم:

## تەکنەلۆژی/ پێشکەوتن: کۆنترۆڵ

(4)

ئاراستەیەکی باوی ئاخاوتنی ئینشایی لەسەر ڕۆژنامەگەریی کوردیَ، جەخت
لەسەر لایەنی پرۆفیشناڵیزەکردن و بەتەکنیکردنی ئەو ڕۆژنامەگەرییه
دەکاتەوە. دروشمی ئەم ئاراستەیه پێماندەڵێت: کێشەی ڕۆژنامەگەری ئێمه
ئەوەیە، کەهێشتا سوودی لەبوارە پێشکەوتووەکانی تەکنیکی ڕاگەیاندنی
جیهانی وەرنەگرتووە. کەواتە: بەرەو تەکنیزەکردن، بەرەو هێنانەدی
ڕۆژنامەگەرییەکی پرۆفشناڵ کەتیایدا سوود لەتازەترین بەرهەمەکانی زانست
وەرگیرابێت.
لەجەوهەری ئەم بۆچوونەدا وا پیشان ئەدرێ، ئەگەر کوردیش توانای
بەکارهێنانی تەکنیکی ڕاگەیاندنی هەبوو، ئەوە ڕۆژنامەگەرییەکی
پێشکەوتوویشی دەبێت. وەك دەبینین لێرەشدا ئاستی پێشکەوتوویی بەستراوە
بەڕاددەی بەکارهێنانی تەکنیکەوە، کە پرۆفشۆناڵیزەکردن یەکێکه
لەدەرکەوتەکانی. لەبنەڕەتدا ئەم بۆچوونە بەرهەمە تەکنەلۆژییەکان دەکاتە
گەرانتی پێشکەوتن و وەك غایەتێك بۆ گەشەکردنی بواری ڕاگەیاندن دەیانخاتە
ڕوو. لەڕووی مێژووییەوە ئەم لێکدانەیەوەیە بۆ تەکنەلۆژیا و پێشکەوتن،
دروشمی ڕۆشنگەرەکانی ئەورووپای سەدەی حەڤدەیەم بوو. دیارە بۆ
هەڵسەنگاندنی ڕاستیی ئەو تێزەش بەو جۆرەی ئەو ڕۆشنبیرانە دەیانخستە
ڕوو، هێندە بەسە چاوێ بەلاپەڕە خوێناویەکانی ئەم سەدەیەدا بگێڕینەوە، تا

ئەو درندەیە ببینین کەلەپێستی بریقەداری ئەو تێگەیشتنەدا بۆ تەکنیك، خۆی ماتداوە. بەڵام کێشەی ئێمە لێرەدا دەستنیشانکردنی ئەو خاڵانەیە کە هەڵەی کوشندەی ئەو تێڕوانینە کوردییەمان لەبواری پێشخستنی ڕۆژنامەگەریدا، بەهۆی تەکنیك و پسپۆڕخوازییەوە، بۆ ئاشکرا دەکەن. چونکە بەڕاستی لەپشت ئەو بانگەوازەوە نەزانییەکی کوشندە هەستی پێدەکرێت. بەبۆچوونی من دەکرێت لاوازیی ئەو تێگەیشتنە لە سێ خاڵدا کورت بکرێتەوە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

**خاڵی یەکەم: هەبوونی ڕۆژنامەگەرییەکی پێشکەوتوو بەرلەوەی ئامادەیی تەکنیکی پێشکەوتوو بخوازێت، داوای جیهانبینییەکی کراوە و پێشکەوتووی ئازاد دەکات.** جیهانبینی بەمانای هەبوونی دیدێکی سەرجەمگیری ڕەخنەگرانە بۆ لێکدانەوەی جیهان و دیاردەکانی ناوی. ڕۆژنامەگەری جۆرێکە لەڕاڤەکردن(تەئویل)ی دنیا و مەیدانێکی دیموکراتییە بۆ خستنەڕووی ڕاڤەجیاوازەکان لەسەر دنیا. دیارە ڕۆژنامەی ئۆرگان و لایەنەکان دەکەونە دەرەوەی ئەم پێناسەیەوە؛ چونکە ئەوان پێش ئەوەی ڕۆژنامە بن، (زمانحاڵ)ی ئەو لایەنەن کە بڵاویان دەکەنەوە. ڕەنگە ئەو پێناسەیە لەبنەمادا پێناسەی ڕۆژنامەگەرییەکی (ئایدیاڵ)یش بێت، واتە ڕۆژنامەگەرییەك کەئێستا نییە و دەبێ هەوڵ بدرێت بهێنرێتە ئاراوە.

کاتێ ڕۆژنامەگەری وەك (مەیدانێکی دیموکراتی بۆ خستنەڕووی ڕاڤەجیاوازەکان) پێناسە دەکەین، دەبێت مەبەستمان لەچەمکی (دیموکراتی) ئەو ژینگەیە بێت کەتیایدا بیرکردنەوە بەپلەی (ڕاڤەکردنی فیکریانەی جیهان) دەگات، نەك ئەو توندوتیژی و زەبروزەنگانەی لەڕێگەی سەر وتار، بابەتەکان و نامەی خوێنەرانی ڕۆژنامەکانەوە، لەژێر ناوی (ئازادی بیر و دیموکراتیەت)دا پیادە ئەکرێن. کاتێ ڕۆژنامەگەری نەتوانێت دوێنەری فیکر بێت و لەڕێگەی بەدەنگهێنانی فیکریانەی ڕووداوەکانەوە ڕاڤەی کێشەکان بکات و بەرهەمهێنەری پێشبینی و ئایندەبینی بێت، ئەوە لاپەڕەکانی بۆنی جەنگێکی خوێناوی دەگرن کە وشە تیایدا بۆتە چەك. ناشیێت ئەو گرنگیدانەی بەشێکی

زۆری بڵاوکراوه کوردیەکانی تاراوگه بەلاپەڕەی (نامەی خوێنەران، بیری ئازاد و بەرهەمی ستوون نووس و توانج نووسەکان)ی دەدەن، لەڕێزگرتنیانەوه بۆ پرنسیپی (دیموکراتیەت و ئازادی ڕادەربڕین)ەوه هاتبێ. ئەگەر وەهاش بێت، ئەوه بەمانای ئەوەیه تێگەیشتنێکی ساده و نابەرپرسیارانەیان بۆ ئەو مەبدەئانه هەیه و مانای چەمکی دیموکراتی و ئازادی ڕادەربڕین، بۆسەر ئاستی توندوتیژی دوو نووسەر، دوو خوێنەر، یان توانجنووسێك لەبەرامبەر خەڵکانێکی تردا، تەسك دەکەنەوه. بەم تێگەیشتنەشەوه ئیشکردن لەبواری ڕۆژنامەگەریدا، ڕێکوڕاست ڕێگا خۆشکردنه بۆ بەردەوامیدان بەجەنگ لەڕێگەی وشەوه: تەنیا گەر بڕوانینه بەکارهێنانی خوازه (ئیستعاره) لەناو بابەتەکانی ڕۆژنامەگەریی تاراوگەی کوردیدا، بۆمان ئاشکرا دەبێت کەژمارەی ئیستعارەکان بەردەوام لەزیادبووندایه، بەڵام بۆ وەسفکردنی هەمان بابەت که (جەنگ و کوشتاره). بۆ نمونه دەگوترێ: (شەڕی ناوخۆ، شەڕی براکوژی، شەڕی خۆکوژی، جەنگی کوردکوشتن و ماڵوێرانی و خۆتڕێن و تاد..) یان به ئەکتەرەکانی جەنگ دەگوترێ: (سەرداره شەڕانیەکان، پیاوانی شەڕ، سەرۆکه خێڵەکیەکان و هتد). ئێمه لەبەردەم لێشاوێك له ئیستیعارەداین کەهەموویان دەیانەوێت جێگرەوەی هیولای جەنگ بن. ئەمەش دیاردەیەکی ترسێنەره، کاتێ دەبینیت ڕۆڵی ئیستیعاره که چەند ماناییکردنی وشه و ڕزگارکردنێتی لەتاکڕەهەندی مانا، لەلایەن یەك مانای بڕیاردەرەوه دەستی بەسەرا دەگیرێت. وەك ئەوەیه زمانی ئێمه لەئێستادا هەموو وزەی خۆی لەدەربڕینی مانای وشەی (جەنگ)دا کۆبکاتەوه، بەبێ ئەوەی توانای هەبێت ڕەهەندەکانی جەنگ ئاشکرا بکات. کاتێکیش توانای زمان لەم ئاستەدا سەقامگیر دەکرێت، ئیدی هیچ چارەیەکی تری نییه بێجگه لەوەی ببێته *زمانی شەڕ.* هەر بۆیەشه ئەم جۆری ڕۆژنامەگەرییه لەجیاتی دروستکردنی ڕۆژنامەنووسی خاوەن جیهانبینی، کۆمەڵێ مەسرەفکەری وشه لەخۆیان کۆدەکەنەوه، کەهەوڵی یەکەمیان بریتییه لەبارگاویکردنی زمان و گۆڕینی بۆ ئامرازێك، کەبتوانن بەهۆیەوه زۆرترین ئازاری ئەوانیتر بدەن. لەڕاستیدا بەم قسەیه هەر تەنیا مەبەستم لەو بابەتانه نییه

کەلەناو لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاودەکرێنەوە و ئەو مەرجەیان بەسەرا دەسەپێت. بەڵکو مەبەستیشم لەهەموو ئەو کتێبی (ڕەخنەی ئەدەبی، بیرەوەری سیاسی و ڕەخنە دینی)یانەشە کە ئاستی زمان و دەربڕین تیایاندا ئاستێکی ڕۆژنامەگەریانەی هەیە. ڕەنگە هیچ کاتێك ڕۆژنامەگەریی کوردی هێندەی ئێستا لەسەرەتاییترین پرنسیپی ڕۆژنامەگەریی، کە پەیوەندی بەستنە لەگەڵ (ئەویتر)دا، دوور نەکەوتبێتەوەو ئاستێکی توندڕەوانەی بەم پەیوەندیە نەدابێت کە سڕینەوەی مافەکانی ئەویترە. هیچ کاتێ ڕۆژنامەگەریی ئێمە هێندەی ئێستا پووچکردنی کەسایەتی مرۆڤەکان و ژیانی تایبەتیانی نەکردۆتە ئامانجی خۆی.. هیچ کاتێ وەك ئێستا میللەتانی وەك عەرەب، تورك و فارس و کولتووری ئەو میللەتانە لەناو لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی ئێمەدا شوێنی سوکایەتی پێکردن و تۆمەتی نامەشروع و شێواندن نەبوون. هیچکاتێکیش ڕۆژنامەگەریی کوردی هێندەی ئێستا نەبۆتە کارگەی دروستکردنی درۆ، کە ڕەنگە گەورەترینیان ئەو درۆیە بێت ژمارەی ئینسانی کورد لەسەر ئەم زەویە لەماوەی پێنج/شەش ساڵدا، لە بیست، یان بیست و پێنج ملیۆنەوە دەکاتە سی و چل ملیۆن و زیاتریش!

خاڵی دووەم: نەبوونی جیهانبینی لە ڕۆژنامەگەری ئێمەدا، هەر نەبۆتە هۆی سەرهەڵدانی مامەڵەکردنێکی توندڕەو لەگەڵ خۆمان و ئەوانیتریشدا، بەڵکو بۆتە هۆی مامەڵەکردنێکی هاوشێوە لەگەڵ (دەق)یشدا. دەق لەناو ئەم ڕۆژنامەگەرییەدا چیدی هەر سانسۆر ناکرێت، چیدی هەر ناقرتێنرێت و بۆی زیاد ناکرێ، یاخود چارەنووسی دەق لەوەدا کۆتایی پێنایەت کەڕەتبکرێتەوە و بڵاونەکرێتەوە. بەڵکو ئەمڕۆ دەق لەبەردەم مامەڵەیەکی تازەشدایەو بەتاوانی هەڵەی زمانەوانی، ڕێنووس، وشەی بێگانەو ڕەچاونەکردنی خاڵبەندی وەك ئەتککراوێك نومایش دەدرێت. جێگەی سەرنجە لەم نومایشدانەشدا ئیمکانیەتە تەکنیکیەکانی کۆمپیوتەر، وەك: ڕەشکردن، لارکردنەوە، خەت لەژێردانان و خەت لەسەر دانان، گەورەکردن و بچووکردنەوە و هەڵگێڕانەوە و هتد[٣]،

کارەکەیان ئاسانکردووە، بەجۆرێ دەتوانین لێرەوە باس لەڕەهەندی ڕووشکێنەرانەی ئەم تەکنیکە بکەین.
ئەوەی دەق لەم نومایشەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەربەتەنیا ئەوە نییە کە دەکرێتە نیشانەیەك بۆ ئاماژەکردن بەڕۆشنبیریی نوسەرەکەی، بۆ ئاشکراکردنی لاوازییەکانی لە زمان و ڕێنووسدا و هتد. بەڵکو وەك نیشانەیەك کەوتۆتە بەردەم حوکمێکی ڕەها و تاوانی بەکارنەهێنانی *زمانێکی پاراو، ڕێنووسێکی قەبووڵکراو، خاڵبەندییەکی زانستانە و بەکارهێنانی وشەی بێگانە*[^]یشی خراوەتە پاڵ، کە لەگەڵ هەوڵەکانی کۆڕی زانیاری کورد و چەند هەوڵێکی تاکەکەسی هەندێك لەزمانزانەکانیشدا، تا ئێستا لەڕۆشنبیریی ئێمەدا هیچ ڕێکەوتنێکی هەمەلایەنی لەسەر ئەم خاڵانە نەهاتۆتە ئاراوە.
بەمانایەکی تر، دەق لەئێستای ڕۆژنامەگەریی ئێمەدا هەر بۆئەوە بڵاونابێتەوە تا پەیامێکمان پێبگەیەنێ، بەڵکو بۆ ئەوەش بڵاودەکرێتەوە تا ڕیسوایی خۆی لەبەردەم (ستانداردی ڕۆژنامەگەری)شدا ڕابگەیەنێت. واتە لێرەدا نابێت دەق دوای بڵاوبوونەوەی خۆی چاوەڕێی بڵاوبوونەوەی دەقێکی دژ بەخۆی بکات، کە لەسەر ئاستی (ناوەڕۆك و پەیام)ەوە، ناکۆك بن و ماناکانی لەلایەن دەقی دووەمەوە ڕەتبکرێنەوە. یاخود نابێت بڵاوبوونەوەی خۆی هەروەکو خستنەڕووی بوارێك بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دەقەکانی تردا ببینێ، بەڵکو پێش ئەوەی لەگەڵ هیچ دەقێکی دیکەدا گفتوگۆ دروستکات، دەبێت ئامادەی قەبووڵکردنی ئەو چارەنووسەش بێت، کە لەساتی بڵاوبوونەوەی خۆیدا و لەسەر هەمان لاپەڕە، لەلایەن *ستاندارد*[^]*ی ڕۆژنامەگەرییەوە* بەتاوانی بەکارهێنانی وشەی بێگانە، هەڵەی ڕێنووس و هتد. وە ڕیسوا بکرێت.
لەم نێوەندەشدا پێویستە بڕوانینە لاپەڕەی (نامەی خوێنەران) و دیققەت بدەینە ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ هەندێك لە نامەکان دەکرێت: واتە دیققەت بدەینە چۆنێتی بەکارهێنانی نامەکان لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە بۆ ڕووشکاندنی نوسەرەکەیان. لەهەمووشی نارەواتر: بەکارهێنانیان وەك بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی لاوازیی توانای نێرەرەکەیان. لێرەوە (نامە) لەنێرراوێکی تایبەتی

کەسێکەوە، لەپەیامێکەوە کەدەیەوێت ڕوونکردنەوەیەك بۆ کەسێکی تر بخاتە ڕوو، کەهیچ مەرج نییە لەنوسینیدا ڕەچاوی ئاستێکی دارشتنی ئەدەبی کرابێت، تێکەڵ بە پرۆسەی لێپرسینەوەو کۆنترۆڵ دەکرێت. لەم پەیوەندییە تازەیەدا (نامە)کان چیدی ناتوانن وەکو ملکێکی تایبەتی نێوان (نێرەر) و (وەرگر) یان بۆ نێردراو بمێننەوە، ناتوانن بەرگری لەسنووری (Private) بوونی خۆیان بکەن و نەبنە پیشانگایەك لەبەردەم گشتدا. چونکە بەڕاستی یەکێك لە کارکردەکانی نامە پاراستنی سنووری نێوان (تایبەت) و (گشتی)یە و ئەگەر ئێمە دڵنیا بوینایە کە نامەکانمان لەلایەن پۆستەبەرەکانەوە دەخوێندرێنەوە، دایەرەی پۆست مانای نەدەما.

تۆمەتی هەبوونی ڕۆحێکی توندڕەوی تێکشکێنەر لەبزوتنەوەی ڕۆژنامەگەریی ئێمەدا، تۆمەتێکی ئاسان و سادەش نییە. بەڵام ڕەنگە بتوانین یەکێك لەو بەڵگانەی کە پشتگیری ئەم ئیدیعایەی من دەکەن، لەو مامەڵەیەدا بدۆزینەوە کە ڕۆژنامەکوردییەکان لەگەڵ نامەی تایبەتی خوێنەران بۆ ئیدارەی ڕۆژنامەکەو کارگێڕەکانی دەکەن. لەو مامەڵەیەدا، یەکەم گۆڕانی گرنگ کەبەسەر نامەکاندا دەهێنرێت بریتییە لەوەی مافی (نامەبوون)یان لێدەسەنرێتەوە: بڵاودەکرێنەوە، خەت بەژێر هەڵەکانیاندا دەهێنرێت و دواجار لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە وەڵامیان دەدرێتەوە و جارێکی دی هەمان ئەو کەموکوڕیانەی بەهۆی تەکنیکی کۆمپیۆتەرییەوە لەنامەکەدا دەستنیشانکراون، بەنوسینیش لەوەڵامەکەدا دووبارە دەکرێنەوە. لێرەشەوە نامەکان وەك شەخسیترین شتی ئێمە لەبەردەم گشتدا (بۆ مێژوو، یان لەپێناوی خزمەتکردنی کەلتووری کوردا)! بەنیازی ڕووتکردنەوەمان دەخرێنە ڕوو). ڕووتکردنەوە و ئاشکراکردن و پەردە لەسەر هەڵدانەوە)ش بەشێکی گرنگ لەهەر پانتاییەکی کۆنترۆڵ و چەپاندن داگیر دەکەن. یەکێك لەو خاڵانەی لەسەرووی بەرنامەی کاری هەموو تۆڕەکانی جاسووسییەوە هەیە (CIA)، استخبارات، اطلاعات، مێت، دەزگای زانیاری و پاراستن و هتد.)، بریتییە لە میکانیزمی ڕووتکردنەوەو ئاشکراکردنی ژیانی نادیاری تاکەکەسەکان. بریتییە لەچاودێریکردن و کۆنترۆلکردنی هەموو

ئەو پانتاییيانەی (تاکەمرۆڤ) کەسبوونی خۆی لەناویاندا پراکتیك دەکات. لەم پەیوەندیەدا (کەس) وەك بوویەکی بێدەستەلات مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و دۆکیۆمەنتەکان دەکرێنە شایەتی ڕووشکاندن، شێواندنی کاراکتەر و بەڵگەی تاوانبارکردنی. ئەو نامانەی سەردەمێك بۆ گۆڕینەوەی ڕاز و بەیانکردنی دەردەدڵیەکان نووسراون، ئەمڕۆ دەبنە بەڵگە بۆ پشت شکاندنمان. ئەو وێنە و نیگارانەی ڕۆژگارێ بۆ یادگاری گیرابوون، ئێستا بۆ تاوانبارکردنمان نومایشمان دەدەن.

بێگومان حەزی شت زانین لەسەر یەکتری، حەزی گەیشتن بەنهێنییەکانی یەکدی، بەشێکی جیانەکراوەیە لە سرووشتی مرۆڤ خۆی. مرۆڤ، هەر بوویەکی بیرکەرەوە، شەڕکەر، ئیشکەر و نەوسن نیە، بەڵکو کائینێکی (کەشفکەر)یشە. هەمووومان ئەو منالە دەناسین کە لەقۆناغێکی تەمەنیدا بەپرسیارەکانی هەراسانمان دەکات. گشتمان زرمەی ئەو شەپازللەیەمان لەبیرە کەدوای هەڵپێچانی زۆری دایك و باوکمان بۆ زانینی ئەم شت، یان ئەو نهێنی ماڵ، کەهێشتا بۆ عومری ئێمە نەبووە بیزانین، لاڕوومەتمانی سوورکردۆتەوە. ئەم حەزە هەتا لەو ئاستەدابێت، حەزە بۆ فراوانکردن و کەشفکردنی ئاسۆکانی ژیان و حەزێکی خاوێن و بێ ئازارە. بەڵام لەوکاتەوە کە نیەتمان لە کەشفکردنی جیهانەوە دەگۆڕێ بۆ کۆنترۆڵکردنی، ئەوە توندڕەوی جێگەی بێئازاری دەگرێتەوە. ڕۆحی خاوێنی منالیی بەجێمان دەهێڵێت و جەستە بە ژیان نامۆ دەبێت. بۆ ئەوەی جارێکی دیکەش شوێنی خۆشی لەدنیادا بکاتەوە، ئەوە لەجەستەیەکی (یاریکەر)ەوە دەبێتە جەستەیەکی (شەڕکەر). ڕەنگە هەر ئەمەش بێت ئازاری گەورەبوون!

لێرەوەیە دەکرێت باسی هەبوونی ڕۆحییەتێکی کۆنترۆڵکەر لەناو ڕۆژنامەگەری ئێمەدا بکرێت، کە بەهیچ جۆرێك دابڕ نییە لەو ڕۆحییەتە شەڕانی و بەدگومانەی لەئێستای کۆمەڵگای هەردەم گرژبووی ئێمەدا پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان بەڕێوە دەبات. لەکاتێکدا ئیدارەی سیاسی لایەنەکان چەندین خاڵی پشکنین و لێپرسینەوە و دەزگای وەك (ئاسایش، پاراستن و دەزگای زانیاری و بنکەکانی

وەك حسەینییە)یان دامەزراندوەو لەڕێگەیانەوە چاودێری ژیانی تاکەکانی پێدەکەن، لەکاتێکدا هەر سەرکردەیەکی سیاسی بەچەندین شێوە چاودێری ئەندامانی حیزبەکەی خۆی و ئەندامی لایەنەکانی تریش دەکات، (بەمکارەشیان بوونەتە گەرانتی هێشتنەوەی سیستەمی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێم)، کایەی ڕۆشنبیریش دێت تاکو (نامەی شەخسی)، (زانیاری تایبەت) و (دەست و خەت)ی تایبەتی نووسەران لەهەمان پەیوەندیدا و بەنیازی کۆنترۆڵکردنیان بەکار بهێنێت. ئەگینا مانای چییە، ڕۆژنامەیەك، یان هەر بڵاوکراوەیەکی دی، دروشمی (خزمەتکردن بەڕۆشنبیریی و کولتووری کورد) بەرز بکاتەوەو کەچی توندڕەوترین مامەڵە لەگەڵ ئەندامانی ئەو میللەتەدا بکات؟ یاخود مانای چییە دروشمی (دیموکراتی) بەرنامەی کارکردن بێت، کەیەکێك لەپرنسیپەکانی لەبەرچاوگرتنی مافەکانی ئەویترە (تەنانەت مافی پاراستنی نامە شەخسییەکانی) و کەچی لەهەڵسوکەوت لەگەڵیدا، هیچ مافێکی نەدرێتێ جگە لەوەی لەشوێنگەی دەسەڵاتی (ستاندارد ی ڕۆژنامەگەری)یەوە ڕیسوا بکرێ؟ گریمان خوێنەرێك توندوتیژترین نامەیشی ئاراستەی ڕۆژنامەیەك کرد، ئایا هێشتا ئەو ڕۆژنامەیە نابێت سوور بێت لەسەر پرنسیپە مەبدەئیەکانی خۆی و ڕێگە بەخۆی نەدات هەمان مامەڵەی لەگەڵ بکاتەوە؟ ئایا هیچ هەڵەیەکی زمانەوانی و خاڵبەندی و ڕێنووس، لەئاستێکی تاوانی ئەوتۆدان کەخاوەنەکانیان بە میتۆدی دەزگاکانی داپڵۆسین مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و ئەمەش بەناوی (خزمەتکردنی کولتووری کوردی)یەوە ڕەوایەتی بدرێتێ؟! ئەگەر ئەو (کولتوورە کوردییە) نەیتوانیبێت ڕوانینی ئەندامەکانی لەئاست یەکدیدا بکاتە ڕوانینی دۆستانە، ئایا شایانی ئەوەیە خزمەت بکرێت؟ تەنانەت ئەگەر ئەو مامەڵەکردنە لەپێناوی (حەقیقەت)یشدا بێت، کەزۆر جار بانگاشەی بۆ دەکرێت، پێویستە پرسیار بکەین: ئەو حەقیقەتە ئەبێ چ حەقیقەتێك بێت کە هاوشان بە پیادەکردنی زەبرەکانی کۆنترۆڵ و داپڵۆسین بسەپێنرێت؟

ڕەنگە ڕۆژگارێکی زۆر دروشمی ستراتیژیی ئەم دەسەڵاتەی ئێستا بەناوی (ستاندارد ی ڕۆژنامەگەری)یەوە ئیشدەکات، لەڕۆشنبیریی ئێمەدا بریتی

بووبێت لە: (ئەگەر بابەتێکمان لاپەسند نەبێت، دەیخەینە پشتگوێ)، بەڵام ئێستا ئەو دروشمە بریتیە لە: (ئەگەر بابەتێکمان بەدڵ نەبێت، بەڕیسواکراوی دەیخەینە ڕوو). ڕێك ئالێرەشدا (خوێنەرانی بەڕێز) دەکرێنە داوەر و (بڕیاری کۆتایی بۆ ئەوان جێدەهێڵرێت)، کە من پێموایە ئەم دێڕە بێماناترین ئەرك لەڕۆشنبیریی ئێمەدا دەداتە خوێنەر. چونکە داوا لەخوێنەر دەکات ببێتە بینەری نومایشەکانی ڕیسواکردن و دادگاییکردن و ڕووتکردنەوەی نوسەر و وەرگێرو خاوەن بەرهەمەکان.. ئەمەش هەمان مامەڵەیە کە لەکولتووری تۆتالیتاریزمیدا، یەك فەرمان بۆ جەماوەری خەڵك لەپێشچاو دەگرێ: واتە بە گوتەی ژان یۆدریار دەیانکاتە (زۆربەی بێدەنگ!).

خاڵی سێهەم: ڕۆژنامەگەری لەوەدا کە مەیدانێکە بۆ ڕاڤەکردنی جیهان، لەوەدا کە شوێنی بەدەنگهێنانی ڕاڤە جیاوازەکانە لەسەر جیهان، ئەوە میدیایەکی دیموکراتیە. بەڵام گرنگیی ڕۆژنامەگەری هەر لەو دوو خەسڵەتەدا کۆناکرێتەوە کەئەو پێناسەیە پیشانی دەدات. چونکە **لەبنەمادا ڕۆژنامەگەری جۆرێکی داوەری کردنیشە لەسەر جیهان.** ڕەنگە مانای چەمکی (ڕۆژنامە) لەزمانی ئێمەدا مەبەستی پڕاوپڕی کاری ئەو میدیایەمان بۆ ڕوونبکاتەوە کەدەیەوێت: ڕۆژانە لەڕێگەی ڕیوایەتکردنی بارودۆخەکانی جیهانەوە، لەڕێگەی گەیاندنی (نامەی ڕۆژانە!) لەسەر دنیا، داوەرییەکی تایبەتیشیان لەسەر بکات، ئەگەرچی دوا ئازادیی هەر بۆ خوێنەر خۆی دەهێڵێتەوە. (ئەمەش بەپێچەوانەی تەلەفزیۆنەوە، کەبەهۆی خێرایی تێپەڕینی نومایشەکانیەوە بواری ئەو داوەریکردنەمان لێگران و ئازادیمان سنووردارتر دەکات). داوەریکردنیش هیچکات ناتوانێت لەدەرەوەی ڕەچاوکردنی بۆچوونێکی ئەخلاقیی تایبەتەوە ڕەوایەتی هەبێت. بەڵام ئەم ڕەچاوکردنە بەتوندی هەڵگری خەسڵەتەکانی ئەو جیهانبینیەشە کەپراکتیزەی ئەو بۆچونە ئەخلاقیە دەکات. ڕوونکردنەوە:

*نەبوونی جیهانبینی خۆی لەخۆیدا نەبوونی پرنسیپە ئەخلاقیەکانیشە.* هەربۆیەشە ئەو ڕۆژنامەگەرییەی نەتوانێت لەمامەڵەکردن لەگەڵ (جیهانی

ڕووداوەکان)، (دەق)، (خوێنەر) و پرنسیپە ئایدیالّییەکانی ڕۆژنامەگەریشدا مەشروعیەتێك بداتە داوەرییەکانی، خۆی لەبەردەم قەیرانێکی ئەخلاقیشدا دەبینێتەوە. واتە ناتوانێ داوەری ڕەوا بکات. لێرەشەوە، ناتوانێت هەڵگری هیچ پەیامێکی ڕاستەقینەبێت بۆ خۆشکردنی ژیان و تەبایی و بەرهەمهێنانی داهاتوو. ڕەنگە دیارترین دەرکەوتەکانی ئەو قەیرانە ئەخلاقییەش لەو مامەڵە ڕووکەشانەدا بێت، کەڕۆژنامەکان لەگەڵ ڕووداوەکاندا دەیکەن و ئاستی شیکردنەوەی قووڵی هەواڵ و دۆزینەوەی پەیوەندیەکانیان دەهێننە سەر ئاستێکی حەماسی و دروشمخوازانەی پڕ لەهەڵوێست نواندنی تووڕە و هەڕەشە ئامێز و هەڵچوونی ئینشایی. تەنانەت وشەی (هەڵوێست) لەئێستای زمانی کوردیدا بەمانای تووڕەیی و هەڵچوونێکی ئان و ساتییە لەسەر دیاردە ناپەسندەکان. لێرەشەوە، هەڵوێست وەك (تێڕامان و لێخوردبوونەوە)ی مرۆڤ بۆ دیاردەکان فەرامۆشدەکرێت، چونکە ئەمە کردەیەکە تێفکرین جڵەوی دەکات، نەك پەرچەکرداری سایکۆلۆژی ڕووت. دەستنیشانکردنی ئەرکی ڕۆشنبیر لەئێستای ڕۆژنامەگەریی ئێمەدا بەوەی کەدەبێت (*هەڵوێستی هەبێت، بێتە دەنگ، دەور بگێڕێت و ڕاستییەکان ئاشکرا بکات*)، بەر لەهەر شتێك بانگهێشتنە بۆ شانخاڵیکردن لە(*بیرکردنەوە*). زۆریشن ئەو ڕۆشنبیرانەی، یاخود ئەو ڕۆژنامەگەر و ستوونونوسانەی کۆشکی ناوبانگی خۆیان لەسەر سادەترین ئەرکەوە بینا کردووە، بەڵام لە بیرکردنەوەدا وێرانەیەکیان بۆ بەجێهێشتووین.

(5)

بەکارهێنانی تەکنیك و دەرهێنانی پرۆفێشناڵیانەی ڕۆژنامە و بەپیشەییکردنی (حیرفەیی) بواری ڕۆژنامەنووسی کوردیی، چیدی مەیدانێك نین بۆ هەڵبژاردن، بەڵکو تاکە مەیدانێکن کە بەناچاری دەبێت هەڵبژێردرێن. چیدی تۆ ناتوانیت ڕۆژنامە دەرکەیت، ئەگەر سوود لەبوارە تازەکانی چاپەمەنی، ڕازاندنەوەی کۆمپیۆتەری و ڕۆژنامەنووسی پیشەیی و پسپۆڕ و هتد. وەرنەگریت. ئەوەی ڕۆژنامەگەریی خۆرئاوا دەکاتە نمونە لەبەردەم ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، ئامرازە

پێشکەوتووەکانی تەکنیك و هاندانی ڕۆژنامەگەرە کوردەکان نییە بۆ بەکارهێنانیان، چونکە ئیدی ئەو ئامرازانە تاکە ئیمکانیەتن لەهەموو جیهاندا. ڕازاندنەوەی تەکنیکی ناتوانێت گەرانتیی ڕاگەیاندنێکی ڕەواو پێشکەوتووخواز بکات: بەرنامەی بزووتنەوە ڕەگەزپەرستی و ڕەیسیستیەکان، سیاسەتە نایەکسانخوازەکانی ئێستای جیهان، ئیعلانەکانی بازاڕی سەرمایەداری (کەبەرەو ژیانێکی لۆکسی ڕووت، داوەتماندەکەن)، بازاڕەکانی بەسێکسکردن، هونەری سەرگەرمکەر و هەمەپەسەند و ژیانی ناودارەکانی هۆلیۆد، ئیدیعایە بۆ فیلم و لەیستۆکەکانی کەمپانیای دزنی و سەدان نمونەی تر، هەموویان لەسەر لاپەڕەی ئەو ڕۆژنامەو بڵاوکراوانە چاپ دەبن، کە بەپێشکەوتووترین ئیمکانیتەکانی تەکنیك و توانای پرۆفێشنالی بڵاودەکرێنەوە. هەرلەناو هەمان ئەو ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنە پرۆفێشناڵیەشدایە چەندین وتار و بابەت دەخوێنینەوە، کەئامانج لەنوسینیان قوڵکردنەوەی ناکۆکیەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا، دنیای مەسیحی و دنیای ئیسلامی و پووچکردنی بەهای کولتوورەکانی دیکەی جیهانە لەئاست کولتووری ئەمەریکی/ ئەورووپیدا. ئەمە جگە لەوەی لاپەڕەکانیان ڕووبەرێکی ئاوەڵان بۆ بەرهەمهێنانەوەی خواستەکانی عەقڵی پیاوسالاری و درێژەدان بە هێشتنەوەی ئەو میکانیزمانەی پلەی کەسایەتی ئافرەتان لە کۆمەڵگادا بەکەمدەگرێت. کەئەمەش لە پیشاندانی جەستەی ژناندا وەك ئۆبژەکتێکی جنسی ڕووت بەدیار دەکەوێت.. هەموو ئەمانەش ڕووخساری کۆنەخوازانەی ڕاگەیاندنی پرۆفێشناڵیانەی خۆرئاوامان پێدەناسێنن، نەك ڕوخسارە ڕۆشنگەرانەکەی. کەواتە ئەمە ئەو لایەنەی ڕۆژنامەگەریی خۆرئاوا نیە کەدەبێت ببێتە نمونە لەبەردەم بزوتنەوەی ڕۆژنامەگەری ئێمەدا، بەڵکو ڕۆژنامەگەریی خۆرئاواو کۆمەڵگا دیموکراتیەکانی جیهان لەوکاتەدا دەبنە سەرمەشق کە پێماندەڵێن: بۆ ئەوەی یاساکان، سەوداو پەیوەندییەکانی دەسەڵات و کۆمەڵگا بخەینە ژێر پرسیارەوە، یاخود هێزێك ناچار بە پاشگەزبوونەوە لەبڕیارێك بکەین، واتە بۆ ئەوەی ڕۆژنامەگەرییەکی پێشکەوتوومان هەبێت، پێویستە کەمترین وزەی خۆمان بۆ تووڕەیی و

زۆرتریشی بۆ خستنەڕووی ئەو بەڵگانە بخەینەکار، کەئەو بڕیار و یاسایە پووچدەکەنەوە. بەمانایەکی تر، تەکنیك و پرۆفیشنالیزەکردن تەنیا ئەوکاتە دەبنە گەرانتی پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەریی کوردی، کە ڕۆژنامەگەرانی کورد هەڵگری دیدێکی پێشکەوتوو بن بەرامبەر بە بەکارهێنانی بەرهەمە تەکنیکیەکان، دەنا پێشکەوتووترین ئامێری تەکنیکی بۆی هەیە بەزەبرترین ئامرازی ڕووشکاندن و داپلۆسینیش بێت. نمونەی ڕاگەیاندنی نازییەکان لە ئەڵمانیا و بەعسییەکان لە عێراقدا بەڵگەی ئەم قسەیەن.

**بەشی سێهەم:**

## یادی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی، بۆچی؟

(6)

ڕۆژنامەی (کوردستان)ی بەدرخانیەکان، کە ئەمساڵ یادی سەدساڵەی دەرچوونی یەکەم ژمارەی دەکرێتەوە، لەڕووی ڕازاندنەوەو باری ئەندازیاری و ناوەڕۆکی بابەتەکانییەوە، نەك هەر ناتوانێ (ببێتە دەستپێشخەرێك بۆ بناغەدانانی ستانداردی زانستی بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەگەریی کوردی)، چونکە ئەمە پەیوەندی بە ئاسۆی جوانناسی ئێستا و سەد ساڵ لەمەوپێشەوە هەیە، بەڵکو سەرمەشقبوونی ئەم ڕۆژنامەیە لەو هەوڵدانە جیدییەوەی هاتووە کە سەرنوسەرەکەی لە لاپەڕەی یەکەمیدا بۆ چەسپاندنی یەکێك لە پرنسیپە هەرەگرنگەکانی ڕۆژنامەگەری ئاماژەی پێکردووە: ڕۆژنامە پانتاییەکە بۆ هێنانەدی پەیوەندی لەنێوان مرۆڤەکاندا، بەوەی لەڕێگەی ڕیواتکردن و (حیکایەتکردن)ی دنیاوە، زەمینەیەکی هاوبەشیی تێگەیشتنمان لەنێواندا دروست ببێت. کەئەمەش پێش هەموو شتێك خستنەڕووی جیهانبینییەکە دەیەوێت لەڕووداوەکانی دنیا ڕابمێنێت، بیانکاتە بابەتێ بۆ ڕاڤەکردن و لەبارەیانەوە داوەری بکات. یاخود بەزمانی ڕۆژنامەنووسەکەمان خۆی:

*بحتـا قنجيا علم و معرفتا بكم، لكودرى مروڤ د علمه، لكودرى مدرسه و مكتبن قنج هنه، ازى نيشا كردا بكم. لكودرى چه شر دبه، دولتين مـظـن چه دكن، چاوه شر دكن، تجارت چاوه د به، ازى حميا حكات بكم).*

لێرەوە، یەکەم ڕۆژنامەی کوردی نەك هەر هەوڵدانێك بووە بۆ چەسپاندنی خەسڵەتەکانی ڕۆژنامەیەکی ئایدیاڵی، بەڵکو بەهۆی حیکایەتکردنی بارودۆخی جیهانیشەوە، ویستوویەتی مانای وشەی (ڕۆژ/نامە) لەزمانی ئێمەدا وەك زاراوەیەك بچەسپێنێت. چونکە بەڕاستی پێویستیمان بەوەیە هەموو ڕۆژێك سەرلەنوێ ڕیوایەتێکی تازە لەسەر ژیان و جیهانی دەوروبەرمان بەرهەم بهێنین و ***نامەی ڕۆژانەمان*** لەسەر ڕووداوەکان پێبگات. ڕەنگە بەگوتەی میشێل فۆکۆی فەیلەسووفیش، ئەمە تاکە ڕێگایەکیش بێت بۆ ئەوەی: (ڕێگرین لەوەی ببینە فاشی، ئەمەش لەکاتێکدا کەوا دەزانین ئێمە خەباتگێڕ و شۆڕشگێڕین).

لەندەن ١٩٩٨/٨

# ڕۆڵی تەلەفزیۆن
# لە بەرهەمهێنانی زەبروزەنگدا
## (دیدەنیکردنی ئایدیۆلۆژیا و سەرنجدانێ لە سیاسەتی کولتووری)

(١)

**سەرەتایەکی میتۆدی:**

تەلەفزیۆن وەك (دەزگا)یەك بەشێکە لە ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار. وەك بەشێ لە ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار چوارچێوەیەکی (میعماری)ی لە (شوێن)دا داگیرکردووە. ژمارەیەك، یان چەند ژمارەیەك خەتی تەلەفۆنیی هەیە و جێگەی سەرنجدانی خەڵکەو کارمەند و خزمەتچی تایبەت بەخۆی بۆ دانراوە. بەکورتییەکەی هەمان ڕۆڵی مزگەوتو کڵێساو پەرستگاکانی هەیە لە ڕوانگەی ئایدیۆلۆژیای دینییەوە.

ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار دەشێیت تێکەڵێك بێت لەسەرجەمی ئایدیۆلۆژیا باوەکانی دیکەی قۆناغێکی دیاریکراوی ژیانی کۆمەڵگایەك. بەڵام پێدەچێت هەموو دەم ڕووخساری تێکەڵاویانەی بەدەرەوە نەبێت، بەڵکو بەهۆی ڕووخسارێکی بەرجەستەوە گوتاری سەرجەمی ڕووخسارە نابەرجەستەبووەکانی دەربڕێ.. بۆ نموونە: دەشێیت ئایدیۆلۆژیای باوی دەسەڵاتدار ڕووخسارێکی دینی لەخۆی بەرجەستە و ئاشکرا بکات، ئەمە لەکاتێکدا ئەم ڕووخسارە تێکەڵێك بێت لە ئایین، داب و نەریتە کۆن و پەککەوتکان و عەقڵی پاشکەوتووی کۆمەڵگا و ناسیۆنالیزم و ڕەگەزپەرستیو هتد.. گرنگ ئەوەیە ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار لەماوەی دەسەڵاتەکەیدا هۆکارە فەرهەنگییەکانی خۆیشی، (واتە بونیادی شێوازی دەربڕینە ئێستاتیکیەکەشی) چێدەکات. ئەم بونیادە بەهۆی ئایدیۆلۆژیی بوونەکەیەوە تاکڕەهەندەو بەهۆی تاکڕەهەند بوونەکەشییەوە ناتوانێت سەر بەئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار نەبێت. لێرەوە هەموو تێڕوانینێکی بۆ ڕەوەند (پرۆسە) جیاوازە کۆمەڵایەتی و فیکرییەکان،

چوارچێوەیەکی یەکدیدەیی بەخۆیەوە دەگرێت. بەم پێیەش دەبێتە هەڵگری هەموو ئەو تووخمە بکوژانەی دەچنە گیانی بونیادە فرەمەوداکان‌و گوتارە ئێستاتیکیە ئازادەکانەوەو ڕەوەندەکانی داهێنانی کولتووری لەجەستەی کۆمەڵدا دەمرێنن.
بۆیە لەباروودۆخێکی ئاوادا هیچ مەرج نییە سانسۆر ڕەگێکی یاسایی سەر بە ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتداری بەخۆیەوە گرتبێت، مەرج نییە باڵاخانەیەك، فەرمانگەیەك، هەندێ کارگوزار و پسپۆڕ بەناوی دەزگای سانسۆرەوە کاربکەن. مەرج نییە نووسەران‌و داهێنەران‌و هونەرمەندانی دەرەوەی دەزگاکانی ئایدیۆلۆژیای دەسەڵاتدار، بەپێی یەکێ لەبەندەکانی سانسۆر، قەڵەمەکانیان یاساخکرابێتن. مەرج نییە ڕەوتی داهێنانی ڕەوەندەکانی بیر و دیالێکتیکی بزاڤە کولتوورییەکان بە ڕەسمی وەستێنرابن. چونکە دواجار هەموو باڵاخانە و فەرمانگە و کارگوزارانی دەزگای دەسەڵاتدار لەئاست دەرەوەی خۆیاندا، هەمان ئەرك جێبەجێ دەکەن کە دەشێ سانسۆر جێبەجێی کردبا.. ئەوان‌و سانسۆری ڕەسمی لەیەك (چالاکیی) هاوبەشدا یەکدەگرنەوە کە بریتییە لە: شڵەژاندنی بواری سەرهەڵدانی چالاکی نوێ، دەستبەسەراگرتنی هەموو بوارەکانی ڕاگەیاندن‌و ڕاپۆرتدان لەهەموو ئەو بزاڤانەی لەدەرەوەی دەزگاکانی ئایدیۆلۆژیای باو، ڕوودەدەن.
لێکۆڵینەوەو ئاخاوتن لەسەر تەلەفزیۆن‌و خوێندنەوەی شاشە، بەهیچ جۆرێك وەکو خوێندنەوەی دەقێکی ئەدەبی نییە: دەقی ئەدەبی بنەماکانی خۆی لەخۆیدا هەڵدەگرێ، بەڵام تەلەفزیۆن بنەمای دەرەوەی خۆی ئاشکرا دەکات. دەقی ئەدەبی پەیامێکە لە تاکێکەوە (نووسەر) ئاراستەی تاکەکانی دی (خوێنەران) دەکرێت، کەچی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بەرهەمی دەستەیەك لەکارگوزارانی دەزگای تەلەفزیۆنن کە ئاراستەی بینەران دەکرێن. دەقی ئەدەبی لە (نووسراو)دا خۆی دەنوێنێ، لەکاتێکدا بەرنامەکانی تەلەفزیۆن تێکەڵێکن لە نووسراو، نیگار، دەنگ و ڕەنگ..

لەلایەکی ترەوە، تەلەفزیۆن وەك دەزگایەکی ڕاگەیاندن لە زۆر ڕووەوە خۆی لە دەزگاکانی دیکەی ڕاگەیاندن جویّ دەکاتەوە، بۆنموونە: کاتیّ تۆ خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکیت ئازادیی ئەوەت هەیە هەموو ساتێك لەخوێندنەوەی بابەتەکە، یان هەواڵەکەی بەردەستت ڕاوەستیتو لەکاتێکی تردا سەرلەنویّ بیخوێنیتەوە. لەوکاتەدا ڕۆژنامە دەخوێنیتەوە ئازادی ئەوەت هەیە گویّ لەمۆسیقاو غەڵبەغەڵبی دەووبەری خۆت بگریتو لە گفتوگۆو مقۆمقۆشدا بەشداربیتو ڕەنگە بشتەوێت لەهەمان کاتی خوێندنەوەدا، کورتەی نووسراوەکان بۆ کەسانی دەووبەری خۆت باسبکەیت. بەڵام تەماشاکردنی تەلەفزیۆن مەرجی دیکەی هەیەو پرنسیپی دیکەمان بەسەرا دەسەپێنیّ. ئەم مەرجانە بەئاسانی خۆیان نادەن بەدەستەوەو پێویستە زۆربەی هەستەکانمانیان بۆ تەرخان بکەین و خۆمان لەگەڵ (ئەوەی لەدەنگو ڕەنگ، نیگارو نووسراو) بەبەرچاوماندا ڕادەبووریّ، بگونجێنین. یان ڕاستتر وایە بڵێم خۆمانی بدەین بەدەستەوە!

تەلەفزیۆن بەرهەمی قۆناغێکی پێشکەوتووی تەکنەلۆژیایە و تەنیا بەوە لێمان خۆشنابێت کە هەر (گوێی بۆبگرین)، تەنیا هەر (تەماشای بکەین)و تەنیا هەر (بیخوێنینەوە). یاخود لەکاتی گوێگرتنو تەماشاکردنو خوێندنەوەدا مێشکمان ئازادانە کاربکات. بەڵکو یەکێك لەمەرجە هەرە سەختەکانی تەلەفزیۆن ئەوەیە بمانکاتە بەشێك لە ڕووداوو چالاکییەکانی خۆیو واقیعی خۆیمان بەپێی ماوەی بەرنامەکانی بەسەرەوە بکاتە ماڵ و بێگومان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیشمان کاریگەر بێت. (ئی. دیامۆند) دەڵێت: لەکاتی تەماشاکردنی تەلەفزیۆندا، بینەر هیچ توانایەکی نییە تاکو بەباتە پیشاندراوەکاندا بچێتەوەو شەنوکەویان بکا، وەك ئەوەی خوێنەری ڕۆژنامەیەك، یان کتێبیّ پێیدەکریّ(١). ژان بۆدریار، ڕەخنەگر و فەیلەسووفی پۆست مۆدێرنیش، ئەم بۆچوونە زیاتر قووڵدەکاتەوەو دەڵێت: بینەری تەلەفزیۆن مرۆڤێکی مۆنۆپۆڵەکراوە(٢).

ئەو هەواڵانەی لە کوردستانەوە دێن، پێماندەڵێن ئەوڕۆکە لەهەرێمی حکومەتی کوردستاندا ئێمە خاوەنی زیاتر لەچەند کەناڵێکی تەلەفزیۆنو هەرکەناڵەی

نوێنەرایەتی ئایدیۆلۆژیانەی پارتێکی کوردی، یان چەند پارتێکی کوردیی دەکات.
ئەوەی لەم سەرنجانەدا دەخرێتە بەرباس بریتییە لەو پەیوەندییەی کە بۆدریار لەنێوان دەزگایەکی ڕاگەیاندن (تەلەفزیۆن)و بینەرەکانیدا بە ڕەوەندی مۆنۆپۆلیزەکردن ناوزەدی دەکاتو منیش دەمەوێت دەستنیشانی هێڵی ئایدیۆلۆژی ئەم ڕەوەندەو هەندێ لەمەترسییەکانی بەسەر بکەمەوە و بێگومان بەوهۆیەوە کە لەزمانی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان دەدوێین، شتێکی ئاشکرایشە مەبەستمان لەبینەران، بینەری بەرنامەکانی ئەو کەناڵانەن. لەبەرئەوەی پێشتریش گوتم تەلەفزیۆن بنەماکانی دەرەوەی خۆی ئاشکرا دەکا، ئەوە ناچارین بەپێی توانا ئەو بنەمایانە بەسەر بکەینەوە. دەستمایەی سەرەکیی ئەم باسە جگە لەچەند نامەیەکی تایبەتی، کە بەشێوەیەکی گشتی و (لە لابەلای دەنگوباسەکانی تردا) باسی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان و بەتایبەتیش شاری سلێمانی دەکەن، بریتییە لە بینینی (سێ) کاسێتی ڤیدیۆیی ئەو کەناڵە تەلەفزیۆنیانە، کە سەرجەمو بەلەبەرچاوگرتنی هەندێ دیمەنی دووبارەوەبوو لەهەردوو کاسێتەکەدا، ماوەی (حەوت سەعاتو نیو)ی ڕەنگاو ڕەنگ دەخایەنێ.
ویستوومە لەم باسەدا خۆم لەدووبارەکردنەوەی هەندێ بوار بپارێزم. وەکو بەسەرکردنەوەی تێڕوانین و بۆچوونی پارتە کوردییەکان بەشێوەیەکی دوورودرێژ، لەسەر: ڕۆڵی ئەدەبو هونەر و بەشێوەیەکی گشتی (سیاسەتی کولتووری)یانو ڕایان لەسەر کۆچکردنو دیاردەی پەنابەرێتی گەنجانی کورد بۆ دەرەوە.. ئەم پشتگوێ خستنە بەو نیازە بووە، کە بەشێکی زۆری خوێنەری کورد لەو سیاسەتانە شارەزان، لەنزیکەوە ئاگاداریانن‌و ڕەنگە لەژێر کاریگەریشیاندا بێتن. هۆی دووەمی هەمان پشتگوێ خستن، بریتییە لە نەبوونی سیاسەتێکی کولتووری لەچوار چێوەیەکی داڕێژراودا کە مرۆڤ بتوانێت بۆی بگەڕێتەوە. هەروەها گوێم نەداوەتە ئەو ڕێگرە ڕەوشتامێزانەی (اخلاقی)، کە دەشێت توێژەوانان لەئاست ڕووبەڕوو بوونەوەی شێڵگیرانەی دیاردەکاندا

سست بکا. بۆ نموونە: یەکێك لەو ڕێگرانە ئەوەیە کە دەڵێت، گوایە دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان (تازە و کەم ئەزموونن) و نابێت هەر لە ئێستاوە ڕەخنەیان لێبگیرێت.. یاخود ئەوەیان کە دەڵێت: پارتەکان شەهیدیان داوە و نابێت سەرکۆنە بکرێن و پێویستە توانای چاوپۆشینمان هەبیٚو هتد.

دیارە ئەم ڕێگرانە بەپلەی یەکەم دروستکراوی سیاسەتی پارتە کوردیەکان خۆیانن‌و لەسەر جەستەی قەڵەمدارانی کوردیش کاریگەری خۆیان بەجێهێشتووە. هەر ئەم ڕێگرانەن دیدەی ڕەخنەگرانەی ڕۆشنبیرانی کورد لەسەر شەڕی چەکداری تاکۆتایی هەشتاکان دەپەستێویٚ و هەر هەمان ڕێگرن کە ئاخاوتن لەسەر گەلێك لایەنی کولتووری سیاسیی ئێمەو کاریگەرییە بەدەکانی ڕادەگرن.. ئەم جۆرە ڕێگرانە بەحوکمی پەسەندبوونیان بەلای (چەندایەتی زۆرە)وە، ڕۆڵی دەمکوتکردنی (چۆنایەتی کەمایەتی)ش دەگێڕن.

ئەم جۆرە ڕێگرانە نەك هەر زیانیان بە چالاکبوونی عەقڵی ڕەخنەیی ئێمە گەیاندووە، بەڵکو لەدووبارەبوونەوەو چەندبارە بوونەوەی زۆر ڕووداوی دڵـەزێنیشدا، زۆر هەڵەی درێوو زۆر خیانەتی گەورەیشدا ڕۆڵی خۆیان گێڕاوە: ئەگەر پاشخانی کولتوورییانەی پرنسیپی (چاوپۆشین) نەبایە، یەکەم شەڕی براکوژی دواشەڕی لەم جۆرە و یەکەم چوونەپاڵ دەوڵەتانی داگیرکەر دواهەڵەی لەم بابەتەو یەکەم ماچکردنی جەللادێکی وەك سەرەك کۆماری عێراقیش، دوا خیانەتی گەورە دەبوو بەناوی مرۆڤ و کولتووری کوردەوە. ئەم ڕێگرانە کە زیاتر لەچوارچێوەیەکی ڕەوشتامێزدا خۆیان دەنوێنن، جگەلەوەی نازانستین، ئەرکی درێژەپێدانی هەندیٚ فەرمانی دێرینەی کۆمەڵگاشیان لەسەرشانە، کە ئەو فەرمانانە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆی ئێمە هیچ بەهایەکیان نەماوە، ئەگەرچی بەزیندوویش مابێتنەوە.

بۆکەسێك بیەوێت سیمای بەوێنەکراوی ئایدیۆلۆژیای پارتە کوردیەکان دیاری بکات، پێویستە ئاگاداری ئەوەبێت تەلەفزیۆن یەکەم بوار نیە ئەو ئەرکەی ئەنجامدابێت. چونکە نیشانەی سەر (نامە و نووسراوی ڕەسمی) هەرپارتیٚ، دروشمەکانی سەردیوار و نیشانە گرافیکییەکانی لایانەوە، وێنەی سەر دیواری

شەهیدان، وێنەی سەرۆك پارتو شێوازی ڕازاندنەوەی چوارچێوەکانیانو پلاکاتو بانگەوازی ئاهەنگ و بۆنەکانی حیزب، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە: هونەری فۆتۆگرافی (بەتایبەتی کامێرای کۆداکی فەوری) کەم تا زۆر ئەو سەرەتایانەن کە سیمای ئایدیۆلۆژیا لە (نووسراو)ەوە دەگوێزنەوە بۆ نیگار و وێنە و نیشانەکان و لەچوارچێوەیەکی دیداریانەدا بەرجەستەیان دەکەنەوە.
لێرەوە، نیەتی من لەم باسەدا ئەوە نییە تەلەفزیۆن بەسەرەتایەك بۆ ئەم دیاردەیە (واتە دیدەنکردنی ئایدیۆلۆژیا)، دەستنیشان بکەمو بمەوێت وەك دۆزینەوەیەکی نوێی لەقەڵەم بدەم. بەڵکو درێژەی ڕەوەندەکەم مەبەستە کە بەر لەپەیدابوونی تەلەفزیۆنیش لەشێوەی پێکهاتەی پارتەکاندا هەندێ میتۆدو میکانیزم هەبوون کە ئەرکی دیدەنکردنی پەیامە ئایدیۆلۆژیەکانیان لەسەرشان بووە. بەهۆی ئەم قسەیەوە گەرەکمە بڵێم: ئێمە چیدی ناتوانین لەئاستی خۆدەربڕینی فیکریو میتۆدی ئایدیۆلۆژیای پارتەکاندا، ڕەهەندی نوێ بدۆزینەوە. چونکە چیدی ئەم خۆدەربڕینە ڕەهەندی نوێو کەناڵی نوێ بەرهەم ناهێنێ، بەڵکو لەسەر ئاستی نوێ خۆی بەرهەمدەهێنێتەوە. لێرەوە، بۆنموونە تەلەفزیۆن پەنجەرەیەکی نوێیە تا پارتەکان پرۆژەکانیانی لەڕێگەوە بەرهەمبهێننەوەو دیمەنەکانی سەردیوار، نیشانە ڕەسمییەکانی پارتو سەرجەمی لایەنەکانی دی نومایشە ئایدیۆلۆژیە نەبزۆکەکان بکەنە دیمەنو پەیامی زیندووی ناو سندووقی تەلەفزیۆن. کەواتە ئەمە بەرهەمهێنانی نوێی ئایدیۆلۆژیا نییە، بەڵکو چەسپاندنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە و لەو ڕێگەیەشەوە گۆڕینێتی بەئاگایی ڕۆژانەی پەسەندکراو. بە سەرچاوەی هۆشمەندیی ڕۆژانەو پارسەنگی لێکدانەوەکان. دیارە بۆکارێکی ئاوا، پێویستە پەنا بۆهۆکارێکی ئەوتۆی کاریگەر ببرێت کە توانای پەستاوتنی نائاگایی مرۆڤی هەبێت و لەدەسەڵاتیدا بێت زۆربەی هەستەکان داگیر بکات. لەچاو ئەو بۆرەخسانە تەکنیکیانەی ئەمرۆی کوردستانیشدا، بێگومان تەلەفزیۆن باشترین هۆکارە بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجە. ئالێرەوە، شتێکی بەڵگەنەویستە کە پارتە کوردییەکان هەمان ڕوانینیان لەسەر ئەرکی دەزگایەکی وەك تەلەفزیۆنیش

هەبێت کە لەسەر ئەرکەکانی ئەدەبیش هەیانە. لەڕوانگەی ئەوانەوە ئەرکی ئەدەب بەپلەی یەکەم، دەبێت نوێنەرایەتیکردنی ئایدیۆلۆژیانەی پارتی بێتو پەیامەکانی بەخەڵك، چینو توێژەکانی کۆمەڵگا ڕابگەیەنێت و هتد. تەلەفزیۆنیش وەك بوارێکی تازەی ڕاگەیاندن لەڕوانگەی بەرژەوەندیی حیزبەوە هەمان ئەرکی بۆ لەپێشچاوگیراوە. بەڵام بەشێوازێکی تەکنیکی بەرزترو بەئاکامی کاریگەرانەی خێراترەوە. بۆ سەرگەڕخستنی ئەم پرۆژەیەش، دەبێ حیزب (دەستی هاوکاری) بۆ هونەرمەندان، ئەدیبانو شاعیران ڕابکێشیّو (بواریان بۆ بڕەخسێنیّ) تا لەئاست (ئەرکە نەتەوایەتی و نیشتیمانیەکانیان)دا کەمتەرخەم نەبن. هەورەها (ئازادییان بدرێتیّ) تا بەهۆی بەرهەمەکانیانەوە کۆمەڵانی خەڵك بەئاگا بهێننەوە. بەکورتییەکەی: تەلەفزیۆن بکرێتە ئەو سندووقەی کەهەر پارتەی بتوانێت زۆربەی خەڵك بهاوێتە ناوی(٣).

تەلەفزیۆن بەحوکمی جادووبازانەی ناردنی پەیامەکانی، بەحوکمی ئەوەی گوایە واقیعمان پێشاندەدات، دەسەڵاتی ئەوەی هەیە هونەرمەندی بەناوبانگ، شاعیری بەتوانا، ئەدیبی خاوەنبیر و ڕۆشنبیری چالاك بەرەوە خۆی ڕابکێشیّو بیانکاتە بێژەری پەیامە ئایدیۆلۆژییەکان.. لەلایەکی ترەوە: جادوبازی شاشە و زیندوێتی وێنەکانی لەتوانایدایە جەللادەکانمان لێبکاتە پەیامبەرانی پاشەڕۆژ، خیانەتکارانمان لێبکاتە قارەمان، قاچاخچی و دەستبڕە سیاسیەکانیشمان لێبکاتە دیپلۆمات و دەمڕاست. مرۆڤی نەزانمان لێبکاتە دیپلۆمات و دەمڕاست و ڕێپیشاندەر. بەکورتییەکەی لەکۆمەڵگایەکی وەك ئەوەی ئێمەدا، بەهۆی نەبوونی زانیاری تەواو لەسەر بوارە تەکنیکییەکان و شێوەی دروستکردنی پرۆگرامو ڕێکخستنی بەرنامە، تەلەفزیۆن توانای هەیە کەسایەتیەکی ساختە بۆ هەموو ڕووخسارێکی ئەودیو شاشەوە دروستبکات و لە ڕووبەرە واقیعیەکانمان دووربخاتەوە(٤).

تەلەفزیۆن بەئاسانترین شێوە دەتوانێت لەگەڵ هەستو ئاگایی بینەرکانیدا پەیوەندی دروستبکات و بەهۆی (واقیعی شاشە)وە لەزەمینەی کۆمەڵایەتیو دەوروبەری خۆی دابڕ بکات.. مەترسی تەلەفزیۆن بەو ئاراستە مۆنۆپۆڵییەی

ئەوڕۆکە لە کوردستاندا جێبەجێ دەکرێت، لەوەدایە کە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێ جۆرێ مرۆڤ پەروەردە بکا، توانای هەیە کاریگەرییەکی ئەوتۆ بکاتە سەر منالآن، کە پانتایی زەینیو هۆشی ئەو مرۆڤە نەتوانێت بەشێوەیەکی ڕاستو دروست، هەستەکانی بەکاربهێنێتو توانای لێکدانەوەی دیاردەکانو ڕەخنەلێگرتنیان بمرێنێ. بۆیە لێدوان لەم ڕووە پڕ مەترسییەی تەلەفزیۆنەکانی کوردستانو ئاگادارکردنەوەی بەرپرسان لەئاست ئەو زیانەی کە چاوەڕێ دەکرێت بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان بەمرۆڤی کوردی بگەیەنن، ئەرکی هەموو کەسێکە بڕوای بەدوا ڕۆژێك بۆ مرۆڤی ئێمە هەبێت.
هونەرمەند، ئەدیبو ڕۆشنبیری کورد نابێت ڕێگە بەخۆی بدات بەهۆی بەشداریکردن لەبوارەکانی ڕاگەیاندنی ئایدیۆلۆژیای ڕابردووخوازدا، بەشداری لەڕەوەندی وێرانکردنی هەستو توانا سرووشتییەکانی مرۆڤی کوردی پاشەڕۆژ بکات. گرنگە ئەوان بەدرووشمی هاندانی وەك: (بوار بۆڕەخسان، ئازادی پێدان، دەستی هاوکاریو یارمەتی بۆدرێژکردن)و شتی لەم بابەتە، لەخشتە نەچنو نەبنە ئەو گۆیندەیەی بەگوتەی (غادە ئەلسەممان): جگە لەدرۆ و ئاگایی درۆزنانە هیچی دیکەی لە گەروو نایەتە دەرەوە.

(٢)

## وێنە وەك سیاسەت/ سیاسەتی وێنە

والـەر بنیامین لەوتاری (ڕەخنە لەزەبروزەنگ)دا دەڵێت: ئامانجی ڕەخنەگرتن لەزەبروزەنگ لەو پرسیارەدا دەردەکەوێت کە دەبێ ڕەوتی ڕەخنەگرتنەکە بیهێنێتە ئاراوە: (تاکوێ زەبروزەنگ لەکاتی جیاوازداو بۆ مەبەستی جیاواز، هۆیەکە بۆ ڕەوایەتیو ناڕەوایەتیی بەدەستهێنانی ئامانجەکان)(٥).
ئێمە بۆئەوەی بتوانین ئەم گوتەیەی بنیامین لەچوارچێوە میتۆدیو بابەتییەکەی خۆیدا تێبگەین، پێویستیمان بەپێناسەکردنی زەبروزەنگو کاریگەرییەکانی هەیە. بەلآم بۆئەوەی خودی پێناسەکردنەکە نەبێتە چوارچێوەیەك، هەوڵدەدەم ئاستەکانی بەرهەمهێنانی زەبروزەنگ لەبواری

خستنەڕووی ئەم سەرنجانەدا بخەمە ڕوو کە لەسەر بەرهەمی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان لەلام دروستبوون. مەرجی یەکەم لەباسێکی ئاوادا بریتییە لەوەی دووبارەی بکەینەوە، کە پارتەکان بەهۆی تەلەفزیۆنەوە ئایدیۆلۆژیا بەرهەم ناهێنن، بەڵکو بەکاری دەهێنن بۆکردنی ئایدیۆلۆژیا بە (خۆراکێکی پەسەندکراو) لەلایەن هەموانەوە.

تەلەفزیۆن بەپێچەوانەی ڕادیۆ (بەکوردی: ڕادوێ)، بەیاننامەو ڕۆژنامەو بوارەکانی دیکەی بلاوکردنەوەوە کە (نووسراو) ڕۆڵی گرنگیان تیا دەگێڕێ، دەتوانێت ئایدیۆلۆژیا لەسەر ئاستی وێنە و دەنگ و نووسراویش بەرهەم بهێنێتەوە. ئەمە جگە لەوەی بینەری تەلەفزیۆن، بینەرێکی گرێدراوە بەشاشەوە. واتە: ئەگەر گوێگری ڕادیۆ و خوێنەری ڕۆژنامە و بلاوکراوەکانی دی بتوانێت لەکاتی گوێگرتن/خوێندنەوەدا، چالاکی و وزەی هۆشمەندیی خۆی دابەش بکات، ئەوە بینەری تەلەفزیۆن ناچارە لەبەرامبەر شاشەدا هەموو هۆشمەندیی خۆی لەسەر ئەو دیمەنانە چڕبکاتەوە کە (بەبەرچاویا ڕادەبوورن).

بەم پێیە ئەگەر گوێگر/خوێنەر بۆی هەبێت بۆچەند چالاکییەکی جیاواز سود لە کاتێکی دیاریکراو وەربگرێ، ئەوە بینەری تەلەفزیۆن دەبێ تەنیا بەوە ڕازی بێت کە بتوانێت لەگەڵ خێرایی تێپەڕبوونی بەرنامەکاندا بڕبکات!.. لەبەر ئەم هۆیە زۆر گرنگە لەپشت هەموو بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنییەوە، سیاسەتێکی کولتووری(٦) هەبێت و ئەو سیاسەتە کولتوورییە بتوانێت تەلەفزیۆن لەدەزگایەکی گرێدراو بە ئایدیۆلۆژیای دەسەلاتدارەوە بکاتە دامەزراوێکی ڕۆشنکەرەوە. بتوانێ تەلەفزیۆن لەدەزگایەکەوە کە ئەرکی خۆی بە پڕوپاگەندەکردن بۆ پەیامی پارتێکی دیاریکراو دەزانێ، بگۆڕێ بە دامەزراوێکی بەرپرسیار لەئاست کۆمەڵگادا. چونکە مەسەلەکە هەر ئەوە نییە کە تەلەفزیۆن وەلامی نیازە هەمەچەشنەکانی بەشێك لە کۆمەلانی خەلك لە ڕوانگەیەکی یەکلابینەوە بداتەوە، کە دەچێتە خزمەت بەرژەوەندی لایەنێکەوە، بەڵکو ئەرکی گرنگ ئەوەیە کە بتوانێت خاڵی هاوبەش لەنێوان کۆمەڵانی خەڵکدا بدۆزێتەوەو ئاراستەیان بکات بۆ گۆڕینی نیاز و خواستە بەکۆمەڵییەکانیان.

ئەم پێشنیارە کە تەلەفزیۆن دەبێت دامەزراوێکی (سەربەخۆ، ڕۆشنکەرەوە) یاخود (ناگرێدراو)بێت، نەك دەزگایەکی وابەستەی جاڕدان و گرێدراو بەدەسەلاتەوە، پێشنیارێك نییە لە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستاندا پشتگوێ بخرێت و بەهۆی (کەم ئەزموونیو کەم تەمەنی) دەسەلاتی کوردییەوە، پاساوی بدرێتەوە. بەڵکو مەسەلەیەکە دەتوانێت لەپاشەڕۆژی دامەزراوێکی وەك تەلەفزۆین خۆشیدا، دەستنیشانکەر و گرنگ بێت. چونکە لەواقیعێکی کۆمەلایەتیو سیاسی وەك ئەوەی ئێمەدا، بەهۆی نەبوونی بەڵگەی ڕۆشنکەرەوەو ئامادەبوونی بەردەوامی لێڵیو تاریکی لەئاست چارەسەرکردنو گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکانی ڕۆژانەو هەروەها بەژێر لێوەوەکردنی زۆر دیاردە بەیارمەتی زمانی دیپلۆماسیانەی ڕەسمییەوە، هەرکات کەناڵێکی تەلەفزیۆنی، یاخود هەر بوارێکی دیکەی ڕاگەیاندن توانیی سەربەخۆیی خۆی لەپێناوی (ڕۆشنکردنەوە)ی دیاردەکاندا، (نەك تەرویج کردنیاندا)، بەدەست بهێنێت و لەجیاتی خەستکردنەوەی تەمومژەکانو خستنەکاری زمان لووس و تەفرەدەرانی نێو کۆمەڵ، بەڵگەی هۆشمەندانەو مرۆڤی ژێر بخاتە بواری چالاکیانەوە، ئەوە توانیویەتی دواڕۆژێکی باشیش بۆ چارەنووسی خۆی لەلای وەرگرەکانی بەدەست بهێنێت.. هیچ دوور نییە ئەم ئامادەبوونە ڕۆشنگەرانەیە ببێتە هۆی کەمبوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی ئەو ژمارە زۆرەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن، کە بەناوی چالاکی کولتووریو شتی لەم بابەتەوە پێویستی (بابەتیانە)ی خۆیان سەپاندووە.

لەلایەکی ترەوە، هەبوونی ئەو چەند ژمارەیەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا (بۆنموونە لەشارێکدا)، بەهیچ جۆرێ ڕووخساری ڕەوەندی دیموکراتیزەبوونی کوردستان پیشان نادات و نایسەلمێنێ. بەڵکو دیسانەوە ڕاگرتنی ئاستەنگێکی ئایدیۆلۆژییە کە بەناوی دیموکراتیتەوە ئاراستە دەکرێت. با کەمێ زیاتر لەم بۆچوونە وردبینەوە:

هەبوونی ئەو ژمارەیەی کەناڵی تەلەفزیۆن و پشتیوانیکردنیان لەلایەن دەسەلاتی سیاسییەوە، بەمانای هێشتنەوەی هەمان دابەشبوونی خەڵکی

کوردستانە بەسەر ژمارەی پارتەکاندا و بەمانای (بەموڵکایەتیکردنی خەڵك و لایەنگرانە) لەلایەن حیزبەوە. کاتێ گوێمان لێدەبێت فلان تەلەفزیۆن سەر بەفیسارە پارتە، ئەوە مانای ئەوەیە کە لایەنگرەکانی ئەو پارتە بینەرانی پلە یەکی بەرنامەکانی ئەو کەناڵەن. ئەم دابەشبوونە لەسیاسییەوە بۆ کولتووری (چونکە تەلەفزیۆن بەپلەی یەکەم دامەزراوێکی کولتوورییە)، دەشبێتە هۆی دابەشکردنی زانیاریو ئاگایی بینەران (خەڵك) لەسەر واقیعی کۆمەڵگا، کە دواجار بە زەرەرمەندیی ئەندامانی کۆمەڵ دەکەوێتەوە. ئەم زەرەر و زیانە، یەکەمجار لەبواری پەیوەندیی ڕۆژانەی تاکەکان بەیەکتریەوە دەردەکەوێت: (نەبوونی زمانی هاوبەش، گرنگی نەدان بە مافی یەکتر و دابەشبوونی ئەندامانی کۆمەڵ بەسەر ڕوانگەیەکی جیاکەرەوەدا لەسەر ئاستی کاتیگۆریزەکردنی وەك: هاوڕێیان، برادەران و هەڤاڵان) لەجیاتی دروستبوونی ڕوانگەیەك کە تاکەکان خۆیان و ئەوانیتریش پێش هەموو شتێك وەك (هاووڵاتی) ببینن. دیارە پاشانیش ئەم زیانە لە ڕێکخستنەوەی هەرەوەزیانەی کۆمەڵدا (کۆمەڵی وێرانکراودا) چەندین جار زیاتر ئاشکرا دەبێت. ئەمە لەکاتێکدا زانیاری هاوبەش لەسەر ئەم، یان ئەو دیاردەی کۆمەڵگا، زمانێکی هاوبەشیش دروستدەکاتو لێرەشەوە، ئەو دیاردەیە دەبێتە شتێکی بەرجەستە لەبەرچاوی تاکەکاندا و بۆچارەسەرکردنو لەناوبردنیشی (بەپێی مەبدەئی بەجێهێنانی ئەرکی هاوبەش و بەجیاوازیی بیروڕای سیاسیشیانەوە)، تێدەکۆشن.. یاخود بەلای کەمەوە وەکو یەك هەست بە دزێویو زیانەکانی دیاردەی ناپەسند دەکەن و ئەو کاتەش (بێموبالاتی)و (بێبڕوایی) نابنە زاراوەکانی پاساودانەوە و خۆپەڕاندنەوەی خەڵك لە ئەرکەکانیان..

بەبارێکی تردا، هێشتنەوەی دابەشبوونی بینەران لەئاستی کولتووریدا بەپێی لایەنگیرییان بۆ حیزبەکان، خۆی لەخۆیدا وەستانەوەیە لەدژی یەکێك لەبنەما ئایدیۆلۆژیەکانی عەقڵی سیاسیمان. چونکە هێشتنەوە ئەم دابەشبوونە کولتوورییە، هێشتنەوەی ئەو جیاوازییەیە کە لە کولتووری سیاسی ئێمەدا بەشێوەیەکی گشتی ڕەتکراوەتەوە: هیچ پارتێکی سیاسی کوردی نییە جەختی

ـەسەر (یەکگرتوویی) مێژوو، زمان و کولتووری کورد وەك میللەتێکی یەکپارچە، ـەکردبێتەوە. واتە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی ئەوتۆمان نییە کە بنەمای ڕەسەنایەتی خۆی لەسەر ئاستی بەها پیرۆزەکانی کولتوور و مێژووی کوردستانو بیرەوەری دێرینەی مرۆڤی کوردەوە دانەڕشتبێ. یاخود دانی بەنرخی پیرۆز و میللیی ئەو بەهایانەدا نەهێنابێت. کەشکۆڵی هەر حیزبێکی کوردی هەڵدەپشکنی دەیان و سەدان لاپەڕەت لەسەر (شانازی پێوەکردن و بەپیرۆزکردن)ی کەسایەتییە (نەتەوەیی، ڕۆشنبیری و ئایینییەکان)ی قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی کوردت بەرچاو دەکەوێت. هەموو ئەمەیش لەسەر حیسابی (یەکگرتوویی) کولتوور و مێژووی نەتەوەی ئێمەوە (لەقۆناغی بەرگریی ئایدیۆلۆژیای حیزبەکاندا) هاتوونەتە ئاراوە و سەبارەت بەو قۆناغەش لەشوێنی شیاوی خۆیاندا بوون. بەڵام ئەم ئاراستەکردنە لەقۆناغی ئێستادا، کە ئایدیۆلۆژیا لە وزەیەکی (بەرگریکردن)ـەوە بۆتە وزەیەکی (دەسەڵاتدار)، ڕووچاری قەیرانی پراکتیزەکردن هاتووە و بەپێچەوانەی ئامانجە سیاسییەکەیەوە کاردەکات..

ئەم قەیرانەش پرسیاری ئەوەی هێناوەتە پێش: ئایا ئاراستەکردنی بەهاکانی کولتوور و مێژووی کورد بەهۆی ڕەهەندە (ئایینی، میتۆلۆژی، سیاسی و میللیەکەیەوە)، دژی ئەو دابەشکردنە نییە کە ئەمڕۆ پارتەکان لەسەر واقیعی جەستەی مرۆڤی کورد و (کولتوورە یەکگرتوو)ەکەیەوە، بەهۆی بۆنموونە یاردەی: (چەند تەلەفزیۆنییەوە، بادینی و سۆرانییەوە، هەولێر و سلێمانییەوە و هتد) کاری پێدەکەن؟ ئایا ئەمە ئەوپەڕی بێبەرنامەیی عەقڵی سیاسی و ڕەزگاکانی نییە لە ئاست بیناکردنەوەی (خودی یەکگرتووی کولتووری کورد)دا؟!

پرۆژەی تەلەفزیۆن بەبێ هەبوونی سیاسەتێکی کولتووری هیچ کاتێ نابێتە پرۆژەیەکی فەرهەنگیی ئەفراندنی بەرفراوانو لەسنووری کێبڕکێیەکی ئایدیۆلۆژی تەسك دەربازی نابێت. هەر بۆیەشە توێژەر بواری ئەوەی نییە وەك پرۆژەیەکی کولتووری لەم کێبڕکێیانە بدوێ: بوونی ئەو ژمارەیەی کەناڵی

تەلەفزیۆن لە شارەکانی کوردستاندا، نە نیشانەی ناچارییەکە (ضر و ر ٥)، کە (جیاوازیی فیکری) سەپاندبێتی‌و نە نیشانەی هەبوونی پرۆژەی کولتووریشە. بەڵکو بەبارێکی دەروونیدا دەکرێ وەك (بەرگریکردنێکی پارتەکان لە پێناوی پاراستنی سیما و سومعە)ی کۆمەڵایەتی - سیاسی خۆیاندا، لێکبدرێتەوە. ئەمەش خاڵێکە پێویستی بەڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە.

بە ئەزموون دەرکەوتووە، کە (ڕۆشنبیریی گشتیی) کۆمەڵگا پرسیاری خۆی دەکات و کاریگەریی خۆیشی بۆسەر لایەنە دەسەڵاتدارەکان دەبێت. ئەو کاریگەرییەش هەرچەندە سادە و سەر بە ڕۆشنبیرییەکی ڕۆژانەش بێت، هێشتا لەتوانایدایە (کاراکتەر و هەیبەت)ی کۆمەڵایەتیانەی پارت و (شەرافەتمەندیی) ئەو پارتە بخاتە ژێر پرسیارەوە. بۆنموونە: دەستەیەکی کۆمەڵایەتی دەهێنینە پێش چاوی خۆمان کە لایەنگیری پارتێکی دەستنیشانکراوی تایبەتە. ئەم دەستە کۆمەڵایەتییە لەژێر هێزی ململانێ ڕۆژانەیەکاندا و بەنیازی دیتنی دەسەڵات و هەیبەتی پارتەکەی خۆی لەئاست لایەن و پارتەکانی تردا، دێت بە وزەی ڕۆشنبیرە گشتییەکەی خۆی دەپرسێت: بۆچی ئەو پارتەی ئەم خۆی بەلایەنگری دەزانێت وەك پارتەکانی تر ئێزگە و تەلەفزیۆنی نییە و نەیبێت؟(٧).

لەبیرمان بێت ئەم پرسیارە هەر تەنیا داخوازییەك نییە لەپێناوی کردنەوەی ئێزگە و تەلەفزیۆندا، بەڵکو پرسیاریشە لە (هەیبەت‌و شکۆیەك) کە دەبێت ئەو پارتە بەردەوام وەك خۆراکێك بیداتە لایەنگرەکانی تا ئەوانیش لە ململانێ ڕۆژانەییەکانیاندا لەگەڵ لایەنگری پارتەکانی تردا و لەسەر ئاستی ڕۆشنبیریی گشتییەوە، مەسرەفی بکەن. بابزانین پەرچەکرداری گریمانەیی لێپرسراوانی حیزب لەبەرامبەر ئەو پرسیارەدا دەشێیت چی بێت. دیسانەوە دەتوانین بڵێین، ئەزموونەکان ئەوەمان پیشان دەدەن کە لایەنی لێپرسراو لەو پارتەدا کە ئەو پرسیارەی بەرەو ڕوو دەکرێتەوە، دوو ڕێگای دێتە بەردەم. یەکەم: یان ئەوەتا تەسلیمی داواکارییەکە ببێت و دەستبکات بەکردنەوەی (کەناڵی تەلەفزیۆن، دروستکردنی یەکێتی نووسەران، ژنان و ئافرەتان، یەکێتی ئافرەتان و

مامۆستایان، خوێندکاران و قوتابیان، زانایان و تیپی شانۆیی و تیپی مۆسیقا)ی حیزب، بەم کارەیش سەنگ و ئابڕووی خۆی لەلای خەڵکی ڕابگرێت.
دووەم: یاخود بەدەردی (بێ تەلەفزیۆنی)و ئازارو ناڵەی بێ (مینبەر)ییەوە بتلێتەوە و (پیاوەتی)و (هەیبەت)و (شکۆداری) خۆی لەبەرچاوی میللەتدا بدۆڕێنێ(٨).
بەڵام بۆچی حیزب ڕێگا چارەی سێهەم هەڵنابژێرێ، کە بریتییە لە (ڕووبەڕووبوونەوە)ی ئەو داواکارییانەی ڕۆشنبیریی گشتیی کۆمەڵ بەرزیان دەکاتەوە؟ چونکە ئەم ڕێگاچارەیە هێندە مەترسیدار نییەو ناشبێتە هۆی ئەوەی (خەڵك لە حیزب دووركەونەوە)، بەمەرجێ لایەنە بەرپرسیارەکان بەپێی پرنسیپەکانی سیاسەتی کولتوورییان، لەپێش هەموو شتێکدا خۆیان بڕوای پێبهێنن و پاشانیش بۆ لایەنگرانی خۆیان ڕوون بکەنەوە کە: هەبوون و کردنەوەی کەناڵی تەلەفزیۆن و یەکێتییەکان: (قوتابیان، مامۆستایان، ئافرەتان) و هەموو ئەو دەزگایانەی تر، مەرجی (توانایی/بێتوانایی) و (هەیبەت/بێ هەیبەتی)، (پیاوەتی/ژنێتی)و (ئابڕوومەندی/بێ ئابڕوویی) ئەو پارتە نییە. بەڵام لەبەرئەوەی عەقڵی سیاسی ئێمە دواجار گیرۆدەی دوالیزمە باوەکانی باوکسالارییە و لەخەیاڵی خۆیدا بیر لەئەفراندنی میتۆلۆژیە سیاسی - مێژوویییەکان دەکاتەوە، ئەوە ناتوانێت و چاوەڕێی ئەوەی لێناکرێت داواکارییە سادەکانی دەستەیەك لەلایەنگرانی خۆی، بەداواکاری و نیازە گرنگەکانی گشت کۆمەڵانی خەڵك پڕ بکاتەوە.
بەم پێیە لەجیاتی ئەوەی ڕووخسارێکی هۆشمەندانەو پراکتیکی بدرێتە بەرەنگاریکردنەوەی دیاردەکان، تەماشا دەکەین ڕووخسارێکی ڕەوشتامێزانە (اخلاقی)یان پێدەدرێتو حیزبیش بە کردنەوەی کەناڵی تەلەفزیۆنی (پارێزگاری) لەئابڕووی خۆی دەکاتو خاتری لایەنگرەکانیشی دەپارێزێ!
لەلایەکی ترەوە، ئەگەر لەجیهانی هاوچەرخدا سوود وەرگرتن لە (کات)، تایبەتمەندییەکی شارستانی بێت و ڕێکردن بێت لەگەڵ ڕەوتی ژیارەکاندا، ئەوە هەبوونی ئەو ژمارە زۆرەی کەناڵی تەلەفزیۆن لە کوردستاندا (وەك باس

دەکرێ)، ڕۆیشتن نییە بەپێی ئەو تێگەیشتنەی کە جیهانی هاوچەرخ بۆ سوودوەرگرتن لەکات پێشنیاری کردووە. بەمانایەکی تر، تەلەفزیۆنەکانی کوردستان خێراکردنی ڕزگاریی مرۆڤی کورد لەکێشەکانی نییە ، بەڵکو ونکردنێتی لە زۆنگاوەکانی دووبارە بوونەوەدا.. (منالآنی کورد لەم بارەدا گەورەترین زیانیان لێدەکەوێت و دەبێت زۆرترین باجیش بدەن). ئەو کەسەی بەلای کەمەوە لە هەفتەیەکدا (دە) کاتژمێر وەختی خۆی بەدیار بەرنامەی سەرگەرمکەر، فیلمی تورکیو هیندی و فیلمی پلە چواروپێنجی جیهانییەوە بباتەسەر، بێگومان لە زیان و باجدان زیاتر دەستکەوتێکی نەبووە. ئەو منالەی بەفیلمی کارتۆنی (بەدوور لەئاکامی پەروەردەیی گونجاو لەگەڵ گەشەی منالی کورد)و هەروەها بەتەماشاکردنی فیلمی هەڵدانەوەی گۆڕستانو بینینی کەللەسەر و لاشەی مرۆڤی مردوو گۆشکرێت، لەبوویەکی ترس داگرتووی تۆقێنراو زیاتر چاوەڕێی چی لێدەکرێت؟!

## (٣)
## ڕۆڵی تەلەفزیۆن لە (ڕووشکاندن)دا:

پێموایە تا ئێرە لایەنێکی ئەو باسەم ڕوونکردەوە کە (بنیامین) بە ڕەوتی هەر ڕەخنەگرتنێك لە زەبروزەنگ لەقەڵەمی داوە. لێدوان لەئەنجامەکانی ئەم ڕەخنەیە هەڵدەگرم بۆ بەشی کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەلآم لێرە بەدواوە دەچمە سەر لایەنی دووەمی ئامانجی باسەکەمو لەتێبینیو سەرنجی گشتییەوە دەپەڕمەوە بۆسەر بوارێکی تایبەت.

یەکێك لە ڕەهەندەکانی کەناڵی تەلەفزیۆن لەکوردستانداو لەو بەرنامانەدا ئاشکرا دەبێت کە زیاتر بەرنامەی (هونەریو ڕۆشنبیرین)و وەرگرتنیشیان لەلایەن بینەرانەوە (بەپێی میتۆدی سەرگەرمیکردن)، زووتر بەئەنجام دەگاتو خێراتریش لە (دڵی خەڵکیدا جێگەی خۆیان دەکەنەوە) وەك زنجیرەی نومایشەکانی کەشکۆڵ کە بەناوی کاری هونەرییەوە پێشکەش دەکرێن.. تێبینی دەربڕین و ئاخاوتن لەسەر ئەم جۆرە بەرنامانە بەو مەبەستەیە کە

بتوانم کاریگەریی نێگەتیڤانەیان لەسەر مێنتاڵیتەی کوردی ناوەوە لەبەرامبەر کوردەکانی دەرەوەدا وەڕوو بخەم و سەرنج بۆ ئەوەیش ڕابکێشم، کە هەرچەندە ئەم جۆرە بەرنامانە بەناوی (کولتوور و ڕۆشنبیریی)یەوە دەیانەوێت بێگوناهی خۆیان ئاراستە بکەن(٩)و لەمەشدا تاڕادەیەك چاپووك بوون، بەڵام دواجار هەر دەچنەوە بواری خزمەتکردنی سەرجەمی ئایدیۆلۆژیای (بەوێنەکراو)ی حیزبەکان بەهۆی شاشەی تەلەفزیۆنەوە. واتە ئەم بەرنامانە هەر ناوێکیان هەبێت، هێشتا خزمەت بەو ئاراستە ئایدیۆلۆژییە دەکەن کە حیزب لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەهۆیەوە ئایدیۆلۆژیای خۆی بڵاو دەکاتەوە.
بۆ بیرهێنانەوە پێویستە بڵێم: سیاسەتی حیزبەکانی کوردستان بەتایبەتی (پارتی و یەکێتی)، لەسەر کۆچکردنو پەنابەریتی کوردان بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتێکی نەگۆڕ بووەو وشە و زاراوەی وەکو: (هەڵاتن، نابەرپرسیارێتی، بەزیو، چوون بۆ ڕابواردن لە ئەوروپا)و دەیان شێوازی دیکەی دەربڕین گوێمان لێی بووە. هەروەها زۆربەی پەنابەران لەیەکێك لە وێستگاکانی سەفەردا (ئێران، تووران و شام) پاشانیش لەیەکێك لەوڵاتانی خۆرئاوا، لەگەڵ شێوازی دیکەی هەمان سیاسەت دەستەو یەخە بوون. واتە نوێنەر و لایەنگرانی ئەو دوو ڕێکخراوە بەهۆی دەستخستنە کاروبار، بەچاوی نزم ڕوانین، گەیاندنی زانیاری هەڵەو تەنانەت تەنگوچەڵەمە دروستکردنیش بۆ پەنابەرانی نەیاری خۆیان لەلای کاربەدەستانی ئەو وڵاتانە، درێژەیان بەهەمان سیاسەت داوە(١٠). شتێکی ئاشکرایە ئەم ڕەفتار و گوتارانە لە ڕۆژنامەو بڵاوکراوەو ئێزگەی ئەو پارتانەوە جارپیان بۆ درابێتو دیسانەوە شتێکی ئاساییشە هەمان سیاسەت لەم ڕۆژگارەشدا بەهۆی میدیایەکی پێشکەوتووترو لەچوارچێوەی (بەرنامەی سەرگەرمیکردن)ی خەڵکدا درێژەی پێبدرێت..
ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەنییە کە لەشوێنو ژینگەی پەنابەرێکەوە قسان دەکەن و پێموابێت پەنابەران فریشتەی دنیا بن. بەڵکو ئەوەی سەرنجم ڕادەکێشێ هەستکردن بەو مەترسییە کە دەشێیت (سیاسەت/وێنە) لەڕێگەیەوە ڕقو کینەو زەبروزەنگ بەرهەم بهێنێ.. ئەمە جگە لەوەی دەمەوێت سەرنج بۆ

ئەو گۆڕانە ڕابکێشم کە لە نەریتی ئایدیۆلۆژی عەقڵی سیاسی/حیزبایەتی ئێمەدا ڕوویداوە. واتە هەوڵدانی ئەم ئایدیۆلۆژیانە بۆ دروستکردنی سیمایەکی نومایشی بۆخۆیان و شاردنەوەی زەبروزەنگەکانی لەچوارچێوەی بەهونەرکردنی خۆیدا.

## سەرەتاکانی ڕووشکاندن:

لە کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر شێوازی ڕووشکاندن پەیڕەو دەکرێتو کراوە. ڕووشکاندن تایبەتمەندییەکی هەموو کۆمەڵگا تەقلیدیی و باوکسالارییەکانە و ئەم دیاردەیەش لەبواری کۆمەڵایەتیدا بریتییە لە هێرشێکی ڕاستەوخۆی ڕووشکێنەر بۆسەر دەروونی ڕووشکێنراو. لێرەشەوە، ڕووشکێنەر هەردەم پێناسەی شێوازێکی پراکتیزەکردنی هێز و زەبروزەنگی بەسەرا دەسەپێت.

لەکۆمەڵگای تەقلیدیدا، کارپێکردن بەفەرمانە دێرینەکان هەردەم ڕەواجی هەبووەو هۆکارێکی تۆقێنەری هێرشبەرانەی دەسەڵاتداریتی بوون بۆ سەر خودێتی مرۆڤ. لەکۆمەڵگای ئێمەدا ئەگەر فەرمانێکی دێرین بە نیازی ڕووشکاندن نەیتوانیبێ ڕاستەوخۆ هێرش بکاتە سەر لایەنی دووەم (ئەوەی ڕووی شکێنراوە)، ئەوە چ باکمان نەبووە لەوەی جڵەوی فەرمانەکە بەرەو ئەو ڕووبەرانە ئاراستە بکەین کە پەیوەندییەکی (مادیی - ڕۆحی) یان بەلایەنی دووەمەوە هەبووبێت. لێرەوەیە کردەوەی وەك (پڕکردنەوەی سەرچاوەی ئاو و کانیو ژەهراویکردنیان، کلك و گوێ بڕینی وڵاخ، قاچشکاندنی ئاژەڵانو هەڵکەندنو هەڵپاچینی نەمامو خەرمان سووتاندن)و شاکاری لەم بابەتە، سەرهەڵدەدەن.. ئەمانەش هەموویان شێوە سەرەتاییەکانی کارکردنن بەفەرمانە دێرینەکانی کولتووری کۆمەڵگا، کە لایەنێك دژی لایەنێکی دیکەی هەمان کۆمەڵگا بەنیازی ڕووشکاندن ئیشی پێکردوون. لەقۆناغی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتیشدا کارکردن بەهەمان ئەو فەرمانانە ڕەهەندی گەورەتریان سەبارەت بە یاساکانی کۆمەڵ، بەخۆیانەوە گرتووە. هەریەك لە: (نافەك بڕین، ئەم کردنە بارمەتەی ئەو ، ناوو ناتۆرە بەسەرادابڕین، تفەنگ بەسەرا هەڵتۆقاندن..و هتد) شێوازی دیکەی ڕووشکاندن بوون کە ڕووشکێنەر ویستویەتی بەهۆیانەوە

دەروونی ژێردەستەیی و کۆمەڵایەتی ڕووشکێنراویان پێ وێران بکات. هەروەها لە زمانی کوردیدا، جگە لەزمانی پەند و داستانە میللییەکان، زۆر دەستەواژەی وامان هەیە و بەردەوامیش بەکاردەهێنرێن، کە دیسانەوە پیشاندەری دەسەلاتی ڕووشکێنەرانەی بەشێك لەکۆمەڵی ئێمەن لەبەرامبە بەشێ، یان بەشەکانی تری خۆیدا. هەندێ لە نمونەکانیش ئەم دەستەواژانەن: (کلاوبۆدروون، کلاوڵەسەرنان، سەرژنانیو...هتد). شایانی باسە جگە لەوەی ئەم دەستەواژانە مانای کۆمەڵایەتی خۆیان لەبارودۆخی گرژییەوە بۆ خاویو بەپێچەوانەیشەوە، دەگۆڕێن، بەلام تێڕوانینێکی نێرانەی ڕەگەزپەرست لەم دەربڕینانەدا لەدژی ڕەگەزی مێ، ڕەنگیداوەتەوە (لەگەڵ ئەوەشدا کە زوو زوو دڵی خۆمان بەوە خۆشدەکەین گوایە ئافرەتانی کوردستان لە ئافرەتانی دراوسێیان ئازادترن و شتی لەم بابەتە). لەهەموو ئەم دەربڕینانەدا لایەنی مێ وەك لایەنە (عەیبدارەکە) بەرجەستە کراوە. کاتێك دێمە سەر نمونەهێنانەوە لەنمایشە تەلەفزیۆنیەکان، ئەم بۆچوونەی ئێرە زیاتر ڕووندەبێتەوە.

کەوابێ ئێمە ناتوانین مەسەلەی ڕووشکاندن تەنیا وەکو تراژیدیایەکی ئێستای کۆمەڵەکەمان تەماشا بکەین، بەڵکو ڕاستییەکەی لەوەدایە ئەم تراژیدیە، تراژیدی مێژوویی/کولتووری ئێمەیە و لەو ڕێگەیەشەوە تراژیدی هەریەکێ لە ئێمەیە. هەموو ئەم شێوازانەی ڕووشکاندن وا تەماشایانکراوە کە حوکمی ڕەوای دەسەلاتی کۆمەڵایەتیانەی ئێمە بن و تەنانەت زۆرجارانیش وەك ڕێگاچارە ڕێزیان بۆ دابنرێت.. لە کولتووری سیاسیو قۆناغی شەڕی چەکداریشدا زۆربەی ئەم شێوازانە بۆ ڕووشکاندن ئامادەبوونو کاریان پێکراوە. جێی سەرنجدانە لەهەندێ بارودۆخدا میتۆدی ڕووشکاندن وەکو (بەندێکی یاسایی شۆڕش) لەئاست سەرپێچیکەراندا، کە زۆربەی کات خەڵکی گوندەکان بوون، بەکارهێنراون: (بێگاری پێکردن، زەوتکردنی وڵاخ لەوڵاخدار، تراکتۆر زەوتکردن لە جوتیاران و چەککردنی پێشمەرگە)و زۆر شتی دیکەی ئاوا، کە هەموویان شایانی قسە لەسەرکردنن.. گرنگ، هەموو ئەم شێوازانە دووبارەکردنەوەی دەسەلاتمەندانەی ڕووشکێنەرانەن لەئاست ڕووشکێنراواندا.

بەلام بۆچی بەکارهێنانەوەی ئەم فەرمانە دێرینە لەلایەن تەلەفزیۆنەوە، مەترسی چەند جارەی هەیە بۆسەر دەروونی مرۆڤ؟ ئایا خودی فەرمانەکە گۆڕانێکی بەسەرا دێت کە ببێتە هۆی زیادبوونی کاریگەرییەکەی، یاخود تەلەفزیۆن ڕەهەندی دیکەی هەمان فەرمان ئاشکرا دەکات، کە سەختترین کاریگەریی لەخۆیدا گلداوەتەوە؟(١١)

پێش وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەبێت ئەو سەرنجە دووبارە بکەمەوە کە لە بەشی پێشتری ئەم باسەدا خستمە ڕوو: تەلەفزیۆن بەر لەهەر شتێك ئامێرێکە (مۆبێل)و بەرهەمی قۆناغێکی پێشکەوتووی زانستو بیری مرۆڤایەتییە و تا ئەم شوێنە چاوەڕێی زیانی گەورەی لێناکرێت، هەر لەبەر ئەوەش ڕەتکردنەوەی بەشێوەیەکی گشتی شیاو نییە. بەلام کاتێ ئەم مۆبێلە لەچوارچێوەی (دەزگا)یەکدا بەپێی خواستو ئامانجەکانی ئەو دەزگایە بەکارببرێت، ئیدی ناتوانین هەمان پێناسەی پێشووی بۆ بکەین. ئەمەش لەبەر ئەوەی سنووری چالاکییەکانیو لەو ڕێگەیەشەوە: ڕووبەری کاریگەرێتی خۆی فراوانتر کردووە. بۆیە ئەگەر ڕەخنە ئاراستەی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان دەکرێت، ئەوە دەبێت بزانین کە ئەم ڕەخنەیە بەپلەی یەکەم ئاراستەی ئەو لۆژیکە دەکرێت کە تەلەفزیۆن لە ئامێرێکی (ڕاگەیاندنی ڕۆشنگەر)ەوە، دەکاتە دەزگایەك بۆ سەپاندنی دەسەلات.. بەکورتییەکەی ئەم سەرنجانە دژی سیستەمێکی تەکنەلۆژیو بەرهەمێکی تەکنەلۆژیا نین، بەلکو دژی سیستەمێکی عەقلیی نامۆن بە بەکارهێنانی داهێنانە سرکەکانی تەکنەلۆژیا.. کەواتە: تا ئەو کاتەی تەلەفزیۆن بەشێك بێت لە دەزگای حیزبەکانی کوردستان ئەوە بەشێکیشە لەسەرجەمی هێزی دەسەلاتدار و لەم ڕێگەیەشەوە دەتوانێت باشترین هۆی ڕووشکاندنی ئەم سەردەمە بێت لەکۆمەلگای ئێمەدا.

یەکێك لە کاریگەرییەکانی ڕووشکاندن بەهۆی تەلەفزیۆنەوە ئەوەیە، کە ڕووشکێنراو دەخرێتە بەردەم نیگاو ویژدانی سەرجەمی بینەرانی شاشە و دەکرێتە قارەمانی ئەو دیمەنەی پێشکەش دەکرێت. کەسی ڕووشکێنراو دەکرێتە بوویەکی بێدەسەلاتی نێو تەلەفزیۆنو بینەرانیش دەبنە ئەو گشتەی

لەلایەن دەرهێنەرەوە بۆ تەماشاکردن و چێژ وەرگرتن لەدیمەنی پیشاندراوەکە بانگکراون. لێرەوە بینەران نەك هەر دەبنە بەشێکی سەرجەمی ئەوەی بەبەرچاویاندا ڕادەبرێ، بەڵکو بە دانیشتنیشیان بەدیار تەلەفزیۆنەوەو مەشرووعیەتدان بەدیمەنەکان لەڕێگەی تەماشاکردنیانەوە، ڕەوەندی بەرهەمهێنانێکیش تەواو دەکەن کە بریتییە لەڕەوەندی ڕووشکاندنی پیشاندراو. دەتوانم بە دەربڕینێکی تر بڵێم: کاتێك دەرهێنەر (ڕووشکێن) دیمەنی ڕوشکاندن دەخاتە سەر تەلەفزیۆن، مانای وایە (گشت) بانگ دەکات تاکو بەهۆی ڕۆیشتن لەگەڵ ڕووداوی دیمەنەکاندا بەشداری ڕێ‌و ڕەسمی ڕووشکاندن بکەن!

دیارە ئەم سەرنجە زەمینە خۆشکردن نییە بۆئەوەی ئێمە بتوانین بەهۆیەوە داوا لەبینەرانی کورد بکەین تەلەفزیۆنەکانیان (بکوژێننەوە)و لەو ڕێگەیەشەوە بەربەرەکانێ لەدژی بەشداربوون لەو ڕێ‌و ڕەسمەدا بکەین! چونکە هەروەکو پێشتر گوتمان، تەلەفزیۆن لە کوردستاندا وەك دەزگایەکی ڕاگەیاندنی گرێدراو بەئایدیۆلۆژیای حیزبەکانەوە ئامادەیە. ئەمەش ڕێگە بەبینەران نادات لەسەر حیسابی جێگرەوەکان (ئەڵتەرناتیف)ی دی ڕەفتار بکەن. واتە ئەگەر بینەر بەرنامەیەکی بەدڵ نەبوو بتوانێ تەماشای بەرنامەکانی دیکەی شوێن پەسندی خۆی بکات. چونکە جێگرەوەکانی تریش گیرۆدەی هەمان پابەندبوونن بەلایەنەکانی ترەوە، واتە نەبوون بە (جێگرەوە).

کاریگەرییەکی دی نومایشی ڕووشکاندن بریتییە لەوەی کە ڕووشکێنراو بوویەکی بێ پایەو بێ بونیادە، سەرەتای پەیدابوونی لەجیهاندا بریتییە لە ساتی یەکەمی دەرکەوتنی لە شاشەوە. دروستکراوێکی بێ مێژوو، کەسایەتی‌و ڕابردووە و هیچ کەرەستەیەکی نییە تا بەهۆیەوە بەرگریی لەخۆی پێبکات. هەموو مێژووی ئەو بریتییە لەو مێژووەی تەلەفزیۆن لەماوەی پیشاندانیدا بۆی دروستدەکات، دەیکاتە کەسایەتییەکی بێ کاراکتەری نەفرەت لێکراوی بەردەمی خەڵك. سەبارەت بەوەی کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن‌و واقیعی خۆیان دیننە ئەفراندن، ژان بۆدریار ڕایەکی جوانی هەیەو دەڵێ: (وێنەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن - لەوانەش تەلەفزیۆن - چیدی وێنەی واقیع نین، بەڵکو وێنەی

بۆچوونەکانی دەزگای ڕاگەیاندنن لەسەر واقیع، بەرهەمهێنانەوەی هێرۆگلێفیانەی واقیعن)(١٢).

بۆنموونە کاتێك ئێمە نومایشی (پەنابەرێك) لەیەکێ لە تەلەفزیۆنەکانی کوردستاندا دەبینین، نەك هەر تەنیا ئەو پەنابەرە دروستکراوی وەهمی ئایدیۆلۆژیای دەسەلاّتدارە، بەڵکو لەنێوان ئەو، وەك پەنابەرێكو بینەراندا، دیواری (شاشە)ش ئامادەیە. کە ئەو دیوارە (جیاوازیو مەودا)ی نێوان واقیعی بینەرانو واقیعی پەنابەرانیشە.. کەواتە جادووی تەلەفزیۆن هەر ئەوە نییە کە دیمەنێ لەسەر پەنابەران پێشکەش بکات، بەڵکو واقیعی ئەو دیمەنەش بەناوی (واقیعیی پەنابەران)ەوە لە خەڵك دەگەیەنێت، کە ئەمە دواجار بریتییە لە دروستکردنی دیوارێك لەنێوان پەنابەرانو بینەراندا.

نموونەیەکی دی: لەم باسەدا چەند جارێ ئەوەم دووپات کردەوە، کە ئەرکی تەلەفزیۆن ڕۆشنگەرییە. ڕۆشنگەری بەمانای ڕووناککردنەوە و دیدەنیکردنی ئەو ماناو زانیارییانەی کە هەر تاکەکەسێ لە کۆمەڵدا مافی ئەوەی هەیە بیانزانێتو دەتوانێت وەك خاڵی هاوبەش لەگەڵ تاکەکانی دیکەی هەمان کۆمەڵگادا لەسەریان بدوێو پەیوەندی خۆی لەڕێگەیانەوە پتەو بکات. ئەگەر بەرنامە داڕێژانی سیاسەتی کولتووریو بەرنامەکانی تەلەفزیۆن لەئاست ئەم ئەرکەدا ئاگادار نەبن، ئەوە بەلاڕێدابردنی ڕۆڵی دەزگای ناوبراو، دەتوانێ مەترسی گەورەی بۆسەر دەروونی کۆمەڵ هەبێت:

کۆمەڵی ناوەوە چەند پرنسیپێکی گشتیو خۆڕسکی لەسەر بۆنموونە (پەنابەرانی دەرەوە) هەیە، یاخود هەبوو. کە ئەم پرنسیپانە لەژێر دەسەلاّتی کاریگەرانەی پەیوەندییە بونیادیەکانی ناوەوەی کۆمەڵدا (وەك پەیوەندیی خوێنی، تیرەیی، ئایینیو کولتووریو هتد) بەڕێوە دەچن. هەر باوك و دایکێ لەژێر کاریگەری ئەم بونیادانەدا خۆی بەوە (ڕازی) دەکات، کە ژیانو ڕەفتارو ڕەوشتی کەسێتیو هەورەها باروگوزەرانی کوڕ و کەسوکارەکانیان لەدەرەوە (دەبێت چۆن بێت). وێنەی ئەم (دەبێ چۆن بێ)یە بێگومان پابەندی هەندێ هەڵقەی دیکەشە وەك: ڕاددەی ناسینی پێشووی دایكو باوكو دەوروبەری

ناوەوە لەسەر (ئەوروپا)و هەروەها ئەو شوناسەشیان کە لەسەر ئەو زانیاریانەوە دروستبووە، کە پەنابەران لەڕێگەی (نامە، وێنە، فیلمی ڤیدیۆو ڕێگەکانی دی پەیوەندیکردنەوە (بەڕاستیو دروستی، یاخود بەدرۆو زیادەڕۆییەوە) بۆماڵەوەیانو کەسو کاریان دەنێرنەوە.
کاتێك تەلەفزیۆن ئەو پرنسیپانەو ئەم هەڵقەی پەیوەندیانە لەبەرچاو نەگرێت، بێگومان دەبێتە هۆی بەلاڕێدابردنی هەموو ئەو شێوازانەی کە (ناوەوە) وێنەی (دەبێ چۆن بێ)ی خۆی لەسەرەوە بیناکردبوون. چونکە وەکو پێشتریش هێمامان بۆکردووە، لەکوردستاندا تەلەفزیۆن وەك (ڕاستییەك) ئامادەیەو توانای ئەوەی هەیە لەپێناوی ئەم (بەڕاست) ئامادەبوونەدا هەموو ڕاستییەکانی دیکەش لەناو خۆیاندا ناکۆكو ئاڵۆز بکات. با جارێکی دی دایكو باوکێك بهێنینەوە پێشچاوی خۆمان: کاتێك وێنای ئەو دایكو باوکە لەسەر ژیانی (دەبێ چۆن بێ)ی کوڕو کچو کەسو کارەکانیان لەگەڵ ئەو ئەوشتەدا جووت وێنەکەهاتەوە کە تەلەفزیۆن وەك (ڕاستی) نومایشەکانی خۆی لەسەر پەنابەران پێشکەشیان دەکات، ئەوە بێگومان دایكو باوکی ناوبراو خۆیان لەبەردەم کێشەیەکی خێزانیدا دەبیننەوە (بەبێ ئەوەی لایەنی دووەم کە پەنابەرەکەیەو بەهۆی هەڵقەی بونیادە باسکراوەکانی پێشووەوە بە ئەمانەوە دەبەسرێتەوە)، وەك لایەنێکی سەربەخۆ ئامادە بێت. بەڵکو تەنیا وەك (دیمەنێکی نومایشی) ئامادەیە کە لەهەمان کاتدا خۆی وەك (حەقیقەت) لەسەر پەنابەران دەخاتەڕوو.
کەواتە، تەلەفزیۆن بە لەبیرکردنی بونیاد و پرنسیپە گشتییەکانی کۆمەڵگا و پڕکردنەوەیان بەبونیاد و پرنسیپەکانی خۆی، نەکە هەر لە ئەفراندن و چێکردنی زمانی هاوبەشدا بەشداری ناکات، بەڵکو خاڵە هاوبەشەکانیش،لێکدی دووردەخاتەوە و دەیانشێوێنێ. ئەمەش هەمان شتە کە پێشتر بۆدریار ناوێناوە: بەرهەمهێنانەوەی هێرۆگلێفیانەی واقیع.. ئەم شیکردنەوەیە ئەوە دەگەیەنێت، نەك حیزبە کوردیەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ژێر دەسەلاتیان، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی کۆی واقیعی پەنابەرانی کوردیان نییە و بیر لەوە

ناکەنەوە، ئەم مەسەلەیە پێویستی بە خۆئامادەکردن و بەرنامە داڕشتنێکی ستراتیژییانە هەیە.. بەڵکو بەهۆی هاندانی ئەم نومایشە تەلەفزیۆنیانەشەوە لەسەر پەنابەران و تەنانەت هەندێ لایەنی ژیانی ناوخۆیش، کاریێ دەکەن دەستەوەستانیو بێتوانایی خۆیان لەئاست سەکۆی واقیعیی کوردستاندا بشارنەوە. هەروەها بەهۆی سەرگەرمکردنی خەڵکەوە، وزەی پرسیار و ناڕەزایی دەربڕین لە دەروونی کۆمەڵدا بمرێنن(١٣).

## (٤)
## نموونەکان

ئەگەرچی نمونەهێنانەوە لە بەرهەمی تەلەفزیۆنەکانی کوردستان ماندوویی دەوێت (چونکە دێرە بێدەنگە ڕەشەکانی سەرکاغەز، هیچ کاتێ ناتوانن دیمەنە بگۆڕەنگینە بزاوتەکانی ناو شاشە بن)، بەڵام کارێکی پێویستە. ماندوویی دەوێت، لەبەرئەوەی تۆ پێویستت بەوە هەیە ئەو نموونەیە سەرجەمی ئەو تایبەتمەندییانەی لە خۆ گرتبێت کە بەشێوەیەکی تیۆری هێمایان بۆ کراوەو لە هەمان کاتیشدا ئەو نموونەیە، نموونەیەك بێت کەمترین دووبارەبوونەوەی لە خۆ گرتبێ. پێویستیشە، چونکە بوار بۆ خوێنەر - بینەر دەڕەخسێنێت دواجار پابەندی ئەم باسە و دراوەکانی نەبێتو خۆی هەوڵبدات بە لێتێپەڕاندنی ئەم شیکردنەوانە: پەیوەندی خۆی بە نومایشەکانەوە دیاری بکات. گرنگە ئەم قسەیە وەها لێکبدەینەوە: لەبەر ئەوەی کاریگەریی تەلەفزیۆن لەسەر بینەران کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی بێنێوانە (وسیط)، ئەوە پێویستە هەڵوێستی بینەر و پەرچەکردارەکانیشی لە ئاست نومایشە تەلەفزیۆنەکاندا بێ نێوان بێت. واتە لێرەدا ڕۆڵی ڕەخنەگر ئەوە نییە، کە بتوانێت یەك بەیەکی بینەران لە ئاستی کاریگەرێتی نومایشەکان بۆسەریان ڕۆشنکاتەوە، چونکە ئەو کاریگەرییە لەدەرەوەی پەیوەندی نێوان ڕەخنەگر و (بینەر/خوێنەران)دا هاتۆتە دی. بەم پێیە، ئەرکی ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەوە بەپلەی یەکەم باسکردنی ڕاستەقینەی ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان خۆی و نومایشەکاندا هاتۆتە دی. کاتێك ڕەخنەگر لە

چوارچێوەی وتارێکدا پرسیار لەو پەیوەندییە دەکات و ڕەخنەی لێدەگرێ، لەڕاستیدا تەنیا باسی ئەزموونێك دەکات کە خۆی پێیدا تێپەڕ بووە. گرنگیی باسکردنەکەی بۆ بۆ بینەران و نووسینەوەی سەرنجەکانی بۆ خوێنەران: تەنیا لەوەدایە کە ئەزموونەکانی خۆی دەکاتە هۆکارێك و لەگەڵ خوێنەر/ بینەرانی تردا بەهۆیانەوە مشتومڕ و گفتوگۆ دروستدەکات.. بەڵام تا چ ئاستێ ئەزموونی بینەرێکی ڕەخنەگر وەك دەرەنجامێکی گشتی و (زۆربەپەسەند)، ڕەنگ دەداتەوە؟ ئەمەیان کەس ناتوانێت پێشتر بڕیاری لەسەر بدات. بەڵام هەرکات ئەو پەیوەندییە بووە پێوانەیەك لەلای بینەری ئەو نومایشانەی گفتوگۆیان لەبارەوە کراوە، ئەوە ڕەنجی بینەری ڕەخنەگر بەزایە نەچووە.

لێرەبەدواوە سێ نمونە لەنومایشە تەلەفزیۆنیەکان دەهێنمەوە، کەپێموایە تا کاتی نووسینی ئەم باسە (حوزەیرانی ١٩٩٣)، بەرجەستەترین گوتاری تەلەفزیۆنەکانی کوردستان بن. گرنگی ئەم نمونانە بۆ ئێرە لەوەدایە نمونەی ناسراون و ئەمەش وادەکات پێویستیان بەشیکردنەوەی دوورودرێژ نەبێت. هەروەها لەنێوان نموونەکاندا "تەباییەکی نومایشی" هەیە، واتە لەوانەیە لە یەك دیمەندا تەنیا یەکێکیان بەشداربێت و لەوانەیشە هەرسێ نمونەکە قوت بووبێتنەوە. ئەمەش نمونەکانن: یەکەم: ڕەوشتامێزی/بەمۆراڵکردن(نمونەی دینی). دووەم: ڕووتکردنەوە(نمونەی فەرمانی دێرینە و نەریت). سێهەم: ناوچەچێتی (نمونەی ئایدۆلۆژیی دەسەلاتدار).

## (١) بەمۆراڵکردن:

مەبەستم لەبەرکارهێنانی زاراوەی بەمۆڕاڵکردن یان ڕەوشتامێزی، پێناسەکردنی ئەو دیمەن و بەرهەمە تەلەفزیۆنیانەیە کە دیاردەیەك لەدیاردەو کێشەکانی کۆمەڵ دەخەنە ڕوو، یاخود دەیانەوێت لەئەنجامی پیشاندانی دیاردەیەکەوە، خەڵکی لەمەترسییە پەیوەندیدارەکان بەو دیاردەیەوە ئاگادار بکەنەوە (بۆنموونە مەترسیی ڕاوەماسی لەنزیك ئێزگەی بەرهەمهێنانی کارەبا، بڕینەوەی

دارتەلی کارەبا، هەڵکەندن‌و بردنی چەتری سەرگۆڕەکان‌و پەردەهەڵدانەوە لەسەر ڕیشوەخۆریی پۆلیسی ڕێگای هاتوچۆ و هتد).

خستنەڕووی ئەم دیاردانە بەنیازی کەمکردنەوەیان خۆی لەخۆیدا کارێکی گرنگە، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەیان‌و تەفسیرکردنی مەترسی ئەم دیاردانە لەڕوانگەی ئەخلاقییەوە، ئەو چارەسەرە زۆر لاوازەیە کەهیچ کاریگەرییەکی بنەبڕکەر دروست ناکات. بۆنموونە، کاتێك تەلەفزیۆن لەیەکێ لەدیمەنەکاندا فەرمانبەرێکی دایەرەی کارەبا ڕووبەڕووی ماسیگرەکان (ڕاوچییەکانی ماسی) دەکاتەوە، ئەرکی ئەو فەرمانبەرە (وەکو لەو دیمەنەدا دەبینین) پەند و ئامۆژگاریکردن‌و تەمبێکردنی ڕەوشتامێزانە نییە بەهۆی بەکارهێنانی ڕستەی وەك: (ئەرێ کاکە عەیب ناکەن، شەرم ناکەن؟!).. بەڵکو وا چاوەڕێ دەکرێ زمانی فەرمانبەر، زمانی ڕۆشنکردنەوەی مەترسی تەقاندنەوەی دینامیت بێت، لەنزیك بەربەستێکی بەرهەمهێنانی کارەباوەو پاشانیش تێگەیاندنی کاریگەرێتی ئەو مەترسییەو بێکارەبایی بەگوزەرانی خەڵکەوە بێت.. ئەمجا خستنە بەرباسی قەلاچۆکردنی سامانی ئاوی (ئەوەی لە کیمیاوی ڕزگاری بووە)، بەهۆی دینامیت تەقاندنەوە، کارێکی شیاوە یان نە، ئێرە شوێنی باسکردنی نییە.

بەهەمان شێوە، لە دیمەنی پیشاندانی پۆلیسی هاتوچۆ (مروور)و لێکهەڵوەشاندنی پرد و دادگاییکردنی تاوانباراندا، چارەسەری ڕەوشتامێز و پەند و وەعزی مەلایانە، جێگەی (شیکردنەوەی پیشەیی) ورد و پیشاندانی کاریگەریی ئەو دیاردانە بەژیانی ئێمەوە، دەگرنەوە.. لێرەشەوە زمانی ڕەوشتامێز، کە لەڕاستیدا زمانی مزگەوت‌و دامەزراوە ئایینییەکانە، دەبێتە زمانی پێشکەوتووترین هۆی ڕاگەیاندن‌و عەقڵی دەسەڵاتداری باویش لەشێوەی ئامۆژگاریی مەلایانەدا خۆی بەیان دەکات.

## (٢) ڕووتکردنەوە:

لە دیمەنی ڕووتکردنەوەدا، بینەر کەسێکی ***سیسەڵە*** لەدواوە دەبینێت، کە لەیەکێك لە گەڕەکە پێشکەوتووەکانی شاری هەولێردا جانتایەکی چەرخداری گەڕۆك بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت. ئەو کەسە مرۆڤێکی (لاواز، پرچ درێژ، قاچڕووت)ـەو بەڕەنگی پێستیشیا لە هاوڵاتیانی کوردستان ناچێت. تەنانەت زمانیشی کوردی نییە. لەدووەمین بزاڤی کامێرای هەمان دیمەندا (دیمەنی لۆنگ شۆت)، بینەر ڕووبەڕووی کەسێکی (قەڵەو، بەتواناو چوارشانە)ی (کوردی پۆشی، کوردیگۆ) دەبێتەوە کە لەپاش هەڵوێستەیەکی سەرسام ئامێز لەئاست کەسی یەکەمدا، یەکەم ڕستەی ئەوەیە کە بەکەسی یەکەم بڵێت: (ئای لەو کیژە جوانەی!).

باکەمێ لەم دیمەنە وردبینەوە. هەڵبەت حەزدەکەم خوێنەر ئەوەش بزانێت کە من تەنیا لەسەر دەلالەتەکانی جوڵەی کامێرا لە دیمەنی ناوبراودا قسان دەکەم، نەك لەسەر ئاستی ڕۆڵی دیالۆژەکانو جووڵەی ئەکتەرەکان، کە لەدیمەنەکەدا گرنگیی خۆیان هەیە. دوو خولەکی یەکەمی ئەم دیمەنە ڕووبەڕووی ئەو دوالیزمەمان دەکاتەوە کە ئایدیۆلۆژیای باوی دەسەڵاتدار لە نومایشە تەلەفزیۆنیەکانیدا سوودی لێوەرگرتووە: (لاواز/قەڵەو)، (کوردی پۆش/بێگانەپۆش)، (پرچ درێژ/پرچ کورت)، (کوردیگۆ/ناکورد) و (پیاو/ژن). ئەگەرچی ئەم دابەشبوونە لە خولەکەکانی لەوەدوای نومایشی ڕووتکردنەوەدا دەبێتە دابەشبوون لەسەر ئاستی: (کورد لەدەرەوە/کورد لەناوەوە)، بەڵام دوانەی (پیاو/ژن) لەسەرجەمی بەرهەمەکەدا ئامادەیە و لەهەموو دووبارەبوونەوەیەکیشیدا، بەشی دووەمی هەریەکێ لەم دوانەیە لەبۆتەیەکی نزم و نێگەتیڤدا وەڕووخراوە.

لەڕاستیدا دیمەنی ڕووتکردنەوە دواهەنگاوی دەسەڵاتدارێتییە کە بەهۆیەوە پەیوەندی دەسەڵاتمەندانەی خۆی بە (ئەویتر)ەوە دیاری دەکات. سەرەتا بە (ئەویتر)ی بێگانە و پاشان (ئەویتر)ی خۆیی. لەڕوانگەی ئەم ئایدیۆلۆژیایەوە (ئەویتر) هەم لاوازە، هەم بێ ئابڕوو، چونکە پرچی درێژە و لاقی ڕووتە. هەم

(نابەرپرسیارە و خۆ ونکردووە) چونکە زمانی کوردی لەبیرچۆتەوە. سزای ئەوکەسەش ئەوەیە بە (مێ) ناوبرێ: (ئای لەو کیژە جوانەی)!. ئامادەبوونی ئەم بونیادە پەتریارکیە لە زمانی تەلەفزیۆنەکانی کوردستاندا، هیچ پەیوەندییەکی بەو پرنسیپە کۆمەڵایەتییانەوە نییە (وەك لەکۆتایی بەشی سێهەمی ئەم باسەدا لێیان دوام)، کە کۆمەڵی ناوەوە بەهۆیانەوە وێنەی خۆی لەسەر تاکەکەسی دەرەوە چێ دەکات و پێیان قابیلە.. بەڵکو ئەمە یەکێکە لەبونیادەکانی ئەو عەقڵەی لەڕێگای تەلەفزیۆنەوە دەکرێتە عەقڵی باوی پەسەندکراو. ئەویش بەیارمەتی زیندووکردنەوەی بونیادە دێرینەکانی کولتووری پاشکەوتووی ئێمە.

## (٣) ناوچەچێتی:

ناوچەچێتی وەك زاراوەیەك بەکاردەهێنم کە ئامادەیە بۆگۆڕینو لابردنو پڕکردنەوەی جێگاکەی بە زاراوەیەکی دیکەی گونجاوتر. بەهۆی سوود وەرگرتن لەم زاراوەیەوە دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە زمانی تەلەفزیۆن چۆن بەهاوکاری نەریتی ناوچەخوازانەی ناوچەیەك، (شارێك لەشارەکانی کوردستانو لەژێر کاریگەریی دابەشبوونی ئەو شارە بەسەر یەکێك لە حیزبە گەورەکاندا)، هەوڵدەدات پەسندێتی و گرنگیی خۆی بەسەر ناوچە و شارەکانی دیکەدا بسەپێنێ.

بۆنموونە: لەیەکێك لە نومایشە بەرهەمهاتووەکانی کەناڵێکی تەلەفزیۆنی سلێمانیدا، باوکێك دەبینین لە هەندەرانەوە نامەیەکی کوڕەکەی بۆ هاتووە. پەیامی ئەم نومایشە بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی (باوکان/بینەران) کە (کوڕەکانیان/ لە ئەوروپا زمانی کوردییان بیر چۆتەوە). نیازی تەلەفزیۆن لەم دیمەنەدا بریتییە لە ڕووشکاندنی ئەو (کەسە، نائامادە، پەنابەرە)، لەبەردەمی (باوك/بینەران)داو پاشانیش بەشێوەیکی گشتی سەرزەنشکردنی ئەو باوکانەی کوڕەکانیان لە ئەوروپا زمانیان بیرچۆتەوە.

وەڕووخستنی نومایشی لەبیرچوونەوەی زمانی کوردی لەنێو پەناباەراندا، تەنیا هەروەکو (نومایش) دەمێنێتەوەو بنەمایەکی بابەتیانەی نییە. چونکە بەهۆی تێکەڵبوونی زاراوەکانی زمانی کوردی لە هەندەران و وشە و زاراوەخواستی کوردان لەشێوە دیالێکتی ناوچەی یەکتری، نەك هەر زمانیان دەوڵەمەندتر دەبێت، بەڵکو ئەم پەیوەندیانە ڕۆڵی خۆشیان لە (پاراو)کردنی زماندا دەگێڕن.
بەلام با بزانین تێگەیشتنی تەلەفزیۆن بۆ (لەبیرچوونەوەی زمان) چۆنە؟
لەم دیمەنەدا، بەپێچەوانەی پەیامی نومایشەکەوە، نێرەری نامەکە زمانی بیرنەچۆتەوە، بەڵکو شێوەی زمانی لە شێوەی (سۆرانی)یەوە بۆتە شێوەی (بادینی). ئەمە ئەگەر واقیعی شاشەمان بەسەندکرد. بەلام لەبەرئەوەی چەقی قورسایی نومایشەکە ناوچەی سۆرانە و شوێن سلێمانییە و سلێمانیش بەپێی دابەشبوونی سیاسی ئێستای فەرمانڕەوایی، سەر بە (یەکێتی)یە، ئەوە شێوەی سۆرانی (دەسەلاتێکی زمانی) وەرگرتووە و بۆتە (زمانی دەسەلات). واتە بۆتە پێوانە و پارسەنگ (معیار)ی لەبیرچوونەوەی زمانی کوردی! ئەوەی بەم شێوە زارە نەئاخڤێ کوردی نازانێ و زمانی بیرچۆتەوە. ئەمەش لەو ڕاستییەوە بەدەست دەهێنین کە زمانی نامەی ناو نومایشەکە وەك شێوەزاری ناوچەی بادینان بەرجەستە کراوە. ئەمە ئەگەر چاومان لەهەڵەکانی ناویشی پۆشی: (من... باش.. بێتاقەت.. ئێوە..هتد) کە هیچ پەیوەندییان بە شێوەی بادینییەوە نییە. ئەو بەرجەستەکردنەش لێرەدا بۆ ئەوەیە سنووری دەرەوەی (زمانی کوردی/سۆرانی) پیشان بدرێت.
ئەگەر لەنموونەی یەکەمدا ڕەوەندی ڕەوشتامێزی، زمانی دیققەتو ڕۆشنگەرانەی تەلەفزیۆن دەکاتە زمانی وەعز و خوتبە و، ئەگەر لەنموونەی دووەمدا تێڕوانینی ئایدیۆلۆژیانە خۆی بە ڕەنگی فەرمانە دێرینەکانی کولتووری پاشکەوتوو بۆیاخ دەکات، ئەوە لەنموونەی سێهەمدا شۆڤێنیزمی بیری خێلایەتی ناوچەیەکی دەسەلاتداری ئایدیۆلۆژی لەئاست ناوچەکانی دیکەدا، شەرماویترین نموونەی ناوچەخوازیمان دەخاتە بەردەست.

لەئەنجامی شیکردنەوەکانی پێشووەوە دەتوانرێت سێگۆشەیەکی (مۆدێل ئاسا) لەسەر ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژیای دەسەلاتداری باو لە تەلەفزیۆنەکانی کوردستاندا پێشکەش بکرێت. لەهەریەکێ لەگۆشە تیژەکانی سێگۆشەی ناوبراودا چەقێکی دەسەلاتمەندی ئایدیۆلۆژی دەبینرێت، بەلام ئەمە بەو مانایە نییە ئەو چەقانەی دەسەلات شوێنگۆڕکێ ناکەن و دەسەلات ناگۆڕنەوە، جلوبەرگی یەکتر ناپۆشنو بەزمانی یەکتر نائاخڤن، بەلکو بەمانای ئەوەیە کە هەریەکێ لەو سێگۆشانە و پەیوەندییەکان و هەندێجار دژایەتیەکانیشیان، لەدوا ئەنجامدا سەرجەمی کارلێکەکانی ناوخۆی ئایدیۆلۆژی باو جێبەجێ دەکەن، تێکەڵ بەیەکتر دەبن بۆئەوەی درێژە بەتەمەنی خۆیان بدەن.. ئەوەی بەلای منەوە گرنگ و جێگەی سەرنجە ئەوەیە، کە ڕێزمانی ئەم ئایدیۆلۆژیانە دەبێتە ڕێزمانی دامەزراوەکانی دیکەی کۆمەلگایش. پێموایە تاڕادەیەك ئەمەشمان لەبواری لێکۆڵینەوەی دامودەزگای تەلەفزیۆنیدا بینی.



## ئەنجام و پێشنیار:

١. تەلەفزیۆن هۆیەکی ڕاگەیاندنی ڕاستەوخۆیە و ئەرکی سەرەکی لەپاڵ گرنگیدان بە زمان‌و ئێستاتیکای بونیادەکانی خۆی، بریتییە لە ڕۆشنگەری ئەو خاڵە هاوبەشانەی تاکەکانی کۆمەڵ بەیەکترەوە دەبەستن. بۆگەیشتن بەم ئامانجە و جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بنەماییە، زۆر گرنگە تەلەفزیۆن بەرنامەیەکی تۆکمەی سیاسەتی کولتووری لەپشت بێت و ئەو سیاسەتە کولتوورییە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگای لەبەرچاو گرتبێت.

٢. مەرج نییە سیاسەتی کولتووری لەلایەن کاربەدەستانی ئیداریی تەلەفزیۆنەوە داڕێژرابێت و زۆر شیاوە بۆ گەڵاڵەکردنی ئەوکارە، هونەرمەندانی داهێنەر، نووسەری شارەزا و کۆمەڵناسان و دەروونزانەکانیش ئەرکی سەرەکییان پێ بسپێردرێت.

٣. زۆر گرنگە تەلەفزیۆن لەڕووی کولتوورییەوە گرێدراوی هیچ یەکێ لەئایدیۆلۆژیا باوەکان نەبێت و ناسنامەی خۆی بەهۆی ناسنامەی دەسەڵاتێکی سیاسییەوە (با لەڕووی ئابوورییەوە گرێدراویش بێت)، ئاراستە نەکات.

٤. بۆئەوەی تەلەفزیۆن وەکو دەزگایەکی ناڕاستەوخۆی سانسۆر لە ئاست بەرهەمی داهێنانی ئازاددا کار نەکات، پێویستە کاری داهێنەرانەی ڕۆشنبیری و هونەری وەك ئاستی ئاگایی سەردەم ڕەواج پێبدات و سوود لە توانا و بەهرەی داهێنەرانە وەربگرێت و مەرجی سیاسی بەسەر هونەرمەند و خەڵکانی چالاکدا نەسەپێنێ. هەروەها بۆ گەیشتنی تەلەفزیۆن بەئاستی کاری هونەریی شیاوی خۆی، پێویستە سوود لەو هونەرمەند و ڕەخنەگر و فیلم ناساڵە وەربگرێت کە لەگەڵ ڕەوتی هونەری ساڵانی پێشوودا پێگەیشتوون‌و لەچالاکی هونەریی شارەکاندا بەشدار بوون. نەك لایەنگر و خەڵکانی خۆبەرەپێشەوەی نەشارەزا.

٥. تەلەفزیۆن وەك دەزگایەكی ڕاگەیاندنی ڕۆشنكەرەوە، ئەركی بەرزكردنەوەی چێژی ئێستاتیكیانەی بینەرانیشی لەسەر شانە، ئەمەیش خوازیاری كەمكردنەوەی بەرنامەی سەرگەرمیكردن و چارەسەری ڕەوشتامێزانەیە بۆ كێشە و دیاردەكان، كە ئەمەی دواییان ئەركی دامەزراوە ئایینییەكانە.

٦. ئایدیۆلۆلژیای باوی دەسەلأتدار لە كۆمەلگای ئێمەدا، ئایدیۆلۆژیایەكی تەنگوچەلەماویە و ڕەوەندی هەلگەڕانەوەشی لە قۆناغی بەرگریكەرانەیەوە بۆ قۆناغی ئێستای كە پراكتیزەی دەسەلأت دەكات، نەبۆتە هۆی گۆڕانێكی مەنهەجی و بنەمایی. واتە مەترسی ئەوەی لێدەكرێت لەكات و شوێنی دیاریكراودا ئەو میتۆدانە بەكار بهێنێتەوە، كە لەمێژووی گەشەكردنی قۆناغی بەرگریدا دژی نەیارەكانی و دەرەوەی خۆی، بەهۆی بەلگەی جۆراوجۆرەوە بەكاری هێناون: (شەڕی ناوخۆیی، لێدان لە ڕەوتو لایەنی دیكەی سیاسی و هتد) دەكرێ لەسەردەمی ئێستاشدا ئەم میتۆدانە كارا و شوێنی ئاوڕ لێدانەوە بن و پەنایان بۆ ببات. بێگومان لە ئاستەنگێكی وا تەنگوچەلەماویشدا، ئەركی هەرە گرنگی دەزگایەكی گرێدراوی وەك تەلەفزیۆن دەبێتە ئەوەی، جەنگ و ململانێكان لە سەكۆی بڕیاردانی سیاسییەوە بگوازێتەوە ناو دەروونی مالأن!

**دانمارك، ناوەڕاستی حوزەیرانی ١٩٩٣**

## پەراوێزو سەرچاوەكان:

(1) John Fiske og John Hartliy: Fjernsynets sprog. Ovest. Kobenhavn. Pp. 15-16.، 1981،Kim Schroder

(2) Jean Baudrillard: I det tavse flertals skygge in Red. Stig Brogger) ovest. ،(Implosion og forforelse 48-72.،Carsten Juhl 1984. pp. 30

(٣) جێگەی سەرنجە ئەمڕۆکە حیزبەکان بەهۆی بەکارهێنانی هەندێ ڕستەوە: (دەستی یارمەتی بۆدرێژکردن، بوار بۆ ڕەخساندن)ی ئەدیبان و ڕۆشنبیران تا (لە ئەرکە نیشتیمانییەکانیاندا کەمتەرخەمی نەکەن) و دەیان فۆرمەڵەی لەم بابەتەوە، توانیویانە زۆر ئەدیبو نووسەر و هونەرمەند بکەنە درێژکراوەی خۆیان و توانا و چالاکییان لە ڕەوتی ئایدیۆلۆژیانەی پارتەکەیاندا، بەکاریان بهێنن. دیارە بەهۆی ئەم کارەوە سنووری کاری هونەری وەك (بەرهەمی داهێنانی سەربەخۆی هونەرمەندان) و (کاری سیاسی بەهونەرکراو)، تێکشکاوە و هەموو کالآیەك بەناوی هونەر و ئەدەب و ڕۆشنبیرییەوە، لەژێر ناوی (داهێنان)دا دەخرێتە بازاڕی کولتوورییەوە. بەم پێیە گەلێك سیاسی دەبنە ڕاویژکاری هونەری و ئەدەبیمان و گەلێ هونەرمەند و ئەدیبیشمان دەبنە گوێڕایەڵ. لەم مەیدانەدا عەقڵی سیاسی/حیزبی لە عەقڵی ڕۆشنبیریی باو وریاترە و هەلومەرجەکان خێراتر دەقۆزێتەوە. بۆ نموونە، سیاسی ڕێگە بەخۆی دەدات لە ئاهەنگ و بۆنە کولتووری و تەواو ڕۆشنبیرییەکاندا بچێتە پشتی مایکرۆفۆنەوە و بەناوی حیزبی خۆیەوە، وتارێك خیتابە بکات: لەڕاپۆرتی کۆنگرەی دامەزراندنی گۆڤاری (پەیامی وەرگێڕ)دا کە (گۆڤارێکی کەلتووری گشتییە/تایبەت بە وەرگێڕان)و (کۆمەڵەی وەرگێڕانی کوردستان) دەریدەکات، نەك هەر بەرەوڕووی یەکەم دوو وتاری بەرەی کوردستانی و پارتی دیموکراتی کوردستان دەبینەوە، بەڵکو لەسەر زاری ئەمەی دواییان لە (گرنگی ڕۆڵی وەرگێڕان) ئاگادا دەکرێینەوە!!

(٤) ئەم ڕایە سەبارەت بە بوارەکانی دیکەی هونەری پیشاندانیش (وەك هونەری فۆتۆگرافی) هەر ڕاستە. ڕۆلآن بارت لە کتێبە شاعیرانەکەیدا (ژووڕۆکەی ڕووناك)، کە دێتە سەر باسکردنی وێنەیەکی (Piet Mondrian)، کە ساڵی ١٩٢٦ لەپاریس گیراوە، دەڵێت: (چۆن مرۆڤ وەك ڕۆشنبیرێ بنوێنێ بەبێ ئەوەی بیر لەهیچ ڕۆشنبیرییەك بکاتەوە؟) بارت لێرەدا هێما دەکات بۆ ئەو جیاوازییەی، کە کامێرا لە

نێوان خودی کەسایەتی وێنەگیراو و ئەو پارچە کاغەزەی وێنەی ئەو کەسەیە، هێناویێتییە ئاراوە.
بڕوانە:

Kbenhavn ،- Roland Barthes: Det lyse kammer. 1983
ovest. Karen Nicoljsen p 134.
ovest. Claus ، 1973،(5) Walter Benjamin: Kulturindustri
Clause.. Rhods p. 15.

(٦) چەمکی سیاسەتی کولتووری بەو مانایە بەکاردەهێنم، کە ئامانجی ئەو سیاسەتە کولتوور بێت، نەك بەکولتووریکردنی سیاسەت. واتە بەرهەمی ئەو سیاسەتە کولتووریە ئاگایی ڕۆشنبیری بێت نەك ئاگایی سیاسی.

(٧) ئەم پرسیارە هەروەکو ئەو پرسیارانە وایە، کە لەقۆناغی بەرگریکەرانەدا لە حیزبەکان دەکران: بۆچی فلان حیزب و ڕێکخراویش (گومرگ) وەرنەگرێت؟ بۆچی بنکەی (عەلاقات)ی لەئێران و تواران و شام نەبێت؟ و بۆچی هتد.

(٨) بە بارێکی تردا، زۆر لە ڕووناکبیرانی کورد لەهەندەران دووچاری هەمان وەهم بوون: لەگەڵ ئەوەشدا باری ئابووری گۆڤارەکانیان نالەبارە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گۆڤارانە ژمارە لەدوای ژمارە چاپ دەبن و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، کەچی هێشتا بەردەوامن لە بڵاوکردنەوەیان بەبێ‌ئەوەی بیرێکی جیدی لەهاوکاریو پرۆژەی هاوبەش و تەنانەت وەستانی گۆڤارەکانیشیان بکەنەوە.

(٩) هەمان دیاردە لە ئەورووپاش بەدی دەکرێ: چەندین کولتوورخانەمان دی، چەندین مەڵبەند و بنکەی ڕۆشنبیری و کۆڕی هونەری.. کە هەموویان بەناوی خزمەتکردن بە کولتووری کوردیی، ڕەوایەتی دەدەنە خۆیان‌و بڕیار دەردەکەن..!

(١٠) ئەوەتا لەو بانگەوازەدا کە بەناوی بیرۆی حوکمەتی کوردستانەوە لە (بۆن)ی ئەڵمانیا بۆ (کوردە نیشتیمانپەروەرەکانی ئەو وڵاتە) نووسراوە: هەر کوردێك کەمتەرخەمی بکات و ئەو ئەرکە نیشتیمانیەی لەسەر شانێتی جێبەجێی نەکات، خۆی تووشی لێپرسینەوەی مێژوو دەکات و بەرپرسیار دەبێت لە برسیبوونی خەڵکانی کوردستان). یان (هەرکەسێك لەم بارەیەوە، واتە یارمەتی ناردن بۆ کوردستان،

کەمتەرخەم بێ، دوا ڕۆژی بەرپرسیار دەبێت بەرامبەر دادگای گەل و ویژدانی جەماوەر..).

(١١) خسرو پرتوی لە وتارێکی گرنگیدا، کە من لەم بەشەی باسەکەدا زۆر سوودم لە میتۆد و بۆچوونەکانی وەرگرتووە، ئەم پرسیارە بەشێوەیەکی دی دەکات و دەڵێت: ئایا دەکرێت وەها قسە لەسەر تەلەفزیۆن بکرێ کە ئامرازێکی تازەی ئەشکەنجەوسزادانە لەبەردەم ڕای گشتیدا؟ بڕوانە:

(ترس، شجاعت خطـر تلويزين) لە گۆڤاری اختر، دفتر نهم زمستان ١٣٦٩.

(١٢) سەبارەت بەم ڕایەی بۆدریار و سەرجەمی بیروڕای ئەم فەیلەسووفە لەسەر ڕۆڵی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە بەخودنامۆبوونی مرۆڤدا، سەرنج بۆ ئەو سەرچاوەیە ڕادەکێشم کە لەپەراوێزی دووەمدا ئاماژەم پێکرد. هەروەها سەبارەت بەڕۆڵی تەلەفزیۆن لە کۆمەڵی هاوچەرخی وڵاتە یەکگرتووەکان و کاریگەریی بۆ سەر ژیانی مرۆڤ بڕوانە ئەم کتێبەی بۆدریار:

- Jean Baudrillard: Amerika. Ovest. Michel Helm. 1987 Akadimisk forlag.

(١٣) بەبڕوای من نابێت هەروا بەئاسانی بەسەر ئەم کێشەیەدا باز بدرێت. ناشبێت وەها تێبگەین کە لایەنە سیاسییەکان ئاگاداری بەرنامەی تەلەفزیۆنەکان نین و تەنیا کارمەندانی سەر بەتەلەفزیۆن لەو کارانە بەرپرسیارن و هەروەها نابێ تەنیا لەئاستی بەرنامەی سەرگەرمیکردن و خەڵك هێنانەپێکەنیندا تەماشای ئەم نومایشە بکەین، بەڵکو پێویستە لەوە دڵنیابین کە حیزبەکان بەرپرسیاری یەکەمن و بەوپەڕی وریاییشەوە توانیویانە سوود لەخەڵکانێکی بەناو هونەرمەند و ڕۆشنبیریش وەربگرن. هەروەها گرنگە بیر لەڕەهەندی دوورمەودای بەکارهێنانی تەلەفزیۆن بکەینەوە، کە دەشێت بۆ ڕووشکاندن و سەرکوتکردن و ئەشکەنجەدان بەکاربهێنرێت.

# ووردەمێژوو:
# حیکایەتی ئامێرە تەکنەلۆژییەکان

تا ئەوکاتەی لە چەمکی (مێژوو) وەك مێژووی ڕووداو و کەسایەتیە بەرجەستەکان تێدەگەین، هەر لە چوارچێوەی تێگەیشتنێکی تەقلیدیدا بۆ چەمکی ناوبراو دەمێنینەوە. هەتا سەدەی نۆزدەیەمیش مێژوو بریتیبوو لە پانتاییەك کە مێژوونووس ڕووداوە سیاسیەکان و ژیاننامە و هات و نەهاتی کەسایەتیە بەرجەستە و دیارەکانی تیا دەنووسیەوە. لە نشوستی و سەرکەوتنیان دەدوا و خۆی بە ڕووداوە گەورەکانەوە خەریك دەکرد. بەڵام وەك هەموو بوارەکانی دیکەی ناو زانستە مرۆییەکان، بە دەستپێکردنی سەدەی بیستەم، سەدەی ئاشتبوونەوە و سەرهەڵدانی ناکۆکیی نوێی نێوان بوارە مەعریفیەکان و تێکەڵبوونیان بەیەکتر، مێژووش تەکانێکی گەورەی داو بۆ یەکەمجار لە تەمەنی خۆیدا توانی هەڵوێستی ڕەخنەگرانە لە ئاست خۆیدا بنوێنێت. بە واتایەکی تر توانی ئەو خەسڵەتانە بخاتە بەر پرسیار کە تا ئەو کاتە بواری چالاکی (مێژوو)یان لەسەرەوە پێناسە دەکرا. لێرەشەوە ژیان بە شێوەیەکی گشتی و هەموو بوارەکانی چالاکی مرۆڤ، داهێنان و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان بوونە مەیدانی ئیشکردنی مێژوونووس تیایاندا. بۆیە دەشێیت ڕزگاربوونی مێژوونووس لە مۆتەکەی ڕووداو و کەسایەتیە گەرەکان، بە جۆرێ لە ڕزگاربوونیش لە تاکە میتۆد لێکبدەینەوە. چونکە بە پێی نەریتەکانی مێژوونووسی تەقلیدی، مێژوونووس دەبوو کار لەسەر یەکجۆر میتۆد بکات کە ئەویش میتۆدی (گەڕانەوە) و (ئاوڕدانەوە) بوو بۆ (ڕابردوو). لەم گەڕانەوە و ئاوڕدانەوەیەدا ئامانجی مێژوونووسی "دەستپاك" ئەوەبوو کە سەرەتایەك یان سەری گوریسێ بدۆزێتەوە و پیا بێتە سەرەوە تا دەگاتە ئەمڕۆ و ئێستا. لەم میتۆدەدا کاری سەرەکی و زۆربەی وزەی مێژوونووس لە نێوان سەفەری خاڵی *سەرەتا* و ساتی *ئێستا*دا، سەقامگیر دەبوو. بەڵام خودی ئێستا بایەخێکی

ئەوتۆی پێنەدەدرا، ئێستا نەدەکەوتە ناو مێژووەوە! لێرەشەوە ئەم میتۆدە ئازادی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی لە مێژوونووس، وەك کەسێکی ئاگا و خاوەن زەینیەتێکی عەقلانی و هۆشمەند، ئەسەندەوە. زەبری ئەم میتۆدە بە کورتیەکەی، مێژوونووسی دەکردە تۆمارکەری ڕووداوەکان نەك ڕاڤەکاری هەمان ئەو ڕووداوانە.

بەڵام بە هاتنی سەدەی بیستەم و هاتنە ئارای جۆرێ لە گفتوگۆ لە نێوان بوارەکانی مەعریفەدا، مێژووش توانی پانتایی خۆی، چ لە ڕووی ئامرازەکانیەوە و چ لە ڕووی بابەتەکانیەوە، بەرفراوان بکات. بەم پێیەش مێژوونووس توانی هەموو شتێ، هەموو گۆڕانکاری و دیاردەیەك وەك بابەتێك بۆ مێژوونووسین تەماشا بکات. واتە مێژوونووس چیدی پابەندی شەپۆلە گەورەکانی بزاڤی کۆمەڵایەتی/سیاسی و سەرهەڵدان و لەناوچوونی کەسایەتییە ناودارەکان نەما و لە دەست تاکە میتۆدیش خۆی ڕزگار کرد. ئەم گۆڕانە وایکرد کە مێژوونووس تەنیا وەك (نووسەرەوە) و (یادداشتنووس) (تۆمارکاری)ی ڕووداوەکان نەمایەوە، بەڵکو ئیدی عەقڵێك بوو بەچاوی ڕەخنەگرانە هەڵوێستی لە ئاست ڕووداوەکاندا وەردەگرت، خوێندنەوە و تەئویلی بۆ دیاردەکان هەبوو، ئەمە جگە لەوەی دەیتوانی بە ئاراستەی داهاتووشدا داوەری بکات.

ڕزگاربوون لە تاکە میتۆد لەهەمان کاتدا پەیوەندی بەستنیش بوو بە پانتاییەکانی دیکەی لێخووردبوونەوەی زانستیەوە و ئیمکانیەتێك بوو بۆ سوود وەرگرتن لە میتۆدی بوارەکانی دیکەی مەعریفەی مرۆیی. نەك هەر ئیمکانیەتێك بوو بەڵکو ئەرکێك بوو لە بەردەم مێژوونووسدا بۆ گەیشتن بە دڵنیاترین، یان وردترین تەئویل و داوەری و هەڵسەنگاندن. بەم پێیەش مێژوونووس چیدی لە خۆی نەدەپرسی: کامەیە بواری ئیشکردنم؟ بەڵکو کەوتە هەڵبژاردن و ئیشکردن بەهەموو ئەو میتۆدانەی کە لە بواری (بە مێژووکردن)دا یاریدەیان دەدا. هەموو میتۆدەکان دەشیا لە بواری ئاسانکردن و فرەمەوداکردنی خوێندنەوەی مێژووییانەدا یاریدەی مێژوونووس بدەن و دەستەڵاتی بە مێژووکردنی دیاردە و ڕووداوەکانی بدەنە دەست.

ئەم گۆڕانە گەورەیە، شوێنگەی مێژوونووسی لە ئاستێکی میکانیکیەوە گۆڕییە سەر ئاستێکی دینامیکی. بە پێی میتۆدی تەقلیدیانەی مێژوونووسی، مێژوونووس کەسێ بوو ئەوەی دەنووسییەوە کە "ڕوویدابوو"، بەڵام شوێنگەی دینامیکانە مێژوونووسی نەك هەر کردە چاودێرێ بەسەر ڕووداوەکانەوە، بەڵکو کردیشە بەرهەمهێنەرەوەشیان. بەم پێیەش مێژووی ڕووداوێك یان دەرکەوتەیەك تەنیا شتێ نەبوو کە یەکجار و بۆ هەمیشە نووسرابێتەوە، بەڵکو بابەتێك بوو دەکرا لەگەڵ هەموو خوێندنەوەیەکی نوێدا سەر لەنوێ بەرهەم بهێنرێتەوە و دووبارە لایەنەکانی کەشف بکرێنەوە. هەر لەبەر ئەم خاڵەشە کە لە مێژوونوسیی تازەدا، چەندە بابەتەکە گرنگە ئەوەندەش ناوی ئەو مێژوونووسەی ئەو بابەتە تەئویلدەکاتەوە گرنگیی هەیە. مێژوونووس چیدی کەسێ نیە کە زۆرترین زانیاری و فاکت لەسەر ڕووداوە تایبەتیەکان بزانێت و ساڵ و ڕۆژی ڕوودانەکەیانمان پێبڵێ. بەڵکو کەسێکە دەتوانێت لە ناو گشتیترین دیاردە و ڕووداوەکاندا هەستیارترین خاڵ دەدۆزێتەوە و ئەو خاڵە لە ڕێگەی ڕاڤەکردنەوە بەمێژوو دەکات. بە مانایەکی تر، میتۆدی هاوچەرخی نووسینەوەی مێژوو، ئەم مێژووەی لە زیندەخەوی گێڕانەوەی یەکبەدوای یەکی ڕووداوەکان ڕزگار کرد و کردیە چێژێك کە مێژوونووس لە بازبازێنکردن بەناو ڕووداوەکاندا، بەدەستی دەهێنا. دەتوانین بڵێین ڕەهەندێکی جوانکاری خرایە سەر پرۆسەی نووسینەوەی مێژوو. ڕەهەندێ کە دەشییێت مەودا جوانکاریەکانی بە پلەی یەکەم لە هەڵبژاردنی بابەت و دووبارە مونتاژکردنەوەیان و لە زمانی مێژوونووسدا بدۆزینەوە. بازبازێنکردن بووە هۆی ئەوەی چیدی مێژوونووس بە پلەی یەکەم پابەندی ئەرشیف، کتێب، دەستنووسە کۆنەکان و کەشکۆڵەکان نەبێت. بەڵکو خۆی فرێداتە ناو واقیعی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانەوە و ناچاریکرد لەو واقیعە و دیاردەکانی ورد بێتەوە، ئەمەش وەك چاودێرێك نەك وەك نووسەرەوەو تۆمارکارێکی ڕووت.

بە پێی ئەم بۆچوونە تازەیە بۆ مێژوو، مێژوونووس بە زانیاری ناو بەڵگەنامە و کەشکۆڵ و هتد، قەناعەتی نەدەکرد، یان هەر تەنیا خۆی نەدەبەست بە دەقی

(نووسراو)ەوە. بەڵکو گێڕانەوەی زارەکیش گرنگی زۆری پێدرا. (مێژووی گوتراو) کە پشت بە گێڕانەوەکانی ئەو کەسانە دەبەستێ لەکاتی ڕوودانی ڕووداوەکاندا ئامادە بوون، یان تیایاندا بەشدار بوون، وەك لقێکی گرنگی نووسینەوەی مێژوو دەرکەوت. گفتوگۆ و دیدار و وتووێژ لەگەڵ ئەو کەسانە و تۆمارکردنی ئەزموونەکانیان لە زاری خۆیانەوە، بووە ئەرکێکی گرنگی مێژوونووس. لەمەش گرنگتر، بایەخدانی مێژوونووس بوو بە ژانرە(نوع) ئەدەبیەکان و دەقی ئەدەبی و بواری داهێنانی هونەری بەگشتی. واتە دەرگایەك بۆ تێکەڵبوونی دنیای ئەدەب بە مێژوو ئاوەڵا بوو. یاخود ڕاسترە بگوترێ کرانەوە و سوود وەرگرتنی مێژوونووس لە دەقی ئەدەبی بۆ کاری تونیل و ڕاڤەکردنی دیاردە و ڕووداوەکان. ئەمەش لە دواجاردا بەمانای تێکەڵبوون و بەیەك گەیشتنی ئاسۆی دەقی ئەدەبی و ئاسۆی دەقی مێژوو دەگەیەنێ، کە دەتوانین بە زمانی هانس جۆرج گادامیر پێی بڵێین: "*تێکەڵبوونی ئاسۆکانی تەئویل*" یاخود ئاسۆی دەقەکان.

لێرەوە تێڕوانینێکی نوێ لە بواری مێژوونووسین و بە مێژووکردندا سەریهەڵدا کە یەکێکە لە گرنگترین ئەو دەستکەوتانەی بە هۆی هاوکاری بوارە مەعریفی و بوارەکانی داهێنانەوە هاتە کایەوە. ئەو تێڕوانینەش بریتیە لە بڕواهێنان بە ڕێژەگەری (ڕێلەیتاڤیزم)ی ڕاڤە و خوێندنەوەکان. ڕێژەگەری دوا هەمین دیواری قایمی نێوان بوارە مەعریفیەکانی تێکشکاند و ئاسۆیەکی بەرینی خستنە بەردەم. چیدی هیچ بوارێکی مەعریفی نەیدەتوانی وەك تاقە سوار و وەڵامدەرەوەی ڕەهای ناو بوارەکانی چالاکی زەینی و عەقڵی مرۆڤ خۆی بناسێنێ و مەشرووعیەت بدات بە ئەنجامگیریەکانی لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەنجامگیری و تەئویلی بوارەکانی دیکە. شارەزایانی بوارە مەعریفیەکان ناچار کران لە چوارچێوەی ئەو دیوارانە بێنە دەرێ کە لە پرنسیپی هەمان ئەو بوارەی ئیشیان تیادەکرد، وەك قەڵایەك هەڵیان چنیبوون. کلیلی کردنەوەی هیچ دەرگایەك بەتەنیا لە گیرفانی کەسدا نەبوو. ئەو یەقینەی بەناوی زانستەوە بەرهەمدەهات ناچار بە جۆرێ گفتوگۆ کرا. ئەو ئاراستەیەش کە ملی بۆ گفتو

گۆ نەدەدا و، گوێی بۆ ئەنجامگیریی ئاراستەکانی دیکەی بیرکردنەوە شل نەدەکرد، لەسەر بازنەی دۆگمایەك دەسووڕایەوە. جۆرێ لە فەندەمەنتالیزمی لە بواری داهێناندا دەهێنایە بەرهەم کە ڕەواجێکی زانستیی ئەوتۆی نەبوو. ئەم دەستکەوتە یەکێکە لە و دەستکەوتە گرنگانەی کە پشتیوانی لە جیاوازی تەئویلەکان دەکات و ڕاڤەکار و لێکۆڵەرەوان لە مەترسی کەوتنە خوارەوە بە دیوی ڕەهاییگەریدا ڕزگار دەکات. دەرگای ڕاوێژکردن و کاریگەری بەخشینی لەسەر کردنەوە و لێرەشەوە ئەنجامی بەسوود تری لەبەر دەمدا قووتکردنەوە.

هەر بۆیەشە ئەوەی بۆ مێژوونووسی نەریتگەرا، تاوانی شکاندنی "پرنسیپە *چەسپاوەکانی چۆنێتی نووسینەوەی مێژوو*" بوو، لە لای مێژوونووسی ڕێژەگەرا بووە یەکێك لە ئەرکە گرنگەکان. ئەگەر لە دوا ئەنجامدا ئەدەب و دەقی ئەدەبی تەئولێکی تایبەت بن بۆ واقیعێکی تایبەت، یان واقیعێکی بەرهەمهێنراو، هەروەها ئەگەر نووسینەوەی مێژووش بریتیبێت لە بەرهەمهێنانی تەئویل بۆ دیاردەیەك لەڕێگەی بە مێژووکردنەوە، ئەوە نرخی ئەم دوو تەئویلە لە ڕووی ڕاستی و ناڕاستیەوە یەکسانن. چونکە هەردووکیان بە پرۆسەی بەرهەمهێنانەوەدا (یەکەمیان لە خەیاڵی نووسەردا و دووەمیان لە خەیاڵی مێژوونووسدا)، تێپەڕ دەبن و هاوبەشن. ئەمە جگە لەوەی هەردووکیان لە واقیعێکی (بەتێکست بوو)دا بە ئێمە دەگەن. هەر بۆیەشە ناکرێت بڕوامان بە یەکێکیان لەویتریان زیاتر بێت.. گومان لەوەدا نیە کە بەرهەمهێنانەوەی دیاردەیەکی واقیعی کۆمەڵایەتی و هتد لە دەقێکی ئەدەبیدا، هەم لە ڕووی دەربڕین و هەم لە ڕووی گرنگیپێدانی نووسەر بەم یان بەو لایەنی دیاردەکە و شێوازی ڕیوایەتکردنەوە، جیاواز دەبێت لە بەرهەمهێنانەوەی هەمان دیاردە لە دەقێکی بە مێژووکراودا. بەڵام ئەمان هەردووکیان لە دوا ئەنجامدا دوو لێخوردبوونەوەی جیاواز بەرهەم دەهێنن کە هەریەکەیان ڕەوایەتی خۆی هەیە و هەڵگری بەشێکە لە ڕاستی ووتن لە سەر ئەو دیاردەیە.

ئەوەی شێرزاد حەسەن لە دەقی (حەسار)دا بەرهەمیهێناوە، دەشێت شێوازێکی دیکەی دەربڕینی هەمان بابەت بێت کە دەروونزانێك دوای ڕەڤەکردن

و شیکردنەوەی سایکۆلۆژیای مرۆڤی کورد بیخاتە ڕوو. یان ڕەخنەگرێك لە پرۆژەیەکی ڕەخنەییدا لێی نزیك ببێتەوە. یاخود ئاییناسەکان و شارەزاکانی میتۆلۆژیا، لە دوای شیکردنەوەی سیمبوول و دەلالەتە ئایینی و ئەفسانەییەکانی واقیعی زەینی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئێمەوە پێی بگەن... ئەمە بەمانای ئەوە نیە کە ئەدەبی شێرزاد ئیشی دەروونزان، ڕەخنەگر، ئاییناس و ئەفسانەناسمان بۆ دەکات، هەر وەکو چۆن بەمانای ئەوەش نیە کە ئەم بوارە مەعریفی و تەئویلیانە کاری یەکدی دووبارە دەکەنەوە. چونکە شتی وەها بێمانایە و ئەوان هەر یەکە پەیڕەوەی لە دیسیپلینەکانی بواری ئیشکردنی خۆیان دەکەن. بەڵکو بەمانای ئەوەیە کە شێرزاد و ئەوانیتر هەر یەکەیان لە شوێنگەی چالاکیی خۆیانەوە، بە پێی هەل ومەرج و پرنسیپی بوارەکانیان، تەئویلێك بۆ بەشێ لە ڕاستی ئەو دیاردە و ڕووداوە بەرهەم دەهێنن کە ڕووداوی مرۆڤ و کۆمەڵگای ئێمەیە. ئەوەی شێرزاد لە پشتیەوە وەستاوە، ئەوەی کە گوتاری ئیبداعی ئەو پێکدەهێنێ، ناکۆکیەکی گوتاری لەگەڵ ئەوەدا نیە کە دەروونزان، ڕەخنەگرێکی شێلگیر یان مێژوونووسەکان لە خوێندنەوەیاندا بۆ مرۆڤ و واقیعی مرۆڤی ئێمە گوتاری خۆیان لەسەرەوە دادەمەزرێنن. هیچکامیان ئەویتریان بەدرۆ ناخاتەوە و ناشبێتە جێگرەوەی ئەویتریان. یان لە ڕێژەی ئەو ڕاستیە کەمناکاتەوە کە دەشیێت کۆی هەر یەکێك لەو گوتارانە پێیبگات. بەڵکو (جیاوازیی)یەك هەیە لە نێوان ئەو شێوازەدا کە شێرزاد حەسەن لە ڕێگەیەوە ڕاستی گوتاری خۆی بەرهەمدەهێنێتەوە و، ئەو شێوازەدا کە هەر یەك لە ڕەخنەگر، دەروونزان، ئاییناس، ئەفسانەناس و مێژوونووس لە ڕێگەیەوە بەشێ لە ڕاستی تەئویل و ئەنجامگیریی خۆیان بەدەست دەهێنن.

قەبووڵکردنی ئەو جیاوازییە باوەڕ هێنانە بە نیسبییەت. ئەمەش یەکەم هەنگاوی ڕاستەقینەیە بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ بوار و پانتاییەکانی دیکەی تەئویلی مەعریفیانەدا.

## ئامێرە تەکنەلۆژیەکان وەك بابەتی (وردەمێژوو):

(وردەمێژوو) مێژووی ئەو دیاردە و چالاکی و گۆڕانکاریانەیە، کە لەڕوانگەی مێژوونووسیی نەرێتگەراوە بەهیچ حەقیقەتێك و دڵنیاییەکمان ناگەیەنن. هیچمان لەسەر واقیعی کۆمەڵگا و مێژووی لێکنەپچڕاوی نەتەوە پێنالێن.. ڕابردووی شتە بچووکەکان و تێڕامان لەو گۆڕانکاریە بچوکانەی لەگەڵ خۆیان هێناویانن، هیچمان لەسەر کەسایەتییە مەزنەکان و ئەو پێشەوایانە پێنالێت کە بەشۆڕشەکانیان، گۆڕانی گەورەیان هێناوەتە ناو کۆمەڵگای ئێمەوە..

بەڵام بابێین بەپێچەوانەی ئەم تێزەوە بیربکەینەوە. با بۆساتێك بایەخ بەشتە بچووکەکان بدەین و لەو مانا و گۆڕانکارییانە وردبینەوە کە ئەوان بوونەتە هۆکاری بەرهەمهاتنیان. بۆ نموونە با لەهەندێك لەو ئامێرە تەکنەلۆژیانەی ڕاگەیاندن وردببینەوە کە لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە هاتنە ناو ژیانی مرۆڤی ئێمەوە. با بزانین چ گۆڕانێکیان لەپەیوەندی مرۆڤی ئێمە بەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی خۆیەوە، هێناوەتە ئاراوەو چ ڕەهەندێکی تازەیان خستۆتە سەر تێگەیشتنی مرۆڤی سادەی ئێمە بۆ دەوروبەری کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆی..

بە مانایەکیتر، با ڕیوایەتێك لەسەر ئامێرەکانی وەك (بەرقیە، بێتەل، قەوان، ڕادیۆ، تۆمارکەر، کامێرای وێنەگرتن، تەلەفزیۆن، کامێرای ڤیدیۆ) و چەندین ئامێری دیکەی تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن، بەرهەمبهێنین و پرسیار بکەین: داخۆ ئەم ئامێرانە چ گۆڕانێکیان لەژیان و تێگەیشتنی ئێمە بۆ ژیانی دەوروبەری خۆمان هێناوەتە ئاراوە..؟ نە ، ئەوە مەودایەکی بەرفراوانی لێکۆڵینەوەیە و لەتوانا بەدەر، کەواتە دەبێت سنووری باسەکەمان پتر دەستنیشان بکەین: بابێین لەناو ئامێرەکانا چەند دانەیەکیان هەڵبژێرین و لەکاریگەرییان بۆسەر تەنیا (یەك) بواری ژیان و یەکێ لە تێگەیشتنەکانی مرۆڤی ئێمە بۆ دەوروبەری خۆی ڕابمێنین. بۆ نموونە بابێین لە جەنجاڵترین دیاردەی (پەیوەندیکردن) ڕابمێنین، کە لەم سەدەیەدا زۆرترین وزەی مرۆڤی ئێمەی بەخۆیەوە خەریککرد: مەبەستم پانتایی پراکتیزەکردنی (سیاسەت) و پەیوەندیی سیاسیە لە کۆمەڵگای کوردیدا.

با پرسیار بکەین ئاخۆ جگە لەو دوو پانتاییەی کە بەردەوام گووشاریان خستۆتە سەر بواری پراکتیزەکردنی سیاسەت لە وڵاتی ئێمەدا، واتە پانتایی (پراکتیکی سیاسەت لەجیهان)دا و پانتایی پراکتیکی سیاسەت لەناوچەی (خۆرهەڵاتی ناوەڕاست)دا، کە زۆرجاریش پاساوی لاوازییەکانی عەقڵی سیاسیمانی پێدراوەتەوە، چ هۆکارێکی دیکە ڕۆڵی بینیوە لە پراکتیزەکردنی سیاسەتی کوردیدا؟

خاڵێکی سادە بۆ دەسپێکردنێکی ئەوتۆ، ئەوەیە بڵێین: کۆمەڵگای ئێمەش وەك هەر کۆمەڵگایەکی دیکەی بەشەری، بەپێی قۆناغی گەشەی خۆی، بەپێی ئەو ئیمکانیەتانەی بۆی ڕەخساون و بەپێی ئەو گۆڕانانەی پێیاندا تێپەڕ بووە، لەهەمووشی گرنگتر: بەپێی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگای کوردی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تر (بەشێوەیەکی سرووشتی یاخود لەئەنجامی داگیرکاری و کۆلۆنیالیزمەوە)، هەندێ ئیمکانیەتو سنوور و گۆڕانکاری تازەشی بۆهاتۆتە پێش. ئەو ئیمکانیەت و سنوور و گۆڕانکاریانە، دەوریان هەبووە لە (گۆڕین و سنوور بۆدانان و ئیمکانیەت خستنە بەردەم پرۆسەی پراکتیکردنی سیاسەتیشدا).. هەربۆیەشە جێگەی خۆیەتی ئێمە لەئەنجامی ئەو کاریگەریانە وردببینەوە، کە بەریەککەوتنی کۆمەڵگای کوردی و هەندێ لە بەرهەمە تەکنەلۆژیاکانی کۆمەڵگای خۆرئاوا خستوویانەتە بەردەستمان. ئەمەش بەبێ ئەوەی بچینە ناو وردەکارییە مێژووییەکانی وەك چۆنێتی هاتنی ئەو بەرهەمانە بۆ کوردستان.. لێرەشەوە باسەکەم لەدوو ئاراستەدا چڕ دەکەمەوە:

<u>یەکەم:</u> لە (ئامێرە تەکنەلۆژیاکان) تەنیا ئەوانەیان وەردەگرم کە پێموایە لەهەموویان دیاتر و لەپەیوەندی لەگەڵ باسەکەی ئێرەدا، کاریگەرتر بوون: (ڕادیۆ، کامێرای وێنەگرتن، کامێرای ڤیدیۆ و تەلەفزیۆن).

<u>دووەم:</u> لە (کۆمەڵگای کوردی)ش تەنیا (ئەکتەری سیاسی) واتە (ڕێبەر، پێشەوا و بەتایبەتی سەرۆکی کاریزمایی حیزب) و پەیوەندی ئەمەیان بە (تاکەکەس)ی هەوادار، لایەنگر و ئەندامی حیزبەکەیەوە، وەردەگرم. ئەمجا پرسیار دەکەم:

***ئایا بەرهەمەکانی تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن چ گۆڕانێکیان بەسەر پەیوەندی نێوان (ئەکتەری سیاسی)و (تاکەکەسی کورد)یدا هێناوە؟***

هەر لەسەرەتای بلاوکردنەوەی یەکەم ڕۆژنامەی کوردییەوە (کوردستان)، کە سەرنووسەرەکەی پێشەوایەکی کوردبوو، تا سەرهەلدانی دەزگای (بەرقیە) (بێتەل)و تەلەفۆن، پراکتیکی سیاسەت لەکوردستاندا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە. ئەمە بەشێکە لەمێژووی پەیوەندی ئالوگۆڕیانەی ئێمە کە هیچی ئەوتۆی لەبارەوە نەنووسراوە، بەلام گەلێك سەرنجڕاکێشە.. چونکە بۆتە هۆی ئەوەی پراکتیزەکردنی سیاسەت لەولاتی ئێمەدا خۆی لەبەردەم چەندین شێوازی نوێی دەربڕینی سیاسی و ناردنی پەیام و شێوەی پەیوەندیکردندا ببینێتەوە. ئەم ئامێر و کەنالە تازانە پێویستییان بەزمانێکی تازەی دەربڕین هەبوو، تا ئەکتەری سیاسی کورد بتوانێت لەڕێگەیەوە پەیوەندی بکات بەئەندام و لایەنگرانی خەتی سیاسیی ڕێکخراوەکەی بەتایبەتی و ئەندامانی کۆمەلگاکەشی بەگشتی.

واتە ئێمە دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین کە بوارەکانی ڕاگەیاندنی تەکنەلۆژی لەزۆر بڕیار و پرۆسەی سیاسیو چۆنێتی پیادەبوونیان لەناو کۆمەلگادا، کاریگەر بوونو شوێندەستی خۆیان بەئەنجامی کردە سیاسیەکانەوە جێهێشتووە. بەلام تا هاتنی دەزگای تەلەفزیۆن بۆ کوردستان و بوونی بەبەشێکی جیانەکراوە لەڕاگەیاندنی حیزبی، ئەوە گۆڕانێکی بنەبڕ نەهاتە ئاراوە. تەنیا لەدوای ڕاپەڕینی ئایاری ١٩٩١وە بوو، کە پانتایی پراکتیزەکردنی سیاسەت گۆڕانی گەورەی بێ پێشینەی بەسەردا هات. گۆڕانێك کە ئەکتەری سیاسی و تاکەکەسی کوردی بەجۆرێکی تر و لەژێر سایەی هەلومەرجی تردا، ڕووبەڕووی یەکتر کردەوە. کۆتایی حەکایەتەکەی ئێمە ئاوا تەواو دەبێت: *(لەو ڕۆژەوە تەلەفزیۆن بووە مولکی حیزب، لەوکاتەوە سەرکردە هاتە سەر تەلەفزیۆن و خۆی ئاشکرا کرد، گەورەترین گۆڕانیش لەپەیوەندی نێوان ئەکتەری سیاسی و تاکی کورددا ڕوویدا. ئەمەش نەك لەبەرئەوەی یەکەمیان بووە ڕووخساری سەر (شاشە)و دووەمیشیان بووە (بینەر)، بەلکو لەبەر*

*خاڵێکی زۆر گرنگتر کە پەیوەندی بە قوڵاییەکانی پرۆسەی (وێناکردن)ەوە هەیە. واتە نەمان و سڕینەوەی ڕەگەزی (پیرۆز) و تەجەللا لە سیمای وێناکراودا).*
بەڵام ئێستا بابزانین سەرەتای ئەم حیکایەتە چۆن بوو؟

## مەرگی ئەفسوون و تەجەللا (Aura):

ئەفسوون، یاخود تەجەللا بەومانایەی والتەر بنیامین بەکاریهێناوە، بریتییە لەو تارماییە پیرۆزەی، لەو شەوق و ڕەونەقەی کە دەوری بەرهەمی هونەری داوە: هەربەرهەمێکی هونەری و هەر دیمەنێکی سرووشتی بە ئەفسوونێکی تایبەت دەورەی گیراوە. ئەم ئەفسوونەش سیمایەکی پیرۆزمەندانە و دانسقە و ڕەسەن و تاك، دەداتە ئەو بەرهەمە، یان ئەو دیمەنە سرووشتییە(١). بەمانایەکی تر، ئەم سیمایە تا ئەوکاتە پیرۆزیی خۆی هەیە، کە دەتوانێت (مەودا)ی نێوان خۆی و بینەر بپارێزێت. هەبوونی مەودا لەنێوان بەرهەمی هونەری و بینەری ئەو بەرهەمەدا، بەمانای ئامادەبوون و پارێزگاریکردنە لە (ئەفسوون)ی ئەو بەرهەمە. ئەفسوونیش حیرەت و سەرسووڕمان بەرهەم دەهێنێ، کە ئەمەش باروودۆخێکە وزەی پرسیاری تیادا مردووە. چونکە کەسی سەرسووڕماو و حیرەتزەدە، کەسێکە بەکەمترین وزەی پرسیار و لێکدانەوە، بەناچیزەترین هێزی بەرگریکردنەوە، لەبەردەم دەسەڵاتی ئەفسوونێکدا وەستاوە.
لێرەوە دوژمنی ئەفسوون، (نزیکی) و نەمانی (مەودایە) لەنێوان بەرهەمی هونەری و بینەری ئەو بەرهەمەدا، لەنێوان ئەفسوونساز و ئەفسوونکراودا. ئەمەش بەمانای ئەوەیە کە بەرهەمی هونەری تەنیا لەشوێنی ڕاستەقینەی خۆیدا، لەو قەڵەمڕەوەدا کە (دانسقەیی و تاکبوون)ی ئەو بەرهەمەی دەستەبەر کردووە و پاراستووە، دەتوانێت مرۆڤ بەئەزموونێکی ئەفسووناوی دانسقەدا ببات. کاتێ ئەو بەرهەمە، یاخود ئەو شتەمان بەهۆی وێنە و نیگار و کۆپیکردنەوە، لەشوێنی ڕاستەقینەی خۆیەوە گواستەوە و نموونەی ترمان لێ

بەرهەم هێنا، ئەوە تەجەللاکەی لەدەست ئەدات و چیدی بەدانسقەیی نامێنێتەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بارودۆخە با موسڵمانێکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، یاخود موسڵمانێکی (پێش هاتنە ئارای ئیمکانیەتی وێنەگرتن و کۆپیکردن)، یاخود بەزمانی بنیامین: پێش (سەدەی کۆپیکردنەوەی میکانیکی) بهێنینە پێش چاوی خۆمان. لەخەیاڵی ئەو موسڵمانەدا دیمەنی (تەواف)ی (کابە/کعبە) و سووڕانەوەی بەدەوری حەرەمی پیرۆزی (مەککە)دا، شتێ بوو تەنیا و تەنیا لەمەراسیمی چوونە (حەج)دا ڕوویدەدا و واقیعیەتی خۆی بەدەست دەهێنا..

بەڵام لەو ڕۆژەوە موسڵمانانی ئەم سەدەیە توانیان لەڕێگەی (کامێرای حەج)ەوە دیمەنی (حجر الاسود، ئەشکەوتی حەڕرا، مزگەوتی پەیامبەر و گۆڕی ئایشێ و فاتمە)و دەیان وێنەی تری هەمان ئەو شوێنانە بەهۆی فیلمێکی بازنەییەوە ببینن، کە دەخرایە ناو ئامێرێکەوە و لەبەر ڕووناکیدا تەماشای دەکرا، ئیتر وێنایەکی دیکەیان لەسەر ئەو شوێنە پیرۆزانە و ئەزموونی (چوونە زیارەتگا) لە زەیندا لەلا دروست بوو، کە جیای دەکردنەوە لەو وێنایەی برا دینییەکانیان لەسەردەمی پێش هاتنە ئارای کامێرای ناوبراوەوە، لەسەر هەمان ئەو شوێنە پیرۆزانە هەیان بوو(٢).

ڕێك و ڕاست دەتوانین بەهەمان تێگەیشتن باسی ئەفسوونی سیمای ئەکتەری سیاسی کورد و مەرگی ئەفسوونەکەی لەزەینی بینەرەکانیدا بکەین. ئەویش بەهۆی هاتنە ئارای ئامێرەکانی ڕاگەیاندن بۆناو پرۆسەی پراکتیزەکردنی سیاسییەوە.

لەیەکەم سەرنجدانا ئەم تێکهەڵکێشکردنە گاڵتەجاڕانە دێتە پێش چاو، چونکە وا دەرئەکەوێ بمانەوێت (سیماو ڕووخسار)ی ئەکتەری سیاسی کورد لەگەڵ (دیمەن)ی بەرهەمێکی هونەری، یاخود شوێنە پیرۆزەکاندا (بەو مانایەی *پیرۆزی* لەکایەی دینیدا هەیەتی، بەراوورد بکەین.. بەڵام ئەوە مەبەستی من نییە چوارچێوەیەکی ئەوتۆ بەو بەراووردکردنە بدەم. خاڵی گرنگ بەلای منەوە دەشێت بەم جۆرە دابڕێژرێت:

بەدرێژایی مێژووی ئێمە بەگشتی و مێژووی سیاسی ئێمە بەتایبەتی، لەنێوان ئەکتەری سیاسی کورد: (میر، پێشەوا، سەرکردە، سەرۆك، سکرتێری حیزب) و هەروەها تاکەکەسی ئێمە: (دەستوپێوەند، مورید، لایەنگر، هەوادار و تەنزیمی)دا، مەودایەکی جوگرافی، چینایەتی بالآدەستانەی بەرفراوان لەئارادا بووە. ئەو مەودایەش ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە (بەدانسقە هێشتنەوە) و پاراستنی (ئەفسوون)ی سیما و کەسایەتی ئەکتەری سیاسیماندا. چونکە تاکی کورد هەمیشە لەبارودۆخێکی سەرسووڕماوی ئەفسووناوی بەردەمی ئەو (تابلۆ)یەدا ماوەتەوە، کە لەزەینی خۆیدا لەبارەی ڕابەر و پێشەوا و سەرۆك حیزبەکەیەوە نەخشاندوێتی. مەودای نێوان ئەکتەری سیاسی و تاکەکەسی ئێمە، مەودایەکی ئەفسوونساز بوو: سیمای (دوورەدەست)ی ئەکتەری سیاسی، ئەو تەجەللایەی دەهێشتەوە و پەرەی پێدەدا کە خەیاڵ و زەینی تاکەکەسی ئێمەی سەرسووڕماو دەکرد و (گەورەیی)و (مەزنایەتی) ئەو سیمایانەشی فراوانتر دەکرد. ئەوان نادیاریوون و نادیاریش تەنیا بۆ یەزدان و ئەو (ڕزگارکەرانە) باشە، کە مژدەی ژیانێکی بەهەشتیمان دەدەنێ..
تەکیەکان، خانەقاکان و بەتایبەتیش بنکەی سەرکردایەتییەکان، کە هەمیشە لەشاخەکاندا بوون، هەرتەنیا سەرکردەکانی ئێمەیان لە دوژمن نەدەپاراست و نەدەشاردەوە. بەڵکو ئەو (شوێنە ڕاستەقینەیە)ش بوون کە تەجەللای سیماو ناو و ناوبانگی ئەوانیان لەلای تاکی کورد، دەپاراست.. بەمانایەکی دیکە، لەودیو چیاکانەوە ئەو (تابلۆ دانسقە و پیرۆزانە) هەبوون کە نموونەی جوانترین بەشەریەتی سەرزەوی بوون و مرۆڤی کوردیان لەشەڕانیەتی دوژمنەکانی دەپاراست.. مەودای نێوان شاخەکان و شارەکان، هەر بەتەنیا سنوورێکی جوگرافی نەبوو، بەڵکو مەودای نێوان جیهانی پیرۆز و دنیای ستەم و بەدکاری بوو. لێرەوە فەنتازیکردن و وێناکردنی پیرۆز، وێنای (ڕزگارکەر و جێگەی ئومێد) ببووە بەشێکی جیانەکراوە لە پێکهاتەی زەینیی مرۆڤی ئێمە. وێناکردنێك کە بەدرێژایی ساڵەکان تاکەکەسی کوردیان ناچار دەکرد چاوەڕێی ئەو (قاسیدی خەبەر)و (پەیکی شارەزا)یانە بێت، کە لەودیو چیاکانەوە، لە

(دنیای پیرۆز) و لەلای (ڕووخسارەکانی ڕزگارکردنەوە)، هەواڵی چارەنووسی خۆی بۆ دەهێنا. تەتەر و پەیك و قاسیدەکان ئەو کاراکتەرانەبوون کە ڕۆژگارێکی دووروودرێژ، ڕۆژگاری پێش بلاوبوونەوەی نووسین و سەرهەڵدانی (توێژی خوێندەواری وەك: باش کاتب و عەرزوحاڵنووس و مەلا و کادرەحیزبیەکان)، ئیمکانی (ئاڵوگۆڕکردنێکی خۆماڵییانە)یان لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا فەراهەم دەکرد. ئەمەش بەشێکی دیکەی حەکایەتەکەمانە کە تیایدا باس لە کاراکتەری پەیك دەکەین.

## مەرگی پەیك:

پەیك، نەك هەر (شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور و ڕاهی پڕ خەتەر) بوو، وەك نالی و سالم پێناسەیانکردووە ، بەڵکو ئەو هەواڵهێن و ڕووخسارە نەجیبەش بوو، کەبەردەوام چاوەڕێی دەکراو ئەو لە ناکاو دەرئەکەوت! هەرچەند لەدوو ڕا هاتبا، زیاتر خۆشەویست بوو. لە دوورەوە هاتنەکەی هەم بەنیشانەی ڕاستی و دانسقەیی خەبەرەکانی لێکدەدرایەوە و هەم وەکو بەتوانایی ئەویش لە (ئەفسوونکردنی) گوێگرەکانیدا. مادامەکی ئەو لەدوورەوە هاتبوو، چونکا لەلای نادیارەوە هاتبوو، ئەوە لەگەڵ (نهێنی)یەکدا هاتبوو، بەنهێنییەکەوە هاتبوو.. ڕووناکیی تابلۆ دانسقە و ئۆرگێناڵەکانیشی پێ هەڵپڕژابوو، یاخود بۆنی موبارەکیی ئەوانی گرتبوو، کە دەکرا بە (گوێهەڵخستن)و (دڵ دانە) خەبەر و بەسەرهاتەکانی، کەمێ لە پریشکی ئەو موبارەکییەش بەئێمە هەڵپڕژێ.. کاراکتەری پەیك کایەی ڕۆشنبیریی (بیستن)ی لەلای مرۆڤی ئێمە فراوان دەکرد و گەشەی پێدەدا: هەر کە دەرکەوتبا، ئیتر دەست لە کار هەڵدەگیرا و هەرکەسە گۆشەی تەنیایی خۆی جێدەهێشت تاکو لەو مەجلیسەدا ئامادەبێت، کە تیایدا پەیکی هەواڵێن لەپاکی و پیرۆزیی (تابلۆ دانسقەکان) دەدوا. ئامادەبوون لەمەجلیسی ئەوا، ئامادەبوون بوو لەناو بازنەی کۆمەڵێکدا کە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەندامەکانی، تامەزرۆیی بوو بۆ (بیستن)و گوێڕادێران لە دەنگوباسەکان.

پەیك مەودای نێوان (گوێگر)و ئەو (وێنە)یەی گوێگر لەچاوەڕوانیدا لەسەر ڕابەر و پێشەوا و سەرکردەکەی کێشابووی، کەم نەدەکردەوە. بەڵکو تێکەڵی دەکرد بە هەزار بەهەزاری چنین و گێڕانەوەیەکی (زمانی)ی ئەوتۆ، کە چیدی بواری بۆ گوێگر نەدەهێشتەوە وێنەیەکی تەواوبووی چەسپاوی لەسەر سیما و کاراکتەری (نموونە) و (جێی ئومێد) و (ڕزگارکەر)ە نادیارەکەی هەبێت.. چونکە چنینە زمانیەکانی پەیك، گوێگری ڕەوانەی دنیای بێبڕانەوەی ڕاڤەکردن و دووبارەبیرکردنەوەی دەکرد و بەوجۆرەش ناچاری دەکرد بەردەوام بێت لە وێناکردن و فەنتازیکردن. لە سەرلەنوێ نەخشاندنەوەی وێنەکەی ناو سەری خۆی..

دنیای ناو زمانی پەیك، شێوازی گێڕانەوەی خەبەرەکانی و ئەو کەشەی لەکاتی گێڕانەوە و وەسفەکانیدا دروستی ئەکرد، یارمەتی گوێگری دەدا تا خەوشی وێنە زەینییەکەی پاکبکاتەوە و بە فلچەی خەیاڵەکانی سیمایەکی ڕەنگینتر و پیرۆزتر بداتە پەرستراوەکەی. پەیك وەسفی شت و کەسەکانی دەکرد، بەڵام هەرگیز نهێنییەکانی بەشێوەیەکی ڕاشکاو نەدەگوتن. ڕازی ئەوانی لەگێڕانەوەدا دەپاراست، تاکو هێزە ئەفسوونکەرەکەیان نەکوژێت. ئەو نەیدەتوانی نهێنی تابلۆ دانسقەکان بڵێ، چونکە ئەگەر توانای ئەوەی هەبایە، ئەوە ئیتر (دانسقەیی و ئەفسوون) مانای نەدەما و ئەویش گوێگرەکانی لەدەست دەدان. مەجلیسەکانی هەڵدەوەشانەوە!

بەڵام بۆئەوەی ڕووخسارە نەجیبەکە، بۆئەوەی پەیکی هەواڵهێن، ئەو میوانە ناوەختەی بەشەوقەوە چاوەڕێی دەکرا، بەردەوامبێ لە گێڕانەوەکانی، دەبا ئێمە (ئامادە)بین. بەبێ ئامادەبوونی گوێگر، قسەکانی ئەو مانایان نەبوون. چونکە ئەو بابەت و کەسانەی ئەو باسیدەکردن، هەرئەوانە بوون کەبۆخۆشی بەشێکی زۆریانی لەناو خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆیدا، تابلۆ کێشابوون و لەدوا ئەنجامیشدا لە (زمان)دا و بەهۆی شێوازی (گێڕانەوە)کەیەوە، سیما و هەیبەت و تەجەللای ئەو تابلۆیانەی دەنەخشاندەوە کەخۆی کەوتبووە بەر تەوژمی ئەفسوونیان.. لەڕاستیدا ئەو بەو ئەفسوونەی خۆی دووچاری ببوو، دەیویست

جارێکی دیکە گوێگرەکانیشی لەڕێگەی زمانەوە ئەفسوونزەدە بکات. حیکمەتی ئەو لەوەدابوو کە وا دەزانرا ڕاستەوخۆ لەلای سیما و تابلۆ دانسقەکانەوە دێت. هیچ کەسێ لەگوێگرەکان گومانی لەوە نەدەکرد کە سیمای تابلۆ دانسقەکان بەهەمان ئەندازەی بۆ ئەوان دوورە دەستە، بەهەمان ئەندازە بۆ پەیکیش نادیار. کەسیان بیری بۆ ئەوە نەدەچوو، ئەوەی دەیبیستن، لەڕێگەی زمانەوە دەیبیستن و بەهۆی وێناکردنەوە لەخەیاڵیاندا بەرجەستە دەبێت و چوارچێوەیەکی ستاتیکی وەردەگرێت. دەتوانین باس لە ڕێککەوتنێکی نهێنی بکەین لەنێوان گێڕەرەوەو گوێگردا، لەنێوان پەیك‌و میوانەکانیدا. ئەو ڕێکەوتنە، ئەو (کۆنتراکتە) لەسەر ئەو خاڵەوە بینابووە کە گوێگرەکان تەنیا وەك (گوێگر) بمێننەوە، هەرگیز قسە لەقسەی پەیکدا نەکەن و گومان لە ئەفسوونەکانی نەکەن و لەئاست دەنگی ئەودا دەنگ هەڵدەبڕن.. تەنیا بەهۆی ئەم مەرجەوە بوو، کە ماوەیەکی زۆر (گوتاری تاك) لە ئاڵوگۆڕی کوردیدا ببووە (تاکەگوتاری) زاڵکراو. لێرەشەوە ئەو ئاستەی هەوادار و سەرکردەی پێکەوە دەبەستەوە، بووە ئاستی پێکەوە بەستنەوەی گوێگر و گێڕەوەیش. هەروەك چۆن تاکی کورد بەگشتی‌و ئەندام‌و لایەنگر و تەنزیمیی ڕێکخراوە سیاسییەکان، شوێنگەیەکی پەراوێزییان لەئاست ئەفسوونی سەرکردە و ڕابەردا پێبەخشرابوو، ئاواش پەیك و هەواڵهێنەکان بەدووبارەکردنەوەی ڕیوایەتی ئەفسوناوی هەمان ئەو سیما نادیارانە، خودی گوێگری لەبەردەم وێناکانیدا خەساند و بەپەراوێزیکردن.. ئەم پرۆسەیە سۆبژەی تاکەکەسی ئێمەیان بەدرێژایی ساڵەکان لەبەردەم تابلۆ دانسقە و پیرۆزەکاندا ئەفسوونزەدە کرد. ئەفسوونزەدەیەك، کە بە کەمترین وزەی پرسیارکردنەوە ڕووبەڕووی نیگارە دوورە دەستەکانی و نادیارە وێناکراوەکانی دەبۆوە..

بەڵام پەیك بەڕووداوێکی ئەفسوناوی ڕۆڵی خۆی لەدەستدا. ڕۆیشت و ئیدی کەسیش چاوەڕێی گەڕانەوەی نەکرد.. ڕووداوێ، کە تائێستا چەند قۆناغێکی خۆی تەیکردووە و هەر بەردەوامیشە. لەگەڵ هەموو قۆناغێکیشدا پتر سیمای پەیك و ئەو سیستەمە ئاڵوگۆڕییەشی سڕییەوە کە پەیك ئیشی تیا ئەکرد.

بەشێکی تری حەکایەتەکەی ئێمە باسکردنی ئەو قۆناغانەیە کە تیایدا مەرگی پەیك و هەواڵبەرەکان، مردنی ئەو میوانە لەپڕ و چاوەڕێکراوانە، بووە مەرگێکی واقیعی..

## هاتنی ڕادیۆ (٣):

لەقۆناغی یەکەمدا ڕادیۆ بەڵایەك بوو کەوتە دنیای ئارامیی پەیکەوە. یەکەم دەستی بەزەبری تەکنەلۆژیای ڕاگەیاندن بوو، هات و سیستەمی (خۆماڵیانەی ئاڵوگۆڕکردن)ی کۆمەڵگای ئێمەی هەڵوەشاندەوە. بەهاتنی ڕادیۆ، چارەنووس میوانە نەجیبەکە (پەیك)ی بەرەو سەفەرێکی پڕ لەناهەمواری ڕاپێچکرد، کە دەبوو لەهەر پەناگەیەکدا بەشێ لەمێژووی خۆی و گرنگیی خۆی بدۆڕێنێ. دەبوو لەو سەفەرەدا باوەش بۆ مەرگی خۆی بکاتەوە!

ڕادیۆ، هەردەم زووتر لە پەیك، خەبەر و دەنگوباسەکانی ئاشکرا دەکردن و لەپێش ئەویشدا دەیگێڕانەوە و دەیگەیاندن. بەهاتنی ئەو (سندووقە قسەکەرە) ڕۆژی نەهاتیی هەواڵبەر و پەیك و گەڕیدەکانیش هات. تازە کەس وەکو جاران گوێی بۆ نەدەگرتن و کەم کەسیش بەسامی خەبەرەکانیان ئەفسوونزەدە دەبوو.. هەموو کەوتبوونە گومانکردن لەداستان و بەسەرهاتەکانیان، چونکە یا کۆن ببوون، یاخود لەگەڵ ئەو هەواڵانەدا کە ڕادیۆ بڵاوی دەکردنەوە، یەکیان نەدەگرتەوە. پەیك و هەواڵهێنەکان نەیاندەزانی ئیدی هەر گوێگرێکی ڕادیۆ، بۆخۆی ببووە هەواڵزانێك، ماناو مەبەستێکی سەربەخۆی لەبارەی دنیای دەوروبەرییەوە هێنابووە دەست و دەیتوانی بەهۆیەوە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ کەسانیتردا، سوودی لێوەربگرێت، بیروڕا بگۆڕێتەوە و بەرگرییان لێبکات. گوێگر ببووە کەسێکی قسەکەر.. بەم جۆرەش ڕادیۆ، یەکێك بوو لەو یەکەم ئامێرانەی ڕاگەیاندن، کە هەنگاوێ مرۆڤی ئێمەی لە ئەفسوون و کەشی سەرسوڕمانی بەردەوام لەبەردەم داستانی تابلۆ نادیارەکاندا، ڕزگار کرد. ئەمەش نەك لەسەرەتای هاتنییەوە بۆ کوردستان، چونکە سەرەتا تەنیا وەك موڵکی چینەکانی باڵا مایەوە و ڕۆژگارێکی ویست تا

ببێته کەلوپەلێکی هەمووکەس دەست پێڕاگەیشتوو.. تەنیا دەبێت بڵێم، ئەوەی بەپلەی یەکەم ڕادیۆیشی لەدەست چینەکانی سەرێ سەندەوەو سیمایەکی جەماوەریی پێداو لە (مۆبیلێکی خۆ پێوەهەڵکێشانی ئۆرۆستۆکراتیەتی کورد)ەوە، کردیە ئامێرێکی ڕۆشنکەرەوە لە خزمەتی گشتدا، چایخانە و قاوەخانەکان بوون. چونکە چایخانە و قاوەخانەکان بەهۆی ڕەخساندنی کەشێکی (گشتی)یەوە، ڕادیۆیان لەناو (بالاخانە بێدەنگە بەسەرخۆدا داخراوەکان)ەوە هێنایە دەرێ و لەتاقی ژوورێکی پڕ جمەوجووڵو تەقوهووڕی پیاڵە و ژێر پیاڵەیاندا، دانا، کە دەرگای بەڕووی هەمواندا کراوەبوو.. بەڵام ئەم باسە سەر بە وردە مێژوویەکی تر و بابەتی حیکایەتێکی دیکەیە..

کە ڕادیۆ هات و بووە کەلوپەلێکی زۆربەی خەڵك دەستپێڕاگەیشتوو، ئیتر کەس وەك جاران پێویستی بەوە نەبوو لەچاوەڕوانیی هەمیشەیی پەیکدا بمێنێتەوە، تا هەواڵی نادیار و تابلۆ دانسقەکانی ئەو دیو سنووری ژیانی خۆی بۆ بهێنێ.. ئیتر ناچار نەبوو بۆ بیستنی هەر هەواڵێ دەست لە ئیش و کاری خۆی هەڵبگرێت و ڕێگەی ئەو شوێنە بگرێت کە پەیك مەنزڵی لێ ئەگرت و کەشی ئەفسوونسازی تێدا بەرپا ئەکرد.

گوێگر لەوەدا ئەیتوانی (سنووقە قسەکەرەکە)ی بۆهەر شوێنێ دەیویست، لەگەڵ خۆیدا ببات و لەهەر کاتێکا ئارەزوو بکات دەستبەرێ و (شەپۆلەکان) بادا و گوێ لەو هەواڵ و بەسەرهات و ئاوازانە بگرێ، کە خۆی حەزی لێیانە.. گوێگرتن لە (ئەرکێك) ەوە بووە (چێژ)ێك.

بەو جۆرەش دەتوانین بڵێین، ڕادیۆ بەدەوری خۆی بەشێك لە خودێتی مرۆڤی ئێمەی لەگەرووی کۆمەڵگەرایی (کۆڵەکتیفیزم) ڕزگار کرد و بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند تا ئاستێکی تایبەت بەدوای حەز و خەیاڵە تایبەتیەکانیدا بڕوات و هێندە گرێدراوی ئاکارە بەکۆمەڵیەکانو جێبەجێکردنی نەریتە بڕیار لەسەردراوەکانی گرووپ نەبێت.

پێچی هەر شەپۆلێ بەرەو دنیایەکی تازەی (دەنگ و ئاوان)ی دەبرد. کاتێ لەسەر شەپۆلە کورتەکانی (SW1)یش (ئەو شەپۆلەی هەواڵەکانی شۆڕش و

حەماسەکانی خەباتی لە سانسۆری دەزگای ڕژێمەکان دەسەندەوە و دەیدانەوە بە جەماوەر)، گوێی بۆ بەرنامەی حیزبەکەی خۆی دەگرت، دەیبیست وا پێشەواکەی، ڕابەر و سەرکردە ئایدیالیەکەی دەپەیڤێ و ڕاستەوخۆ پەیامەکانی بۆدەنێرێ.. لەبۆنە مێژوویی و قۆناغە گرنگەکانی خەبات دەدوێ، یادی ڕابردووی نەتەوە و شەهیدەکانی دەکاتەوە و پەیمانی داهاتوویەکی باشتری دەداتێ..

چ پەیکێ دەیتوانی موعجیزەی وەها لەدنیای گوێگردا بخولقێنێ‌و دەنگەکان بگەیەنێ؟!

ئەمە گۆڕانێکی گەورەبوو لەجیهانی ئالۆگۆڕی کوردیدا، کە بێگومان کاریگەریی گرنگی خۆیشی لەسەر پەیوەندی نێوان ڕابەر و لایەنگر و لە نێوان سەرکردە و هەوادارردا، بەجێهێشت.. کاریگەرییەك تەنیا بە درێژەدان بە حەکایەتەکەمان لە گرنگییەکەی تێدەگەین.

کە ئەمەمان گوت، نابێ لە یادیشمان بچێت بڵێین: لەدنیای کوردیدا ڕادوێ نەك هەرتەنیا (ئەفسوونی پەیك)ی پووچکردەوە، بەڵکو ئەفسوونێکی سەیرتری لەجێگە دانا. نەك هەر هەواڵەکانی بەخێرایی (ڕادەگەیاندن)، بەڵکو وادەیشی دەدا ئەو هەواڵانەش بڵاوبکاتەوە، کە (پاش تاوێ) دەگەیشتن. بەمەش ماوەی چاوەڕوانیی گوێگری هێندە کەم کردەوە، کە لەسەردەمی پەیکدا بەخەیاڵیشدا نەدەهات.. لەمەش گرنگرت ئەوەبوو ڕادوێ هەتا بۆی کرابا بەدەم کەسەوە قسەی نەدەکرد، بەڵکو خودی کەسەکانی دەهێنایە قسەکردن. خودی پێشەوا، خودی سەروەرو ڕزگارکەر دەهاتنە قسە و ئاخاوتن و وشەی وەك ئەوانەی ئێمەیان بەکاردەهێنا، هەڵەیان دەکرد و خۆیان ڕاستدەکردەوە و دەکۆکین و هتد.. ڕادوێ بەهۆی بەرجەستەکردنی (دەنگ)ەوە گوێگری هێنایە سەر ئەو بڕوایەی بیر لە (هاوشێوەیی) خۆی و خاوەنی دەنگەکان بکاتەوە، وێنەیەکی واقیعتر و خاکیانەتریان لەسەر دروست بکات. ڕادوێ کاراکتەری ئەفسووناوی لە تابلۆ دوورە دەستە وێناکراوەکان دادەماڵی و شۆڕشێکی لەدژی بەپیرۆزبووەکان بەرپا دەکرد.. بەو جۆرەش مەودای نێوان تاکی کوردی و تابلۆ

دانسقەکان، نەك هەر کەم بۆوە، بەڵکو لەو سام و حیرەتەش ڕزگاری بوو کە شێوازی (ڕیوایەتکردن)ی پەیك لەدەروونیا دەیسازاند و بەهۆی کەشە حەماسییەکانیەوە، *تاکە* گوێگری لەناو *کۆمەڵی* گوێگراندا دەتواندەوە. ئەوەی جاران لەڕێگەی زمانی جادوویی و ڕازئامێزی پەیکەوە بەناو هەزاربەهەزاری شێوازی گێڕانەوەی پڕ سەمبوول و ئیستیعارەدا، وێنای ئەکتەری سیاسی لەناو زەینی تاکەکەسی کوردیدا بەرجەستە ئەکرد، ئێستا ببووە (شەپۆلێ لەدەنگ)، کە گوێگر دەیتوانی بەئاسانی تێیبگات و پەیوەندی خۆی لەئاستیا دەستنیشان بکات. دەنگ و خێرایی گەیشتنی هەواڵەکان لەزەینی گوێگردا، واقیعیانەتر هەبوونی ئەکتەری سیاسییان بەرجەستە ئەکرد و زیاتریش دەیبەستن بەیەکەوە.. هێندە هەیە ڕادیۆ دوا بەرهەمی تەکنەلۆژیا نەبوو کەماڵی پەیکی ڕووخاند، قۆناغێکی تر لە حەکایەتەکەمان باسی ئامێرێکی دیکەمان بۆ دەکات کە دنیای پەیکی هێندەی تر لەدنیای مرۆڤی ئێمە دوور خستەوە. بەهاتنی ئەو ئامێرە، پەیك هێندەی تر ئاوارەبوو، هێندەی تریش لەچارەنووسی خۆی نزیك کەوتەوە.. ئەو ئامێرە تازەیەش (کامێرای وێنەگرتن) بوو.

## کامێرا، بەتایبەتی (*کۆداکی فەوری*):

لە سەرەتاوە کامێرای وێنەگرتنیش وەك ڕادیۆ و وەك هەر بەرهەمێکی تازەی بۆ کوردستان هێنراوی تەکنەلۆژیا، دەکەوتە دەست بنەماڵە و چینە دەوڵەمەندەکان. بەتایبەتیش ئەو بنەماڵانەی لە هێزی سووپاییدا کەسوکاریان هەبوو، یاخود دەرگای چوونە دەرەوە لەوڵات و گەشتوگوزاریان بەڕوودا ئاوەڵابوو.. ئەمەش سەرەتایەکی تاڵە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤی کورد لەگەڵ بەرهەمەکانی تەکنەلۆژیای خۆرئاوا. چونکە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا، بەرهەمە تەکنەلۆژییەکان بەدەست بنەماڵە بالادەستەکانەوە، وێڕای کارکردەکانی خۆیان، دەبوونە هۆیەکیش بۆ ڕەوایەتیدان بەدەسەڵاتی بنەماڵەکان و خۆ جیاکردنەوەیان لەجەماوەری کورد بەگشتی. ئەمەش نەك بەهۆی توانا و داهێنان و زیرەکی ئەندامانی ئەو بنەماڵانەوە لە بەرکارهێنانی ئامێرەکاندا،

بەڵکو بەو هۆیەوە کە ئامێرەکان دەبوونە هۆکارێکیش بۆ خۆنمایشدان و خۆڕازاندنەوەی باڵادەستان لەئاست خەڵکی سادە و ڕەش‌وڕووتی کوردیدا.
کامێرای وێنەگرتن بەدەستی ئەو بنەماڵانەوە، بەزۆری وێنەی مرۆڤی (ناودار)، (خاوەن پلەو پایە)ی دەگرت و دیمەنی بۆنە و ئاهەنگەکانی ئەوانی (عەکس) دەکردەوە. بەم جۆرەش کامێرا (مێژوونووسێکی میقاتکراو)بوو، کە تەنیا مێژووی بنەماڵە *سەروەر* و *ڕەسەنەکانی* دەنووسییەوە. پۆرترێتی سیمای ئەوانی دەکێشا. ساتەوەختەکانی ژیانی ئەوانی نومایش دەدا. لەڕاستیشدا، مێژووی فۆتۆگرافی بەنومایشدانی پۆرترێتی ڕوخسارەکان دەستیپێکرد و ئەمەش بەنیشانەی کاریگەربوونی ئەم هونەرە بەهونەری شێوەکاریی لێکدراوەتەوە. وەفاداریی کامێرا بە مێژووە دێرینەکەی خۆی، وایکردووە ئێمە لەسەرەتای هاتنی ئەم ئامێرەوە بۆ کوردستانیش، زۆر کەم دیمەنی ژیانی سادەی خەڵك، دیمەنی بازاڕ، شوێنە گشتییەکان، گەرماوەکان و جمووجوڵی مرۆڤی ڕەنجووری کوردمان بۆ بمێنێتەوە. ساڵانێکی زۆری ویست تا کامێرای فۆتۆگرافییش وەك ئامێری تەلەفزیۆن و کامێرای ڤیدیۆ، ببێتە شتێکی سادەی بەردەستی زۆربەی خەڵك و لەچوارچێوەی دەسەلاتی تاقە بنەماڵە و سنووری ژیانی تاقە چینێکی کۆمەلایەتی، دەرباز ببێ. ئەمەش خاڵێکی گرنگە ئەگەر زانیمان ئەو ئامێرانە هەریەکەیان ئاستی (بەخودنامۆبوون)ی مرۆڤی کوردی لەگەڵ واقیعی ژیانی خۆیدا بردبووە سەرێ. چونکە وەك پێشتر گوتم: ببوونە هۆیەکی ڕەوایەتیبەخش بە شوێنگە و دەسەلاتی بنەماڵە خانەدانەکان لەئاست زۆربەی هاولاتیاندا و خەڵکی ئاساییدا و ڕۆڵی ئامرازێکی (خۆجیاکردنەوە)شیان دەگێڕا. بەلام بەبلاوبوونەوەیان و کەوتنە بەردەستی زۆربە، کەمێ لەو جیاوازییەشیان کەم کردەوە کە (دەسەلاتی خۆپێناسەکردن)ی سەروەران بەهۆی (خاوەندارێتی)یان بۆ ئەو ئامێرانە، دروستیکردبوو.
ئەگەر بشێت لەناو حەکایەتەکەماندا مێژوویەك دەستنیشان بکەین، ئەوە لەناوەڕاستی ساڵانی حەفتاوە تاکۆتایی هەمان دەیە، کە ڕاگوێزانی زۆرەملەی دێهاتەکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ئەنجام درا، تاکۆتایی ساڵانی هەشتا

کەهەمان ڕژێم خۆی گیرۆدەی شەڕێکی کوشندە لەگەڵ ئێراندا کردبوو، دەتوانین ئاماژە بەدیاردەیەکی سەیر بکەین کە لەکۆمەڵگای کوردیدا هاتە ئاراوە: بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی کامێرای کۆداك(*KODAK*)ی فەوری.
لەگەڵ ئەوەشدا کە هاتن و بڵاوبوونەوەی ئەم کامێرایە لە کوردستاندا پێشتر سەری هەڵدابوو، بەڵام لەدوای ڕاگواستنی گوندەکانەوە بەکارهێنانەکەی تەواو پەرەی سەند.. چونکە هۆکارێکی باش و خێرابوو بۆ مرۆڤی ڕاگوێزراوی ئێمە تا بەهۆیەوە لەناو کۆمەڵگا زۆرەملێیەکاندا، بژێوی خۆی پێ پەیدا بکا. بەڵام بەهیچ شێوەیەك نابێت هۆی بڵاوبوونەووەی خێرای (کۆداکی فەوری) تەنیا ببەستین بەبارودۆخی ئابووری و سەرهەڵدانی ئەو بازاڕە (دەستگێڕ)انەوە کە لەپەراوێزی گوندە زۆرەملێیەکاندا دروستببوون. چونکە لەڕاستیدا ئەو بڵاوبوونەوەیە پەیوەندییەکی پتەویشی بەو پرۆسەی عەقڵانیکردنەوە هەبوو کە ڕژێمی بەعس بۆ کۆنترۆلکردنی ژیانی مرۆڤی کورد لەهەمان سەردەمدا پیادەی دەکرد. واتە پەلاماردان و وێرانکردنی هەموو پەیوەندییەکانی مرۆڤی ئێمە بەناوی (مۆدێرنیزەکردن)ـەوە. خودی گوندە زۆرەملێیەکانیش لە تێرمۆنۆلۆژیای بەعسدا بە (قری العصریە: گوندە هاوچەرخەکان) ناودەبران، کە بێگومان مانای هاوچەرخ لەو دەستەواژەیەدا پەردەیەك بوو بۆ شاردنەوەی ئەو سیستەمی کۆنترۆڵەی لەو کۆمەڵگایانەدا خرابووە گەڕ. من دەمەوێ لە حەکایەتەکەماندا هۆی بڵاوبوونەوەی (کۆداکی فەوری)، نەك لەپەیوەندی لەگەڵ میکانیزمەکانی ئابووری و بازاڕدا شیبکەمەوە، بەڵکو بیگێڕمەوە بۆئەو (پەرچەکردارە)ی مرۆڤی ڕاگوێزراوی ئێمە لەئاست بارودۆخی خۆیدا نواندی.
ئێستاش با بپرسین و ڕوونبیکەینەوە: ئاخۆ لەودیو ئەو پەرچەکردارەوە چ پاڵنەرێك ئامادەبوو؟
شتێکی ئاساییە ڕاگوێزانی بەزۆری گوندەکان و سووتاندنیان، لەدەروونی مرۆڤی ئێمەدا وەك کارەساتێکی نەتەوەیی، یاخود وەکو تێکشکانێکی بەکۆمەڵی ڕەنگیدابێتەوە. ئەمەش پەیوەندییەکی زۆری هەیە بەتێڕوانینی کوردەوە بۆ (گوند) وەك نموونەی سەربەخۆییبوون لە (شوێن)دا. گوند لەخەیاڵگەی مرۆڤی

ئێمەدا هەر تەنیا شوێنێك نییە بتوانین لەگەڵ (شار)دا بەرووردی بکەین، یاخود ڕێستگەیەکی خۆ بەدوورگرتن بێ لەدنیای قەڵەباڵخی و جموجۆڵی زۆر و هتد. گوند بەر لەهەموو شتێ شوێنێکە بۆ سەربەستی و پشت بەخۆبەستن. شوێنێکە بۆ نزیکبوونەوە لەسروشت و لە ڕەگوڕیشەی ئەو بەها و نرخانەی هەستی هاوبەش دروست دەکەن. فەزایەکە بۆ نزیکبوونەوە و ئاشنابوون بەو نەریت و یاسایانەی پەیوەندیی تاك بەکۆمەڵ و بە ڕەگوڕیشە هاوبەشەکانەوە پتەو دەکات. ئەمە ئەو وێناکردنەی مرۆڤی ئێمە بوو بۆ (شوێن)و هەربەهەمان وێناسازیشەوە بەرەو ژیانی شار و گوندە بەناو (هاوچەرخەکان) ڕاگوێزرا..

ڕاگوێزران ترسی (لەدەستدان) و (جودابوونەوە)ی زیاتر کرد، بەتایبەتی کاتێ مرۆڤی ڕاگوێزراو خۆی لەناو کێشمەکێشمەکانی شاردا بینییەوە. ترس لە دوورکەوتنەوە لەشوێنی بیرەوەری و ڕابردووی هاوبەشی، لە مەزاری کەسوکار و خۆشەویستەکانی، لە شوێنی گەورەبوون و یادگارەکانی منالی و ئیشکردن و عەشقەکانی سەرەتای.. لەلایەکی تریشەوە، ترس لە (ونبوون) و (لەبیرچوونەوە) و (هەستکردن بەبەتاڵی) لەناو فەزای چڕی شارەکاندا.. ترس لەژیانی پەراوێزی و مانەوەی بەردەوام لەبازنەی برسێتی و مەرگەساتدا.

بڵاوبوونەوەی خێرای کامێرای کۆداکی فەوری لەناو کۆمەڵگای ڕاگوێزراودا، هەموو ئەم ترسانەی دەنووسییەوە. مرۆڤی ڕاگوێزراو، بەچاوی خۆی خاپووربوونی ماڵەکەی و سووتانی باخچەکانی و پڕبوونەوەی کانیاوەکانی و لەدەستدانی ماڵ و دارایی خۆی دیتبوو. ئەوەی بۆی مابۆوە (بیرەوەری و یادگارەکان)ی بوون، کە ئەوانیش هێدی هێدی خەریك بوو لەناو قەیرانەکانی ژیانی تازەدا لەناو دەچوون. ئەم مرۆڤە ڕاگوێزراوە، پێویستی بەهۆکارێ هەبوو بتوانێ بەهۆیەوە بیرەوەرییەکانی بەزیندوویی ڕابگرێت و لە ئاستێکی (مانەوە)دا ژیانیان بۆ دەستەبەر بکات. چونکە نەیدەتوانی بەبێ بیرەوەرییەکانی و بەبێ خۆراك وەرگرتن لە یادگارەکانی ژیانی هاوبەشیی جاران، لەبەرامبەر تەنیایی و هەلومەرجی بارودۆخە تازەکەیدا شەڕ بکات. لێرەوە کامێرای کۆداك ئەو ئامێرە گونجاوە بوو کە بواری بۆ مرۆڤی ڕاگوێزراو

دەرەخساند زۆرترین بیرەوەری زەخیرە بخات و بە (وێنە)یان بکات. لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە حاڵەتێکی کۆمیدی بەرجەستە بکەم و وای پیشان بدەم کە هەرکەسێك کامێرایەکی گرتبوو بەدەستییەوە، بەڵکو لەو تەفسیرە دەدوێم کە وێنەگرەکان ڕۆڵی کامێرایان پێ دەستنیشان دەکرد: واتە وەك هۆکارێك بۆ هێورکردنەوەی مەعنەویەت و دەروونی پەرێشانبووی مرۆڤی ئێمە بەوەی (ئێستا)ی خۆی بکاتە (یادگار). ڕاستە وێنەگر و کامێرا بەدەستەکانی ئێمە بەزمانی ئابووریی جیهان دەدوان و هاواریان دەکرد: (فەوری بەدیناریٚ)، بەڵام ئەوان لەهەمان کاتیشدا پەیامێکی شاراوەیان ڕادەگەیاند کە لەقووڵاییەکانی ڕۆحەوە سەرچاوەی هەڵگرتبوو: (***ئێستا وێنەیەك بگرە، تا لەدوارۆژدا بیرەوەریی و یادگارێکت هەبیٚ***).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کامێرای کۆداکی فەوریش وەکو جۆرەکانی تری بەرهەمهێنانی میکانیکی، لەزۆر لایەنەوە پڕۆژە و ئەرك و کارەکانی (ڕادویٚ)ی تەواو دەکرد. دەنگەکانی دەکردن بە ئیکۆن (ICON)و لەسەر پانتاییەکی کاغەزیی بەرجەستەی ئەکردن. ڕووخسارە دوورە دەستەکان، گۆرانیبێژە بەناوبانگەکان و قارەمانەکانی وەرزش و دنیای سینەما، ئەو سیمایانە بوون کە لەڕێگە و بەهۆی کامێراوە هاتبوونە بەرهەم. کامێرا هەم هۆکارێك بوو بۆ پاراستنی (شتە تایبەتیەکان) و هەم هۆیەکیش بوو بۆ زەخیرەخستنی زۆرترین بیرەوەری و یادگار. هەروەها لەبیریشمان نەچێت، کە یەکێك لەهۆیەکانی بڵاوبوونەوەی خێرا و بەرفراوانی کۆداك، دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی ئەم جۆرە کامێرایە، خێرایی لە بەرهەمهێنان و ئاسان بەکارهێنانی. ئەمەش هەنگاوێکی باش بوو بۆ نزیکخستنەوەی (تابلۆ دانسقە و پیرۆزە ئەفسوونکەرەکان) و (بینەر)ی ئەو تابلۆیانە: بەهۆی کامێراوە ڕووخسارە دوورەدەستەکان، سیمای ڕابەر، شێخی تەریقەت و ئەکتەری سیاسی هاتنە ناو یەکبەیەکی ماڵەکانەوە و بوون بەبەشیٚ لەدیمەن و سیمای دیواری ماڵان. چونکە هێشتا (ئەلبوومی وێنە هەڵگرتن) دانەهاتبوو. کولتووری کوردیش وەك زۆربەی ئەو کولتوورانەی بۆیەکەمجار بە وێنەکانی کامێرا ئاشنابوون، مامەڵەیەکی (پیشانگایی) لەگەڵ

ئەو وێنانەدا کردووە: ماڵی پێ ڕازاندوونەتەوە، هەڵیواسیون و ئاشکرای کردوون. ئەلبووم لەقۆناغێکی درەنگتردا، واتە دوای هەندێ پرۆسەی سادە پەیدابوو، کە ئەندامەکانی خێزان دەیانویست لەڕێگەیانەوە هەستن بە (موڵکایەتیکردن)ی وێنە و یادگارەکان. دوای بەرهەمهاتنی وێنەی زۆر، ئەمجا ئەلبووم داهات تاکو ببێتە (مۆزەخانە)ی وێنە و نیگارەکان! پێش ئەو قۆناغە، وێنەکان بەشێکی جیانەکراوە بوون لەسیمای لادیوار و سەر تاقی ماڵی کوردیی، واتە ئاشکرابوون و لەبەرچاو. چونکە نەببوونە دارایی تایبەت، بەڵکو هۆیەکی (بەردەوامکردنی ئامادەیی: استمرار الحضور)ی ئازیز و خۆشەویستان بوون لەلای مرۆڤی ئێمە..

وێنەکان خودی کەسەکان نەبوون، بەڵام باشترین بەڵگەبوون لەسەر (بوون)ی کەسەکان. ئەمە جگە لەوەی ئاستێکی واقیعیتری دەدایە وێناسازییەکەی مرۆڤی کورد بۆ بەرجەستەکردن و دڵنیابوونەوەی لە ڕابەر و ڕزگارکەرەکانی، ئاواش لە تەنیایی ئەو مرۆڤەی کەمدەکردەوە. چونکە ئەو چیتر بڕوای بە پەیك نەمابوو تا یارمەتی بدات لەوێناسازیدا، چیدی پابەندی ڕادوێش نەبوو بۆ دڵنیابوونەوەی لە (مان)ی ئەو وێناکراوانە. بەڵکو بەچاوهەڵبڕینێ بۆ وێنە و نیگاری بەدیوار و سەرتاقا هەڵواسراوی ڕزگارکەرەکانی، لە پەیوەندی خۆی پێیانەوە دڵنیا دەبۆوە. ئەمەش بۆ ئەو پشوودانێکی دەروونیی باش بوو، بەتایبەتی ئەگەر زانیمان مرۆڤی کورد لەسەر ئاستی جەستە و لەش زۆرکەم توانیویە پشوو بدات، کە ڕاستییە تاڵەکانی مێژوو بەڵگەی ئەمەن.

جارێکی تر دەیڵێمەوە: وێنەکان بەڵگەیەکی باش بوون بۆ سەلماندنی بوونی کەسەکان (لەوێ) لەودیو چیاکانەوە، بەڵام ئایا بەوەی کامێرا بوونی ئەوانی لەسەر نیگارەکان بەرجەستە دەکرد، لەئەفسوونو دانسقەییانی کەم نەدەکردەوە؟

بێگومان بە وێنەگرتن، لەئەفسوون و تەجەللای وێنەگیراوەکان کەم دەبۆوە و لەسام و هەیبەتیان دەهاتە خوار. بەڵام هەر وێنەکان خۆیان جۆرێکی تری

تەجەللایان دەهێنایە بەرهەم، کە ئەمەش لە خۆگونجاندنی بینەردا لەگەڵ وێنەکاندا (IDENTIFICATION) بەرجەستە دەبوو:
ئێمە دەزانین کە لە دنیای کوردیدا، ڕادوێ لەئەفسوونی پەیك و نەرێتی ڕیوایەتگەری کەم دەکردەوە و شێوەیەکی دیکەی ئەفسوونی لەجێگە دانا، کە زیاتر دنیایی بوو. بەهەمان شێوەش وێنە و نیگارەکان لە ئەفسوونی (ڕادوێ)یان هێنایە خوار. چونکە (دەنگ) وەك خەسڵەتی ئەفسوونکەری ڕادوێ، شتێ نەبوو (بپارێزرێ و هەڵگیرێت)، بەرجەستە نەبوو، لەبەر چاودا نەبوو.. گۆرانیبێژەکان هەرچەندە دەنگیان خۆشبا، هێشتا گوێگر ئاواتی بە (وێنەکانیان) دەخواست، تاکو لەژوور سەرییەوە هەڵیانواسێت و بیانکاتە بەشێ لەدارایی خۆی، خۆیان لەگەڵ بگونجێنێ (لێرەوە لە خۆشەویستی گوێگر بۆ گۆرانیبێژ تێدەگەین، کەلای ئێمە ساڵانی حەفتا و هەشتاکان لەهەڵواسینی وێنەکانی (عبدالحليم حافظ، کەلسووم، داریووش، ستار، گووگووش) و شێوەی خۆ گونجاندنی گەنجانی ئێمە لەگەڵیاندا، گەیشتە لووتکەی بڵاوبوونەوەی خۆی. بەجۆرێ کەم ماڵ هەبوو وێنەی یەکێ لەو گۆرانیبێژانەی تیا هەڵنەواسرابێت و کەم گەنج هەبوو نەیەوێت خۆی وەك ئەوان ئارایشت نەکات).
کاتێ سەرکردەش لەڕادوێوە قسەی دەکرد و وتاری دەدا، دەنگی ئەویش لەگەڵ تەواوبوونی (ماوەی بەرنامەکان)دا تەواو دەبوو. دەبا گوێگر جارێکی دیکە بکەوێـە چاوەڕێکردنەوەی هاتنی (ماوەیبەرنامە)یەکی نوێ.. بەهەرحاڵ، دەنگ ئامادەبوونێکی کورت خایەن بوو، مەحوو دەبوەوە، یاخود دەتوانین بڵێین: دەنگ نەدەبوو بە (تێکست)ێکی نیشتەجێ. هەمیشە تێدەپەڕی و هەڵدەوەشایەوە.. هەر لەبەر ئەو خەسڵەتەیش بوو کە ماوەی خۆگونجاندن لەگەڵ خاوەنی دەنگەکاندا، بەحوکمی مەحووبوونەوە و تێپەڕبوونەکەی، کورتخایەن بوو.
بەڵام کامێرا، گوێگری لەو چاوەڕوانییە ڕزگار کرد و ماوەی چاوەڕوانییەکەی بە (نیگارەکان)ی بۆ پڕکردەوە. وێنەی سەرکردە، پێشەوا، سەرۆکخێڵ و کەسایەتییە نەتەوەیی و ئایینییەکانی بۆ لە چوارچێوە گرت و هەلی ئەوەی بۆ

ڕەخساند، تا لەڕێگەی (تەماشاکردن)ـەوە بواری خۆگونجاندنێکی زیاتری لەگەڵ وێنەگیراوەکان هەبێت. بەم پێیەش وێنە و نیگارەکان جگە لە ڕازاندنەوەی ماڵی بینەر، نیشانەیەکیش بوون بۆ ئاشکراکردنی خەتی سیاسی و لایەنگیریی ئەو بۆ لایەنێکی سیاسی: وێنەی هەڵواسراوی فلاّنە سەرکردەی سیاسی و فیسارە پیاوی ئایینی، ئاشکرای دەکرد کە خاوەن ماڵ سەربەکام حیزبی سیاسی و پەیڕەوکاری کامە ئاینزا و پراکتیکێکی دینییە. دایکانی کورد، بەپێچەوانەی دایکانی سەردەمی (پێش هاتنی وێنە و نیگارەکان)ەوە، بواریان بۆ ڕەخسا بەهۆی وێنەکانەوە زیاتر سەبووری بەدڵی خۆیان بدەن و نیگاری جگەرگۆشەکانیان، کە شەهیدکرا بوون و بە کارەساتی جۆربەجۆر گیانیان دابوو، وەك بەڵگەی کۆستی خۆیان بەگەردندا هەڵواسن.

بەزمانێکی تر، دەشێت بڵێین: وێنە و نیگارەکان بوونە ڕیوایەتکەر و گێڕەرەوەیەکی تری داستان و تراژیدیاکانی مرۆڤی کورد. ئەگەر تا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیش، کورد نەیتوانیبیّ (ڕیوایەتێکی وێنەیی) ژیانە تراژیدیاکەی بۆ جیهان بکات، ئەوە بەلای کەمەوە چوار دەیە زیاترە نیگاری مەرگەساتی ژیانی کوردی و وێنەی کوژرانە بە کۆمەڵییەکانی بوونەتە بەشیّ لە ئەلبوومی یادگاری جیهاندا. قەیدی نییە ئەگەر کورد نەیتوانیبیّ وێنەی دڵخۆشکەر و سەرگەرمکەر پێشکەش بە ئەلبوومی مرۆڤایەتی بکات و کەسیش بۆی نییە لەمەدا لۆمەی بکات، بەلاّم وەلاّمی پرسیاری ئەوەی: ئایا مرۆڤایەتی تاکەی بێدەنگ دەبیّ لەئاست دیمەنە کوردیەکاندا؟ هێشتا ڕوون نییە(٥).

وەك هەر لقێکی تری گێڕانەوە و نووسینەوەی مێژوو، وێنە و نیگارەکانیش سەبارەت بە کورد بایەخی گرنگیان هەیە. وێنەکان بەبیّ هیچ گومانیّ، ڕیوایەتێکی ڕوونترمان پێشکەش دەکەن و وەك لەپێشاندا ئاماژەم پێکرد، جگە لەناوەڕۆکە فیگەرییەکانی خۆیان (بەتایبەتی ئەوەیان کە پەیوەندیی بە حیکایەتەکەی ئێمەوە هەیە، واتە: سیمای ئەکتەری سیاسی)، دەشبنە نیشانەیەك بۆ ئاشکراکردنی دەروەستبوون (ئیلتیزام)ی سیاسی خاوەنەکانیان. لێرەوە شتێکی سەیر نییە کە بلاّوبوونەوەی بەربلاّوی کامێرا لەماڵی کوردیدا

هاوكاتیش بوو بەسەرهەڵدانی فرەلایەنی لەبیرکردنەوەی سیاسیدا. واتە ناسنامەی ئینتیماکان وردە وردە دەهاتن تاکو بەسەر جیاوازیی پانتاییە سیاسیەکاندا دابەش ببن و ئەمەش تاکەکەسی کوردی ناچار دەکرد خۆی ئاشکرا بکات و ببێتە هەڵگری ئەونیشانەیەی لایەنگیریی ئەوی بۆ ئاراستەیەکی سیاسی دەردەخست و لە لایەنگرەکانی دیکەی (جیا) دەکردەوە، کە هەڵگری نیشانەی ئیلیزامکردن بوون بە هێزەکانی ترەوە. کامێرا لەم خۆجیاکردنەوەیەدا رۆڵێکی گرنگی بینی.

بەڵام رۆژگاریٚ هاتو وێنەکان زۆر بوون، ئەلبوومەکانیان پڕ کردن و یاساخەکانیان ئاشکرا دەکردن. دیمەنەکانی سرووشت و بۆنە جیاوازەکان هەموویان کران بە وێنە... وێنە کۆنەکان دووبارە چاپدەکرانەوەو لەچوارچێوەیەکی تازەدا دەخرانەوە پێش چاو.

سەرەتا نرخی فیلمی کامێرای کۆداك، کە هەر دانەیەی (دە) وێنەی دەگرت، هاتە خواریٚ و پاشانیش نرخی کامێراکەش هەرزان کرا.. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەموو کەس بتوانێت بیکڕێت و لێرەشەوە کامێرا، وەك ئامرازێك نرخی خۆی بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان لەدەست بدات. بەمەش وێنەگرەگەڕۆکەکان نائومێد بوون و کەوتنە بیرکردنەوە لە پیشە و کاسبییەکی تر.. رۆژگاری بەسەرچوون نزیك دەکەوتەوە، ئەو ئامێرەی ئیدیعای دەکرد یادگارەکانمان بۆ (نەمر) دەکات، نەیدەتوانی رێگە لە مردنی خۆی بگرێت! ئاسان بەکارهێنانی وای دەکرد رێگەی بکەوێتە هەموو ئەو شوێنانەی هیچ ئامێرێکی تەکنیکی تر نەیتوانیبوو بۆیان بچێت. وێنەی کەسایەتییە (گەورەکان)ی دەکردنە وێنەی بەرباخەڵ، زۆرجاریش بێبەزەییانە دەکەوتە قرتاندن و نەگرتنی بەشیٚ لە دیمەنەکان: لقی درەختیٚ، لوتکەی چیایەك و قۆڵ و کەمیٚ لەسەری وێنەگیراوەکانی دەقرتاند.. بێئاگا لە چارەنووسی خۆی، هێدی هێدی دیمەنەکانی دەشێواندن و دەرکەوتیش جگە لەیەك (چرکە)ی (سەرجەمی بیرەوەرییەك) زیاتر، یان لە (چرکەیەکی ژیانی کەسێك) زیاتری بۆ نەدەگیرا.. ئەوە دەرکەوت کە هەرچەندە ڕوون و ڕەنگاوڕەنگ وێنەی بابەتەکانی گرتبا،

هێشتا ئەو ماوە و کاتەی لە وێنەکانیدا پیشانی دەدایەوە، لە (چرکەیەك)ی ژیانی وێنەگیراوەکان پتر نەدەبوو.. واتە وێنە مێژووییەکان، وێنەی سەردار و پێشەوا و ئەکتەرە سیاسییەکان، تەنیا وێنەی چرکەساتێ بوون لەژیانی ئەوان و هیچی تر.. دەرکەوت وێنەکان دەشێت وێنەی ئەو ڕووخسارانە بن کە مردوون و تازە هەرگیز ڕزگارمان ناکەن.. لەڕاستیدا کامێرا بەهۆی وێنەکانیەوە، ژیانی وێنەگیراوەکانی بەپێی چرکەکانی خۆی (لەت لەت) کردبوو. یاخود چرکەیەکی لە ژیانی بابەت و ڕووخسارەکان هەڵدەبژارد و لەسەرجەمی مێژووی ئەو بابەت و ڕووخسارانەی جیا ئەکردەوە، ئەو چرکەیەشی دەکردە ساتێکی مردووی ژیانی وێنەگیراوەکان..

ئەگەر درێژە بە حەکایەتەکەمان بدەین، ئەوە دەبیستین کە هەموو ئەمانە وایان کرد ژیانی ئەم کامێرایە بکەوێتە مەترسییەوە و لەلایەن جۆرێکی دیکەی کامێراوە شوێنی پێ لێژ بکرێت.. واتە ئەو بەهایەی نەمێنێت کە پێشتر هەیبوو. ئەو سەری ڕادوێی خواردبوو، دەبا شتێکیش هەبێت سەری ئەمیش بخوات، ئەوەش ئامێرێك بوو بەناوی: (کامێرای ڤیدیۆ).

## کامێرای ڤیدیۆ:

کامێرای ڤیدیۆ، نەك هەر وێنەی لە (ماتبوون)ێکی هەمیشەیی ***چرکەیەك لەسەرجەمی ژیانی وێنەگیراوەکان*** ڕزگار کرد و نەك هەر جوڵەی بە نیگارەکان بەخشی و لەیەك کاتدا توانی دەنگ و ڕەنگیشیان بەرهەم بهێنێتەوە، بەڵکو بواری بەموڵکایەتیکردنی وێنەکانیشی گەیاندە لوتکەی خۆی. کامێرای ڤیدیۆ ئەو ئامێرەیە کە ژیانی تایبەتی کەسەکان دەکاتە (بابەت)ی خۆی و لەڕێگەی (بەوێنەکردنیان)ەوە کۆنترۆڵیشییان ئاسان دەکات. بەڵام ئەگەر تەنیا باس لەلایەنی چێژی وێنەی ڤیدیۆیی بکەین، ئەوە دەکرێت کامێرای ڤیدیۆ وەك ئاشکراکەری جۆرێ لە (نەرسسیزم) بخوێنینەوە کە مرۆڤ لە خۆشەویستیدا بۆ وێنەکانی خۆی، بەرهەمی دەهێنێت. چونکە وێنەکانی ڤیدیۆ، جگە لەوەی دەشێت وێنەی تایبەتیترین ساتەکانی ژیانی تاکەکەس بن، بەهەمان شێوەش

دەکرێت ئەو بەشانەش بن لەو ژیانەی کە هەر وەك (موڵکی تایبەت بە تاکەکەس خۆی) بمێنێتەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی وێنەکانی ڤیدیۆ، وەك وێنەکانی کامێرای فۆتۆگرافی لە مۆزەخانەی ئەلبوومەکاندا جێگیر ناکرێن، تاکو هەر ڕێبوارێ بۆی هەبێ تەماشایان بکات. وێنەی ڤیدیۆیی ناخرێنە بەردەم گشت و بەدیوار و شوێنە گشتییەکانیشدا هەڵناواسرێن. بەڵکو پتر بۆ کۆنترۆڵکردنی دیمەنەکانی ژیانی خۆمانن بەدەستی خۆمان لە ناو ژووره تایبەتیەکانماندا..

لایەنێکی دیکەی وێنە ڤیدیۆییەکان بریتییە لە بەرجەستەکردنی خەون و فەنتازیاکانی خودی مرۆڤ. ڤیدیۆ هەرتەنیا تۆمارکەرێك نییە، وێنە لەبەر دیمەنەکانی (دەرەوە)دا هەڵبگرێتەوە، وەکئەوەی فۆتۆگرافی دەیکرد، بەڵکو بەرهەمهێنەر و دیدەنیکەری وێنە و فەنتازیا و خەونەکانی ناوەوەیشە، ئیمکانی ئەوە دەداتە مرۆڤ کە خۆی لە دەسەلاتی ڕستەی (*شتەکان چۆن بوون*) ڕزگار بکات و دەسەلاتی گۆکردنی ڕستەی: (*دەبێ شتەکان چۆن بن*)ی بداتێ.. واتە دەسەلاتی بەرهەمهێنانی ئەو دیمەن و خواستانەی دایە تاکەکەس کە خواست و دیمەنی ناخی خۆی بوون و پێویستییان بە دەربڕین هەبوو.

سەبارەت بە درێژەی حەکایەتەکەمان و پرسیاری ئەوەی، ئایا کامێرای ڤیدیۆ چ گۆڕانێکی بەسەر پەیوەندی نێوان ئەکتەرە سیاسیە بە وێنەکراوەکان و مرۆڤی ئێمەدا هێناوە، نابێت ڕۆڵی شۆڕشگێڕانەی ئەم کامێرایە لەیاد بکەین. چونکە وێنەی فیلمەکانی ڤیدیۆ، نزیکترین نیگاریان لە کەسایەتی ئەکتەری سیاسی ئێمەوە بۆ بینەر هێنا. (ڕیوایەتی ڤیدیۆ) بەتەواوی ڕیوایەتەکانی (پەیك)ی لەبیر بردەوە و لەئاستە ڕیواییەکانی ڕادوێ و وێنە فۆتۆگرافیەکانیشی کەمکردەوە.

ڤیدیۆ توانی لەهەر ئامێرێکی دیکەی تەکنەلۆژی زیاتر لەسیمای نادیارەکانی ئێمە نزیك بکەوێتەوە، ماوەی نێوان بینەر و وێنەکانی کەم بکاتەوە و لەم ڕێگەیەشەوە، ئەفسوونەکانیان بخاتە مەترسییەوە. ئەمەش ڕێك لەسەردەمێکدا ڕوویدا کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕژێمی بەعس، شەوانە وێنەی تاکە سەرکردەی کردبووە بەشێك لە ژیانی تایبەتیی هەر مرۆڤێکی ئێمە و جۆرێك لە وەڕسبوونی

لەئاست ئەو دیمەنانەدا لەلا دروستکردبوو. بۆیە کاتێ بینەری کورد بەنهێنیش تەماشای ئەو فیلمانەی دەکرد کە لەودیو چیاکانەوە و لەودیو سنوورەکانەوە هاتبوون و دەبوو وەك (ئەڵتەرناتیڤێك)ی فیلمە ڕەسمییەکانی ڕژێم بوونایە، هەرزوو جۆرێ لە (هاوشێوەیی) لەنێوان نادیارەکانی خۆی و وێنەکانی تاکە سەرکردەدا بەدی دەکرد. هاوشێوەیی لە دووبارەبوونەوەی ڕۆڵەکان، دیمەنەکان، مانەوەی دووردرێژی سیمای سەرکردە لەسەر شاشە، ئاشکرابوونی تۆنی دەنگ، زمانی ڕووخسار و پانتۆمیمی جەستەو هتد. هەموو ئەمانە زەینی بینەری ئێمەی چالاکتر کرد و خستیە سەر ئەو بارەی وێنەکان شیبکاتەوە، لە چوونیەکیەکەیان بکۆڵێتەوە و تا ئەندازەیەك لەو حیرەت و سەرسوورمانە ڕزگاری ببێت، کە پێشتر لەبەرامبەر وێناکان و ڕیوایەتەکان و فۆتۆکاندا دەستەوەستانیان کردبوو.
بەمانایەکی تر، ڤیدیۆ باشترین هۆی شکاندنی تەجەللا و پیرۆزیی نادیارەکان و تابلۆ دانسقەکانی ناو زەینی مرۆڤی ئێمە بوو. هەروەها بواری ئەوەی ڕەخساند بینەری ئێمە تا ئاستێك لە کۆیلایەتی بەردەم ئەو وێنانەی دەوڵەت لە دەزگاکانییەوە بڵاوی دەکردنەوە، خۆی بدزێتەوە و لەخەڵوەتی خۆیدا بڕوانێتە ئەو دیمەن و فیلمانەی مانایەکی دیکەیان بە (کاتی دەستبەتاڵی) و (ژیانی تایبەت)ی خۆی دەدا و چەپاندنەکانی کەمدەکردنەوە. ڤیدیۆ، پانتایی ژیانی تایبەت (PRIVATE LIFE)ی مرۆڤی ئێمەی بەرفراوانتر کرد، ئەمەش لە کاتێکدا سیستەمی کۆنترۆڵ لە کۆمەڵگای ئێمەدا هیچ بوارێکی ئەوتۆی بۆ ژیانی تایبەتی تاکەکەس نەهێشتبۆوە. لەبەرئەوە ئاسان نەبوو لەژێر زەبری ئەو هەڕەشەیەدا کە سیستەمی کۆنترۆڵ بەسەر ژیانی تاکەکەسدا دەیسەپاند، بینەری ئێمە بێت بۆ تەماشاکردنی وێنەی ئەکتەرە سیاسییەکان، وازبهێنێت لە تەماشا و مومارەسەی چێژەکانی ژیانی خۆی.. ئەو ئاگاییەکی تری لەسەر تاکبوونی خۆی هێنابووە دەست و بەرگرییەکیشی لەئاست سارمۆنیاکانی ئەفسوونسازیدا دروستکردبوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێشتا ڤیدیۆ نەیتوانی دوا ئەفسوونی پەیوەندیی نێوان بینەر و سەرکردە و کەسایەتییە کاریزمییەکان تێکبشکێنێ. چونکە ئەم ئامێرە بەهۆی پابەند بوونەکەیەوە بە شاشەی تەلەفزیۆنەوە، هەرگیز نەیدەتوانی دیمەنەکانی بەشێوەیکی (ڕاستەوخۆ) نومایش بدات و هەمیشە دواکەوتنێکی زەمەنی هەبوو لەنێوان بابەتی دیمەنەکان‌و خودی دیمەنەکاندا. هەرگیز وێنەی سەرکردەی ناو ڤیدیۆ لەهەمان ئان و ساتدا خودی سەرکردە نەبوو لەواقیعدا. بەڵکو ماوەیەکی زەمەنی (بابەت) و (وێنە)ی لێکدی جیا دەکردنەوە و ڕێك ئالەوێشدا ئیمکانی مونتاژکردن، ڕتووش و سانسۆر و دیمەنگۆڕی و ئاراستەکردنی ئایدیۆلۆژیانەی دیمەنە ڤیدیۆییەکان دەهاتە ئاراوە، کە دەشیا هەموو ئەمانە بخرێنەوە خزمەت هێشتنەوەی ئەفسوونی کاراکتەرە کاریزمییەکانەوە و جارێکی دی بینەر ئەفسوونزەدە بکەنەوە.

بۆئەوەی ماوەی نێوان نادیارەکان و بینەرە ئەفسوونکراو و چاوەبەستکراوەکان بەتەواوی نەمێنێت، دەبوو ئامێرێك بێتە ئاراوە توانای گەیاندنی ڕاستەوخۆی هەبێت و هاوکات بەدیمەنەکان، بابەتەکانیش بخاتە ڕوو. بەمجۆرەش تەلەفزیۆن ئەو ئامێرەبوو کە لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا و لەسەرەتای ڕاپەڕینەوە، توانی ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆ. بەڵام تەنیا لەسەرەتاوە، چونکە دواجار سیستەمی کۆنترۆڵکردنی هێزە سیاسییە کوردییەکان بۆ کۆمەڵگای ئێمە، دەزگایەکی گرێدراوی لەم ئامێرە دروستکرد و بەهۆیەوە لەبەرژەوەندی حیزب و ئایدیۆلۆژیاکانی، کەوتە مۆنۆپۆڵەکردنی بینەران و ئەرکی ڕۆشنگەرانەی ئەم ئامێرە. بۆیە ئەم بەشەی داستانەکەی ئێمە لێرەبەدواوە ئاوا تەواو دەبێت:

لەو ڕۆژەوە تەلەفزیۆن بووە موڵکی حیزب، لەوکاتەوە سەرکردە هاتە سەر تەلەفزیۆن و خۆی ئاشکرا کرد، گەورەترین گۆڕانیش لەپەیوەندی نێوان ئەکتەری سیاسی و تاکەکەسی کورددا ڕوویدا. ئەمەش نەك لەبەرئەوەی یەکەمیان بووە ڕووخساری سەر (شاشە)و دووەمیشیان بووە (بینەر)، بەڵکو لەبەر خاڵێکی زۆر گرنگتر کە پەیوەندی بەقووڵاییەکانی پرۆسەی وێناکردنەوە

هەبوو. واتە بە نەمان و سڕانەوەی ڕەگەزی (پیرۆز) لەسیمای وێناکراودا. یاخود مەحوو بوونەوەی تەجەللا لە سیما و هەیبەتی ئەو (ڕزگارکەر) و ئەکتەرە سیاسیانەدا، کە ڕۆژگارێ (لەودیو سنووربوون)یان و (نادیاری)یەکەیان، وایکردووە ببنە تاقە دیمەنێکی ناو خەیاڵە بچکۆلانەکەی مرۆڤی ئێمە.. تەلەفزیۆن توانی بەتەواوی ڕەگەزی پیرۆز لەو سیمایانەدا بسڕێتەوە، چونکە ئەو ئەکتەرە سیاسیانەی ئەمڕۆ بینەری ئێمە لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە ڕاستەوخۆ دەیانبینێ و لە شێوازی هەڵسوکەوتیان دەڕوانێت، نەك هەر تابلۆی دانسقەو سیمای ئەفسوونزەدە نین و بینەر حیرەتزەدە ناکەن، بەڵکو پراکتیزەی زۆر لەو هەڵە و ستەمانەش دەکەن، کە بەدرێژایی ڕۆژەکانی وێناکردنی مرۆڤی ئێمە بۆیان، لێیان چاوەڕێ نەدەکرا.. هەربۆیەشە ئەمڕۆ بینەری ئێمە ئیرادەی ئەوەی هەیە، لەژێر کاریگەریی ئیمکانی وەرگرتنی کەناڵە جیهانیەکاندا بەهۆی (سەتەلایت)ـەوە، ئەو دیمەنانە بەتەواوی ڕەتبکاتەوە و بەدەستپیانانی بە دووگمەی کۆنترۆڵی کەناڵ گۆڕیندا، ئەو فیلم و دیمەنە هەڵبژێرێت کە خۆی حەزی لێدەکات.

پەندی تا ئێرەی (وردەمێژووی ئامێرە تەکنەلۆژییەکان)، پێماندەڵێت: هاتنی ئامێرەکانی تەکنەلۆژیا بۆ ناو کۆمەڵگای ئێمە تا ساتی بەدەزگابوونیان لەلایەن هێزە سیاسیەکانی کوردەوە و لە پەیوەندیان بەکایەی سیاسییەوە، هاتنێکی دڵخۆشکەربووە. چونکە لەگەڵ ئەوەشدا بوونەتە هۆی نەمانی هەندێ سیستەمی ڕیوایی خۆماڵیانە (مەرگی پەیك و هەواڵهێنەکان، کوشتنی نەرێتی حەکایەتخوانی و...هتد)، ئەوە توانیویشیانە لەو کەشی ئەفسوونسازییە کەم بکەنەوە، کە بەدرێژایی قۆناغی بەرگریی، پەیوەندی نێوان تاکەکەسی ئێمە و سەرکردە و ئەکتەری سیاسی ئێمەیان لەپلەی پەیوەندی (ئاغا و کۆیلە)، (فەرماندە و فەرمانبەر) و (ئەفسوونساز و ئەفسوونلێکراو)دا ڕاگرتبوو.. ئەم دەزگایانە دەوریان هەبوو لە گۆڕینی پراکتیکی سیاسی و لە گرنگیدانی مرۆڤی ئێمە بە خودی خۆی و خواستە ناوەکییەکانی، بەچێژبینین لەکاتی دەستبەتاڵی و خۆڕزگارکردنی لە زۆربەی ئەو نەریتانەی ڕاپێچیان دەکردەوە بۆ ژێر زەبری

دەسەڵاتی گرووپ و ئایین و لەئەنجامیشدا (جەماوەرێکی سیاسی)، یان (کۆمەڵەیەکی ئایینی دەستەمۆکراو)یان لێدروست دەکرد..
بەڵام ڕاستییەکی تاڵ ئەوەیە لە ساڵانی ڕابردوودا، بەتایبەتی لەدوای ڕاپەرینەوە، ئێمە ئەوە تێگەیشتین کە خودی پەیوەندییەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگای ئێمەدا، بەهەمان ئاراستە ئامێرەکانی ڕاگەیاندنی بەکارهێناوە: واتە توانای هەبووە ئەو ئامێرانە لەدژی دەستکەوتە مێژووییەکانیان بەکاربهێنێت و لە ئێستادا نەك هەر سیمای ڕزگارکەری تریان پێ دروستبکاتەوە، بەڵکو بەهۆیانەوە سیستەمەکانی کۆنترۆڵی دەسەڵاتیش بەناو سەرجەمی کۆمەڵگادا بڵاوبکاتەوە و بکەوێتە بەسرووشتیکردنی چاوبەستە ئایدیۆلۆژیەکانیشی.
﴿وتاری (ڕۆڵی تەلەفزیۆن لەبەرهەمهێنانی زەبروزەنگدا) نموونەی ئەو بارودۆخەمان بۆ شیدەکاتەوە.﴾ بەواتایەکی تر، ئەمە پێمان دەڵێت: ئامێرە تەکنەلۆژییەکان لەوڵاتی ئێمەدا نەك هەر درێژەپێدەری سارمۆنیای ئەفسوونکردنن لەسیمای ئەکتەری سیاسی، ئەمەش نەك هەر بۆتە چێژێك کە ئەو کاراکتەرە لە سیمای خۆی دەیبینێت و پەیوەندیشی هەیە بە وێناکردنی خۆی بۆ خۆی، کە لەهەمان کاتدا خۆزگەی ئەوە بۆ دروستکردنی هاوشێوەیی لەنێوان خۆی و کاراکتەری دیکتاتۆردا. بەڵکو شتێکی ترسناکتریشمان لەسەر مرۆڤی کورد پێدەڵێت: واتە پێویستیی ئەو مرۆڤە بەسیمای ئەفسوونکەر.
پێمان دەڵێت: کاراکتەری مرۆڤی ئێمە چەندە کاراکتەرێکی هەڵوەشاوە، چەندە نغرۆی ناو بونیادە تەقلیدی و کەشپەرستەکانی کۆمەڵگای ئێمەیە و لەلایەن ئەو هێزانەوە جڵەو کراوە کە تەقسەکانی ئەفسوونسازی بەرهەم دەهێننەوە. هەر ئەم کاراکتەرە لاواز و هەڵوەشاوەیەشە کە لەبەردەم شاشەی ئەو تەلەفزیۆن و لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارانەدا بەسەر سووڕمانەوە ڕایدەگرێت، کە جگە لە ئینشانووسین و خوتبە ئامادەکردن هیچی تری پێڕاناگەیەنن.. ئەگەر جاروباریش وەڕسبوونی خۆی پیشان بدات، ئەوە ناچارە ڕووبکاتە ئەو ئەڵتەرناتیڤانەی، کە کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانی جیهان بەتایبەتیش کەناڵەکانی کۆمپانیای سەرگەرمیکردن و کولتووری ڕواڵەتگەرا، دەیخەنە پێش چاوی..

ڕەنگە ئەم خاڵەش ھاندەرێکی باش بێت بۆ ھەوڵدانی بەردەوام لەپێناوی ھێنانەکایەی دەزگایەکی ڕاگەیاندنی ڕۆشنگەرانەی کوردیدا، کە بتوانێت لە ئاشکراکردنی بونیادە تەقلیدییەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا کاریگەربێت و لە بیناکردنەوەی کاراکتەری مرۆڤی ئێمەشدا بەشداری بکات.
دیارە ئەمەش بابەتی حەکایەتێکی ترە..

کۆپنھاگن
١٩٩٨-١٩٩٣

## پەراوێزەکان

١- ئەم وتارە ئیشکردن و بیرکردنەوەیە بەسێ وتاری واڵتەر بنیامین لەیەك کاتدا و وەرگرتنی ھەندێ چەمکە بۆ تێگەیشتن و خوێندنەوەی دیاردەکانی ناو کۆمەڵگای خۆمان. ئەو وتارانەش بریتین لە (کاری ھونەری لەسەردەمی بەرھەمھێنانەوەی میکانیکیدا)، وتاری: (ڕیوایەتگەر: ھەندێ بیروڕا سەبارەت بەنیکۆلای لیسکۆڤ) و ھەروەھا وتاری (کورتە مێژووی فۆتۆگرافی) کە لەیەکەمیان و لەسێھەمدا، بنیامین سەبارەت بە مانای چەمکی (AURA) دەدوێت و لە دووەمیشدا سەبارەت بە مەرگی ڕیواتگەری. بە ڕیز ناوی وتارەکان لەم سەرچاوانە وەرگیراون:
(1) KUNSTVRKET I DETS TEKNISKE
REPRODUCERBARHEDS TIDSTALDER.
(2) LILLE FOTOGRAFIHISTORIE
BETRAGTNINGER OVER NIKOLAJ ،(3) FORTALERN
LESKOVES FORFATTERSKAB. IN: -WALTER BENJAMIN:
PETER MADSEN GYLDENDAL ،KULTURKRITISKE ESSAYS
1998.

ناونیشانی وەرگێڕانێکی فارسی وتاری یەکەم و دووەمیان بەم جۆرەیە: (اثـر هـنـري در دوران تـكـثـير مـيـكـانـيـكـي آن)، (حکایتگر:

اندیشەهایی درباره نیكلای لسكوف)، لە كتێبی: نشانەای بەرهایی: مقالەهایی از والتر بنیامین. ت: بابك احمدی، نشر تندر، تهران ١٣٦٦ص ٢٣٧-٢٨٦.

٢- بێگومان شێوەی دیكەی وێنەی شوێن و كەسایەتییە پیرۆزەكان، پێشتر لەبەرچاوی موسڵماندا هەبووە: (نەخش‌و نیگار، ئیكۆنەكان‌و هتد). بەلاّم ئێمە باسی رۆڵی ئامێرە میكانیكیەكان دەكەین لە نەهێشتنی ئۆرگێنالێەت و كوشتنی ئەفسوونسازیدا.

٣- رادویێ، گۆكردنی زمانی رۆژانەی كوردە بۆ وشەی (رادیۆ)، هەروەكو چۆن وشەی (یۆنان)یش بە (وێنان) گۆ دەكرێت.

٤- بەشێكی ئەم وتارە پێشتر بۆ پرۆژەیەكی نومایشی هونەرمەندان (نیگار حەسیب قەرەداخی‌و شەماڵ عومەر)، ئامادەكرابوو، كە وێنە‌و نیگاری فۆتۆگرافیی بەشێكی گرنگی نومایشەكان بوون. لێرەدا ئەو بەشەی وتارەكەش دەنووسمەوە كە بەتایبەتی بۆ ئامارەكردن بەو پرۆژە نومایشییە ئامادە كرابوو:

(كاتێ هونەرمەندی شانۆی كوردیش، سەرەرای هەموو ئیمكانیەتەكانی بواری شانۆ، بۆ نومایشدانی ژیانی میللەتێ پەنا بۆ ئەو چركەساتانە ئەبات كەوێنەكان لەسەر ژیانی ئەو میللەتە و رابردووە تراژیدییەكەی بۆیان پاراستووین، ئەوە بەمانای ئەوەیە كە مەرگەساتی نەتەوەیی ئێمە، مەرگەساتێكی گەورەیە و پێویستە بەهەموو شێوەكانی ریوایەتكردن بیگێرینەوەو نومایشی بدەین..

ئەوكاتەی هونەرمەند وێنە و نیگارەكان لە مۆزەخانەی ئەلبووم دەهێنێتە دەرەوە و لەسەر شانۆ بەشێوازێكی ئیستاتیكی كارا نومایشیان دەدات، بەمانای ئەوەیە، بینەر داوەت دەكات لەو چركەساتە مێژووییانەمان رابمێنێ، كەپێویستییان بە زیاد لەشێوازێكی گێرانەوە هەیە. شەماڵ‌و نیگار بەم هەوڵدانەیان، نەك هەر تەنیا لەگێرانەوەو نومیاشدانەوەی مەرگەساتی كوردیدا بەشداری دەكەن، بەڵكو رەهەندێكی ئیستاتیكی تریش بەو گێرانەوەو نومایشدانەوەیە دەدەن. لەمەش زیاتر: بەڵكو هەموو گێرانەوە تاكرەهەندەكانی پێش خۆیان رەت دەكەن‌و رێخۆش دەكەن بۆ گێرانەوەیەكی فرە رەهەند).

# والتەر بنیامین و
## (کورتە مێژووی فۆتۆگرافی)

*«بەڵام من هەرگیز بەم شێوەیە نەبووم..*
*– چۆن دەزانیت؟ ئەم (تۆ)یە چییە کە لەوانەیە لێی بچی یان لێی نەچی؟ لەکوێدا دەیدۆزیتەوە، بەکام توانای تەعبیر و شێوەناسیتەوە؟ ئەو پەیکەرە بڕواپێکراوەت لەکوێیە؟ تەنیا تۆیت کە هەرگیز ناتوانیت جگە لەوێنەیەکی خۆت زیاتر شتێکی دیکە ببینیت. تۆ هەرگیز چاوی خۆت نابینی مەگەر ئەوکاتەی نیگای بێ ڕووناکییت بکەوێتە سەر ئاوێنە و شووشە (حەزمەکرد لەوکاتەدا چاوانم ببینم کە دەڕواننە تۆ»*
**ڕۆلان بارت: کتێبی ڕۆلان بارت**

دۆزینەوەی تەکنیکی فۆتۆگرافی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، وەك بنیامین لە وتاری (کورتە مێژووی فۆتۆگرافی)دا دەنووسێت، دەستپێکی گەشەسەندنێکی بەگوڕ و تەوژم بوو(١). سەرەتا ئەو سندووقە قورس و گەورانەی وێنەگرتن پەیدابوون کە نەدەکرا بەئاسانی بگوێزرێنەوەو کاتێکی زۆریشیان دەویست تا ڕەسمەکانیان لە کارگەی پۆرتریتسازەکاندا بشۆرێنەوە، کە ئەم کارگانەش میراتی بۆرجوازییەت بوون. لەوەدواش، هاوشان بەوەی کامێرایەکی باشتر داهێنراو چواردەور و پاشزەمینەی وێنەکان پتر دەپارێزرایەوە، خێرایی شتنەوەیش زیادی کرد.
پاشان ئیمکانی ئەوە دروستبوو کە وێنەکان ڕاستەوخۆ لەسەر کاغەز و بەتەکنیکی تایبەت، چاپبکرێن، لێرەشەوە وێنەکان دەرگایەکی دیکەی ژیانیان لەسەر ئاوەڵابوو: بە ژمارەی زۆر لەبەریان هەڵدەگیرایەوە، چەندین جار هەمان وێنە دەشۆرایەوە، گەورەو بچووك دەکرا،ماڵیان پێدەپارێزرایەوە و دەخرانە ئەلبوومەوە و بەوجۆرەش بەهەموو لایەکدا بڵاو دەبوونەوە. ڕێك ئالێرەشدا دەزگاکانی وەك: مۆزەخانەکان، پۆلیسخانەکان و ئیدارە ڕەسمییەکانی تر

کەوتنە بەکارهێنانی نیگارەکان وەك کەرەستەیەکی بەڵگەنامەیی. ئەمە جگە لەوەی لەدەمەدەمی کۆتایی هەمان سەدەشدا، گۆڤار و ڕۆژنامەکان بۆ ڕازاندنەوەی لاپەڕەکانیان کەوتنە بەکارهێنانی وێنە فۆتۆگرافییەکان.
لەسەرەتاوە فۆتۆگرافی لەگەڵ هونەری شێوەکاریدا بەراوورد دەکرا. خاڵی بەراووردکردن لەوێوە خۆی سەپاندبوو کە بگوترێ: هونەرمەند تابلۆکەی خۆی **دەکێشێ**، لەکاتێکدا فۆتۆگراف بەکامێراکەی وێنەکانی **دەگرت**. ئەمەش بواری ئەوەی ڕەخساند تا کردەی تابلۆکێشان بە دەربڕینێکی خودیی (سەبجەکتیڤ) لەقەڵەم بدرێتو فۆتۆگرافیش بە کردەی تۆمارکردنی بابەتیانە (ئۆبجەکتیڤ). ئەم دژایەتییەش چ لە بیروڕای ئەوانەدا ڕەنگیدەدایەوە کە فۆتۆگرافییان خۆشدەویستو چ ئەوانەش کە ئەو دۆزینەوە تازەیەیان پێهەرسنەدەکرا. بۆ نموونە، دۆمینیکۆ ئینگریس، کە لایەنگرێکی سەرسەختی کلاسیسیزم بووە لەهونەردا، هەوڵێکی زۆریداوە بۆئەوەی فۆتۆگرافی لەخانەی ***هونەرەجوانەکان*** بکاتە دەرێ، ئەمەش تەنیا لەبەر هۆی (میکانیکیبوونی ئەو بابەتیەتەی کە لەوێنەکاندا پیشانی دەدات). لەکاتێکدا ڕەخنەگری وەها هەبوون کە تەکنیکی فۆتۆگرافییان بە (میدیای سەردەم) لە قەڵەمداوە. وەك دەشزانین هەر لەهەمان سەردەمدا و لەبواری ئەدەبدا، نووسەرە ناتورالیستەکان کەوتنە (نووسینەوەیەکی وردی واقیع)و لێرەشەوە ئەزموونی دیداریانەی دنیای دەوروبەر، ڕۆڵێکی گەورەی دەبینی بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت خۆی دەربڕێت. ئەمیل زۆلا، کە یەکێك بوو لەو نووسەرانە حوکمێکی گەلێك سەرنجڕاکێشی لەبارەی گرنگیی هونەری فۆتۆگرافییەوە هەیە کە دەڵێت: مرۆڤ ناتوانێ بڵێت شتێکم بینیوە پێش ئەوەی وێنەی نەگرتبێ!
لەکۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، کە دواجار لەناو لێشاوی وێنەی دڕندەییەکانی خۆیدا نغرۆ بوو، ئەلفرید ستیلز ( A. STIEGLITZ) کەوتە وێنەگرتنی شارەگەورەکانی وەك نیۆرك. سەرەتا لەسەر شێوازێکی ئیمپرشیۆنیستی کە پێدەگوترێت (پیکتۆرالیزم)و پاشانیش لەسەر شێوازێك کە تیایدا کەمتر ڕەچاوی زمانی هونەری دەکرد. واتە کەمتر خۆی

دەبەست بە میراتی تەکنیکی هونەری شێوەکارییەوە: مۆدێلسازی، کۆمپۆزیشن، پرسپێکتیڤو هتد... ڕەنگە بتوانین ئەمەش وەك یەکەمین هەوڵی فۆتۆگرافی لێکبدەینەوە بۆ پێکهێنانی پانتایی و بۆ دروستکردنی زمانێکی سەربەخۆ. لێرەشەوە بزووتنەوەیەکی وێنەگری سەرەتا لە ئەمریکا و پاشان لە ئەورووپا دەستییێکرد و ئامانجیشی ئەوەبوو، کە (بەشێوەیەکی ورد وێنەی واقیع بگرێتەوە تاکو لەورێگەیەوە چاوی بینەر بەجوانیی دنیا هەڵبێ). بنیامین ناوی (ئەلبێرت پاتزیخ)ی ئەڵمانی دەهێنێ، کە ڕاستەوخۆ کتێبێکی خۆی، کە وێنەی هەمەجۆری بارودۆخە ڕۆژانەییەکان، گژوگیا، ئاژەڵو بیناپیشەسازییەکانی تێدابووە، ناوناوە: (DI WELT IST SCHON)، بەمانای: (جیهان قەشەنگە). ئاشکرایە لەم دەربڕینەشدا ئەو تێڕوانینە ڕەنگیدابۆوە کە دەیگوت: وێنەگرەکان هەر هێندەیان زەحمەتە بچنە دەرەوەو لەو سەرەوە جوانی دنیا لەگەڵ خۆیان بهێنێتەوە ماڵ! جوانیی بۆ پاتزیخ لە (دەرەوە) بوو..

ئەم ڕوانگە تەقدیسکەرەش ساڵانێکی زۆر کاری توێژەرەکانی زەحمەت کردبوو تا بەبێ ترس ڕاڤەی (ڕەهەندی ستاتیکی وێنەگر و وێنەکان)ی بکەن. کێشەکە لەوەدا بوو کە چ هونەرمەندانی دژ بە فۆتۆگرافیو چ ئەوانەشیان کە لەفۆتۆگرافیدا بەدووی ئەزموونێکی هاوچەرخانەتر و ڕاستگۆیانەتری کۆپیکردنەوەی واقیعدا دەگەڕان، فۆتۆیان وەك (پەنجەرەیەك بەرەو جیهان) دەبینی، نەك وەکو وێنەیەك کە واقیعی بەشێوەیەکی تایبەت ڕەنگ پێدەدایەوە و کۆپیی دەکردەوە. بەسەرهەڵدانی وتارەکەی بنیامین، ئەگەرچی زۆر لەدوای لەدایکبوونی ئەم دیاردەیەوە هات، ئەو تێگەیشتنە پیرۆزمەندەش لە فۆتۆگرافی گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هات. واتە فۆتۆگرافی لە ڕوانگەیەکی سۆسیۆلۆژیانەوە لێی کۆڵرایەوەو هەردوو بواری (ئێستاتیکای فۆتۆ)و (بەکارهێنانی وێنەکان لەلایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە) بوونە بابەتێ بۆ لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکردن.

بنیامین لەو شوێنەوە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد، کە هەموو تێگەیشتنە ئێستاتیکییەکەی خۆی لەسەرەوە داڕشتووە: ئەو گۆڕانکارییانەی مۆدێرنیتە

سەپاندنی. واتە سەردەمی تەکنیکی کۆپیکردنو دووبارە بەرهەمهێنانەوەی میکانیکی کردە خاڵی سەرەتا، کە ئەم تەکنیکەش بواری ئەوەی ڕەخساندبوو وێنەکان بەژمارەیەکی بێ ئەندازە بڵاوببنەوەو بەهۆی نزیکییان لە هەموو شوێنێکەوەو وردییان لەڕەنگپێدانەوەی هاوشێوە واقیعیەکەیاندا، ببنە پانتاییەکی دیکەی ئەزموون. زۆربوون ئەو هەستەیان لەلا دروست ببوو کە بە وەستان لەبەردەم کامێرادا، پانتایی ئەزموونی تایبەتیان بەرفراوانتر بووە. بەڵام بنیامین جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە "ئەو ئەزموونەی نیگارەکان دەیانهێنایە دی، ناکرێت لەگەڵ ئەو ئەزموونەدا بەراورد بکرێت کە جەستە بەبێ هیچ ئامراز و ناوەندێك پیایدا تێدەپەڕێ". ڕاستە فۆتۆگراف دەیتوانی بابەتەکەی لە واقیع بپچڕێتو لەیەك چرکەدا وشکی بکاتو بەمەش خۆی لەشێوازی کارکردنی هونەرمەندی شێوەکاری جیا بکاتەوە کە پلە بەپلە مامەڵە لەگەڵ باتەکانیدا دەکات، بەڵام لەبەر ئەم هۆیە فۆتۆگرافی کردەیەکی کەمتر ئێستاتیکی نەبوو. هەربۆیەشە دەکرا باس لە (ئێستاتیکای وێنەگرتن)و بەکارهێنانی وێنەکان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا بخرێنە بەر تیشکی ڕەخنەوە.

لە وتارێکی دیکەیدا بەناوی (نووسەر وەك بەرهەمهێن)، بنیامین هەوڵیداوە لەڕێگەی ڕاڤەکردنی وێنەکانی (ئەلبێرت پاتزیخ)ەوە، کە پێشتر ناوی هات، بیسەلمێنێ: تەکنیکی فۆتۆگرافی هەر تەکنیکێکی سادەی لەبەرگرتنەوە نییە. تەکنیکێکە، شێوەیەکی تازەی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ واقیعیشدا بۆ مرۆڤ هێناوەتە کایەوە(٢). ناوی کتێبەکەی (پاتزیخ): "جیهان قەشەنگە"، ئەو هەستەمان دەداتێ کە دنیا لەخۆیدا جوانە و وێنەگریش تەنیا وێنەی جوانیی گرتووە. بەڵام بەپێی لێکدانەوەکەی بنیامین "دنیا تەنیا لەنیگارەکانی پاتزیخدا جوانە". واتە ئەو کاتەی دەبێتە بابەت و لە نیگارەکاندا دەیبینین.

چاوی کامێرا مەودایەکی لە نێوان وێنەگر و دنیادا هێناوەتە دیو بینینی دنیاش لەچاوی کامێراوە، واتە لە "لینز"ی کامێراوە، نیگامان لەئاست جوانیی ڕواڵەتیانەی شتەکاندا تیژتر دەکات. ئەم بینینەش هەر تایبەت نەبوو بەوێنەگرەکان، بەڵکو بڵاوبوونەوەی فۆتۆگرافی بەگوتەی بنیامین، بووە هۆی

"له دایکبوونی گۆڕانێکی گەورە لەئەزموونکردنی جیهاندا بەگشتی". دەبوو کامێرا و ئەسپابت هەبێ تا وێنەی فۆتۆگرافی بگریت و بیانشۆیتەوە، بەلأم بۆ ئەزموونکردنی واقیع لەڕوانگەی ئێستاتیکییانەوە، پێویستت بەکامێرا و ئەسپابیتر نەبوو.

بنیامین بەترسەوە دەیڕوانییە ئەو مەودا ئێستاتیزەکراوەی ئەزموونکردنی واقیع، کە فۆتۆگرافی هێنابوویە ئاراوە. ئەمەش لەبەرئەوەی خوودانە وێنەگرتن لەسییەکانی ئەم سەدەیەی کۆمەڵگای ئەڵمانیدا، کە پڕ بوو لەقەیرانی ئابووریو کۆمەلأیەتی، وەك سۆزگەراییەکی ساویلکانە لەئاست واقیعی دەوروبەردا خۆی دەنواندو کاریگەریی بەجێ دەهێشت. هەروەها ئێستاتیزەکردنی دەردە کۆمەلأیەتییەکانو جەنگ، زۆرتر لەدژی پرۆسە دیموکراسییەکان دەکەوتنەوە، نەك خزمەتیان پێیدەکرد.

ئەو میدیایانەی پشتیان بەبلأوکردنەوەی نیگارەکان دەبەست، ڕۆژانە هاولأتیانیان بە فۆتۆگرافیەکان بۆمباران دەکرد و "بینەرانیش بەو چاوەوە دەیانقۆستنەوە کە ئەو وێنانە تێگەیشتنی ئەوانی لەواقیع بەرفراوان و ئیرادەی مامەڵە کردن و ڕووبەڕووبوونەوەیانی لەگەڵ واقیعدا بەهێزتر دەکرد".

لەڕاستیدا، وەك بنیامین دەڵێت، خەڵك ڕێگەیان بەخۆیان دەدا تاکو بەنیگایەکی پێچەوانەبووی پاسیف کراوەوە بڕواننە واقیع، کە جوانییەکی ساویلکانە لە قوتوویەکی بەتاڵ، یاخود لە سەقفی هەر خانوویەکدا بەدی بکات، بەلأم لە ئاست ململانێی کۆمەلأیەتیو ئابوورییەکانی کۆمەڵگادا کوێر بێت: (چارەنووسی فۆتۆگرافی ئەوەیە، کە دواجار خۆی دەدات بەدەست مۆدەی ڕۆژگارەوە و ئالێرەشدا ڕێك تەعبیری "جیهان قەشەنگە" دەبێتە دروشم و بانگەوازی. کاتێ هەڵوێستی فۆتۆگرافی ئاشکرا دەکەین، کە لەهەموو قوتوویەکی بەتاڵدا جوانی دەبینێ، بەلأم ناتوانێت یەك شت لە پەیوەندی بەو دەوروبەرە ئینسانییەوە، کە خۆی تیا سەرهەڵدەدات، تێبگات.. وێنەی کارگەکان دەگرێت، بەلأم لەسەر پەیوەندییە نائینسانییەکانی ناو هەمان ئەو کارگانەدا نابینایە)(٣).

لەهەمان کاتیشدا زەحمەت بوو سنووریّك لەنێوان ئێستاتیزەکردنی دنیا و هێنانە پێشچاوی ڕاستەوخۆی واقیع، دەستنیشان بکرێت. هەرچەند کێشە کۆمەلآیەتییەکان پەرەیان دەسەند، زیاتریش پێویستی بڕوابوون بەواقیعێکی دیکە و دنیایەکی باشتر خۆی قوت دەکردەوە. فۆتۆگرافیش میدیایەکی ئایدیالی بوو بۆئەوەی خەونەکان لەواقیع نزیك بخاتەوە و ئەو دنیا ئایدیالییە لە ئاستە دیدارییەکەیدا بەرجەستە بکات.
ڕێك ئالێرەشدا بوو کە دەزگای پڕوپاگەندەی نازییەکان تائەوپەڕی سوودی لەم ئیمکانیەتە بینی کە فۆتۆگرافی دەیخستە بەردەستیان، بەهێنانە بەرچاوی (هەڵبژاردەی ڕەگەزی خاوێنی ئاری)و کردنی بەدیمەنی نموونەیی ناو کۆمەڵگا، بەهۆی ئەو توخمە ڕیالیستییەی لە فۆتۆگرافیدا هەیە، وەك ڕەنگدانەوە و بەرجەستەکەری واقیعێکی ئایدیالی خۆی دەنواند. وەك دەشزانین لەشەڕی هەوڵدانیشدا بۆئەوەی واقیعی کۆمەلآیەتی لەوێنە ئایدیالییەکەی بچێت، بۆ ئەوەی واقیع لە ئیدیعایە ئایدۆلۆژییەکان بچێت، دڕەندەترین تاوانەکان مەشروعیەتیان وەرگرت.
لەوکاتەدا کە بنیامین ڕەخنەگرانە دەیڕوانییە فۆتۆگرافیو ئەو گۆڕانەی شییدەکردەوە کە لەپەیوەندی نێوان خود و دنیای دەرەوەدا لەگەڵ خۆی هێنابوویە ئاراوە، لەهەمان کاتیشدا گرنگیی زۆری پێدەدا و چاوەڕوانییەکی زۆریشی لە توانا تەکنیکییەکانی هونەری فۆتۆگرافی هەبوو.
لەهەردوو وتاری "***بەرهەمی هونەری لەسەردەمی کۆپیکردنەوەی میکانیکی:*** ١٩٣٦" و "***کورتە مێژووی فۆتۆگرافی:*** ١٩٣١"دا، باسی ئەوەی کردووە کە چۆن کۆمەڵگای مۆدێرن خۆی لەبەردەم (نەمانی "ئەفسوونو تەجەللا"دا دەبینێتەوە. هەر لەپەیوەندیش لەگەڵ چەمکی ئەفسووندابوو، کە هەڵوێستی دوو جەمسەریانەی خۆی لەئاست فۆتۆگرافیدا خستەڕوو.
لە هەردوو ئەو وتارەدا، بنیامین ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن نرخی ئایینی بەرهەمی هونەری لەلایەن نرخی نومایشیانەیەوە شوێنی پێ لێژ کراوە و تووڕ هەڵدراوە: واتە بەرهەمی هونەری لەو بارودۆخەیەوە کە بابەتێکی مەعنەویانەی

دانسقە و بێ نموونە بێت و تەنیا لەکەش و هەوایەکی تایبەتدا ڕۆڵی خۆی هەبێت، پێی ناوەتە بارودۆخێکەوە کە ببێتە بابەتێکی نرخ لەسەر دانراو و، تەنیا بەهۆی تەماشاگرنیشەوە ئەزموون بکرێت. لەگەڵ پەیدابوونی فۆتۆگرافیشدا ئەم گۆڕانە بەجارێ بەرهەمی هونەری لە کارکردە ئاییتییەکەی دابڕ کرد و هێنایە سەر ئاستی کەل‌وپەل‌و کەرەسەتەیەکی ئاسایی کە هەموو کەس بتوانێت دەستی پێی بگات. لێرەشەوە، توانای فۆتۆگرافی بۆ نزیک خستنەوەی بابەتەکانی‌و ئیمکانی لەبەراشتنەوەی بێئەژماری وێنەکان، واتا ئیمکانی کۆپیکردنەوەیان، بەتەواوی سنووری بۆ ئەزموونکردنێکی ریتواڵیانەی دانسقەیی بەرهەمەکان دانا و نەمانی ئەفسوون بووە واقیعێکی بەرچاو. هەندێ ڕەخنەگر، کە فیکری بنیامین تەنیا لەژێر کاریگەریی‌بوونی بەمیسیانیزمی یەهودی دەخوێننەوە، لەم ڕوانگەیەوە بنیامین وەك دوژمنی فۆتۆگرافی لەقەڵەم دەدەن. بەڵام بەپێویست ئەمە ڕاست نییە، چونکە لەو کاتەدا کە بنیامین لەمیانەی لێکۆڵینەوەکانیدا ڕەخنەی خۆی لەکۆمەڵگایەك دەگرت (کۆمەڵگای مۆدێرن) کە ببووە مەسرەفکەری وێنەکان‌و نیگارەکان تیایدا ببوونە ئامرازێکی سەرکوتکەر بەدەست دەسەڵاتەوە، لەهەمان کاتیشدا تیژبین بوو لەئاست چۆنایەتی (کڤالیتی) شێوە جۆربەجۆرەکانی هونەری وێنەگریدا.

هەڵوێستی دوو جەمسەری بنیامین لەئاست فۆتۆگرافیدا، لەوتاری (کورتە مێژووی فۆتۆگرافی)دا بەجۆرێکی تایبەت خۆی دەنوێنێ: بنیامین ئەوە دەسەلمێنێ کە چۆن لەوێنەکانی سەرەتادا، واتا ئەو وێنانەی کاتێکی شتنەوەی زۆریان دەبرد و هێشتا ئیمکانی شتنەوەیان لەژمارەیەکی زۆردا نەهاتبووە ئاراوە، ئەفسوونێك هەیە نامۆیە بەو تەکنیکە خێرایەی وێنەگرتن، کە پاشتر داهات و بەشێوەیەکی بێڕەحم چرکە ساتەکانی وشك دەکردن. کەواتە نەمانی ئەفسوون بەپێویست پەیوەندی بەجەوهەری خودی فۆتۆگرافیەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی هەیە بەجۆرێکی تایبەتی لەبەراشتنەوە و کۆپیکردنەوەی وێنەکانەوە. بۆنموونە: بەشێوازی وێنەی پۆرترێتەوە، بەوجۆرەی لەقۆناغی پیشەسازیدا بەرهەم دەهێنران. لەم قۆناغەدا، لایەنی

پارادۆکسیانەی فۆتۆپۆرتریتەکان بەم جۆرەیە: لەو دەمەدا کە وێنەکان بەشێوەیەکی بێڕەحم و خێرا (کات) دەوەستێنن، (ڕۆلان بارت پاشتر لەکتێبی ژووروکەی ڕووناکدا نووسی: کات دەخنکێنن)(٤) و لەژمارەیەکی زۆردا دەشۆڕێنەوە و بەمەش ئەفسوونی سەرەتایی نامێنیّ، ئەوە لەهەمان کاتیشدا وێنەگرەکان ڕێك دەکەونە ڕتووشکردن و بەکارهێنانی تەکنیکی دیکەی دەستی لەپێناوی خەڵقکردنەوەی هەمان ئەفسووندا. ئەمەش بەلای بنیامینەوە هەوڵدانێکی بیّ ئەنجامە، چونکە ئەوەی لەژێر زەبری خێرایی تەکنیکدا لەناو دەچێت و دەسڕدرێتەوە، بەهۆی کاری دەستییەوە نایەتەوە شوێنی خۆی.

جگە لەوێنەگری بەناوبانگی فەڕەنسی (ئاوگۆست ساندر)، یەکێك لەو وێنەگرانەی بنیامین ستایشییان دەکات ئاتگێتە (ATGET EUGENE)، کە بەسەر شەقامەکانی پاریسدا دەسووڕایەوە و وێنەی جامخانەی دوکانەکان، مەیدانە چۆڵەکان و کۆلانەکانی دەگرت. واتە وێنەی ئەو شوێنانەی کە فۆتۆگرافە پیشەییەکان لەسەر تەقلیدی زمانی هونەری شێوەکاری بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پیشانیان دەدانەوە و موبالەغەیان پێوە دەکردن. بەلای بنیامینەوە جوانیی وێنەکانی (ئاتگێت) لەوەدابوو بەجۆرێکی دیکە واقیعی کردبووە مۆتیڤی خۆی، کە جیای دەکردەوە لەکاری ئەو فۆتۆگرافانەی لەژێر کاریگەری هونەری شێوەکاریدا بوون.

ئاتگێت هیچ گرنگیی نەدەدا بەڕێکخستن و کۆمپۆزیسیۆن، ڕۆمانتیزەی دەوروبەر و بارودۆخەکانیشی نەدەکرد. بەڵکو تەنیا بەدیقەتەوە تۆماری دەکردن. ئەمەش بەجۆریّ کە (بواری بەشتەکانو بارودۆخەکان دەدا لەناو وێنەکاندا ژیانێکی سەربەخۆیان هەبێت). لێرەشەوە ئاتگێت، نەك هەر وێنەکانی لەو ڕتووشکردن و دەستکاریکردنە ڕزگار کرد، کە پۆرترێتسازەکان دایان هێنابوو لەهەمان کاتیشدا دەیانویست وەك خەسڵەتێکی تایبەت بەوێنەکان پیشانی بدەن، بەڵکو توانیبووشی بابەتەکان لەهەموو ئەفسوونێکی خۆیان ڕزگار بکات.. بەم پێیەش نەمانی ئەفسوون بەپێی لێکدانەوەی بنیامین دەکرا وەك ئەزموونێکی پۆزەتیف لێك بدرێتەوە: وەك ڕزگار بوون لەشێوەیەکی

ئەزموونکردنی شتەکانو هەنگاونان بەرەو سنووری شێوەیەکی تری ئەزموونکردن.

یەکێك لەو خاڵانەی بنیامین لەم وتارەیدا سەرنجمانی بەلادا ڕادەکێشێت، بریتییە لەجیاوازیی نێوان (پۆرترێت) و (فۆتۆگرافی). ناوبردنی فۆتۆگرافی بە (پۆرترێت) بەلای بنیامینەوە ناوهێنانێکی هەڵەیە. پۆرترێت وەك ژانرێکی (نوع) هونەری شێوەکاری پەیوەندی هەیە بەقۆناغی پێش هاتنە ئارای فۆتۆگرافییەوە کە تەنیا ژمارەیەکی کەمی خەڵك هەبوون (پاشاکان، دەوڵەمەندەکان و ئەرستۆکراتییەکان)، بتوانن دەستیان بگات بە ڕەسامێکی پۆرترێتساز و تابلۆیەکی دانسقە و بێ نمونەیان لەسیمای خۆیان بۆ بکێشێ. کەچی لەگەڵ سەرهەڵدانی فۆتۆگرافیدا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان بواری ئەوەیان بۆ ڕەخسا *وێنەیان* بگیرێت. بەڵام لەبەر ڕەهەندی ریالیستیانەی فۆتۆگرافی، وێنەکان زۆرتر وەکو (دۆکیۆمەنتێکی کۆمەڵایەتی) حیسابیان بۆ دەکرا، نەك وەکو (بابەتێکی ئێستاتیکی). جیاوازییەکەش ئەوەیە: کەسەکان لە وێنە فۆتۆگرافییەکاندا، بەپێچەوانەی پۆرترێتی هونەرمەندە شێوەکارەکانەوە، ناسنامەی خۆیان لەدەست نەئەدا. سیمایەکی ئەفسانەیی و سۆپەرمانیان وەرنەئەگرت.. بینەریش لەکاتی تەماشاکردنی ڕووخساری ناو وێنە فۆتۆگرافییەکاندا، وەك مرۆڤی مێژوویی دەیڕوانییە سیمایان، پتر هۆشی لەئاستیاندا چڕ دەبۆوە و فزولییەتیشی لەئاست خەسڵەتە تایبەتییەکاندا زیاتر دەبزوا.

هەرچەندە بنیامین بەدرێژایی وتاری (کورتە مێژووی فۆتۆگرافی)، بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ تەماشای پرۆسەی سازدانەوەی واقیعی بەهۆی وێنەکانەوە کردووە، بەڵام ئەمە ڕێگەی لێ ناگرێت لەکۆتایی هەمان وتاردا گومانی بنەمایی خۆی لەبەرامبەر ئەم هونەرەدا دەرببڕێت: فۆتۆگرافی هەمیشە ڕواڵەتی شتەکانمان پیشان دەدات، ئەوە تەنیا بەیارمەتی زمانە، کە دەتوانین ئەو بابەتەی لەناو وێنەکاندا دەیبینین، لەپێش زەمینە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەی خۆیاندا، نیشتەجێی بکەینو تەنیا لێرەشەوە وێنەکان مانا دەبەخشن. واتا لەو کاتەوە

که بەهۆی زمانەوە ناوەڕۆکیان ڕوون دەکەینەوە و ڕاڤەیان دەکەین.. ئەم پەیوەندییەش کە بنیامین لەنێوان فۆتۆگرافی و زماندا دەستنیشانی دەکات، ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆیە بە میتۆدی شانۆی مەلحەمی (بەرتۆڵد برێشت)ی هاوڕێی دێرینەی: لەشانۆی مەلحەمیدا برێشت سەلماندی، کە چۆن دەتوانرێت فیلم، تێکست و نومایش (کە سێ شێوەی بەکارهێنانی زمانن لە خزمەتی ڕاڤە کردنی ڕووداوەکانی واقیعدا، نەك بۆ لاسایی کردنەوەیان، تێهەڵکێش بکرێن و کاریگەریی خۆیان هەبێ لە وریاکردنەوەی بینەردا. لەڕاستیشدا، بڕواهێنانی تەواوی بنیامین بوو بەڕاڤەکردنی شتەکان و دیاردەکان وەك تاکە ڕێگایەکی دروست بۆ تێگەیشتن لێیان، کە ئەوی لە دۆگمسازیو ئایدیۆلۆژخوازییەوە دەکردە فەیلەسووفێکی وردبینو کراوە بەرەو ڕووی بوارەکانی بیرکردنەوەدا..



## پەراوێزەکان

ئەم وتارەی بنیامین لەم دوو سەرچاوەیەدا دەخوێنیتەوە:

IN ،(1) WALTER BENJAMIN: LILLE FOTOGRAFIHISTORIE
(UDVALG OG FORORD AF PETER ،KULTURKRITISKE ESSAYS
GYLDENDAL. SS. 62-81.، 1998،MADSEN)
،- WALTER BENJAMIN: KULTURINDUSTRI. UDVAGLTE SKRIFETR
VED CLAUS CLAUSEN 1973. SS 44-57.

(٢) بۆ ئەم وتارە جگە لەو دوو سەرچاوەیەی پێشوو کە لە ل: ٤٢-٦١ی یەکەمیان و ل: ٢٢٦-٢٤٥ی دووەمیاندا دەیخوێنیتەوە، بڕوانە ئەم وەرگێڕانەشی:

- WALTER B. SKRIBENTEN SOM PRODUCENT. IN: MARXISTISKE
LITTERATURTEORI. UDVAGLT AF: LEIF SONDEGAARD A.
RHODOS 1973. SS. 123- 142.

(3) W. BENJAMIN: LILLE FOTOGRAFIHISTORIE. OP. S. 78.

(4)R. BARTHES: DET LYSE KAMMER. OVERSAT AF KAREN
NICOLJSEN. KOBENHAVN 1983.

## سەرچاوە

- RUNE GADE: STASER. PASSEPARTOUTS
SERSKRIFTSERIE 1997.
- BENT FAUSING & PETER LARSEN: BELLEDER ANALYSE
1982 NSKLERFORINING.،OG HISTORIE. DA-EN/ SKOV

# زمان وبێکۆتایی:
## پرۆسەی ناولێنان لە (ئێوارەی پەروانە)دا

*(... جەندانی چکۆلە، نەسرەدینی بۆنخۆش، فەتانەی غەمگین، مەعسومە، فەرەیدونی مەلەك، گوڤەندی مەلەوان، دەستەی دەفژەنەکان، خوشکانی تۆبەکار، سیامەندی باڵندە، مەلا کەوسەری باغەوان، شەهلای خوداناس، زەینەبی کوێستانی، مەهدی گوڵەباخ، کلپەتامیری توتی، عەزیزی تیرانداز، لەیلا، شەوگار، پەروانەو متد..)*

ئەمانە هەندێك لەو ناوانەن کە بەدرێژایی زیاد لەدووسەدوپەنجا لاپەرە، سیمای تابلۆیەکی میناتۆرییان بەخشیوەتە دوابەرهەمی داهێنانی بەختیار عەلی: (ئێوارەی پەروانە)(١). ئەگەرچی دەبێت لەکاتی قسەکردنماندا لەسەر ئەم داهێنەرەمان هەمیشە لەبەردەم دەستەواژەی (دوابەرهەم)دا نیشانەیەکی پرسیار دابنێین، چونکە بەڕاستی لە بەرامبەر پڕکاریی ئەودا دەستەواژەیەکی کاتیو تێپەڕیوە..

ڕەنگە لەخوێندنەوەماندا بۆ بەرهەمێکی هونەری، لەوە مەترسیدارتر نەبێت کە سەرەنجامی ئەم بەرهەمە لەبەر تیشکی یەکێك لەرەگەزە پێکهێنەرەکانیدا بخوێنینەوە. واتە بەرهەمەکە بچووك بکەینەوە بۆسەر ئاستی یەك بنەمای خۆیو بە جەختکردنەوەمان لەسەر گرنگیی ئەو بنەمایە، بکەوینە هەڵەی فەرامۆشکردنی رەگەز و بنەماکانی دیکەی هەمان بەرهەمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەم هەیە بۆخۆی ئەرکێکمان دەدات بەسەردا و خۆی ئەو ڕێگایانەمان لەبەردەمدا قوت دەکاتەوە، کە دەمانکەیننەوە بەجەوهەری خۆی. جەوهەری (ئێوارە پەروانە)ش بەلای منەوە هەرتەنیا لەشێوازی گێڕانەوەی ئەو تەکنیکە پێشکەوتووەی ڕیوایەتکردندا نییە، کە بەهۆیەوە زەمەنەکان دابەش دەکرێن. یاخود هەر لە تەقینەوەی رەگەزی خەیاڵ و مانای بەسەرهات و چنینی رووداوە

سەیروسەمەرەکاندا نییە، (کە هەموو ئەمانە ڕەگەزی گرنگیی پێکهێنەری بەرهەمەکەن و ڕێگاخۆشکەرن تا خوێنەر بەهۆیانەوە خۆی لەسەفەرێکی ئەفسووناویدا ببینێتەوەو هەندێ جاریش بکەوێتە دروستکردنی ئەوپردانەی کە جیهانی بەرهەمەکە دەبەستن بەواقیعێکی دیاری کراوەوە، ئەگەرچی ئەمە لەوەهمێك زیاتر نییە).. بەڵکو ئەو جەوهەرە پێش هەموو شتێك، جەوهەرێکی (زمانی)یە. ئەمەش لەوکاتەوە کەزمان ئاستی ئەرکە ڕۆژانەییەکەی خۆی جێدەهێڵێتو دەبێتە هێزێك بۆ ناولێنان و دەبێتە شوێنی مانەوەی بێکۆتایی. واتە لەوکاتەدا کە ئاگایی بەرهەمەکە دەکەوێتە بەرگریکردن لەخۆی وەك بەرهەمێکی هونەری، کە تیایدا زمان ئاستە ئاڵوگۆڕییە ڕۆژانەییەکەی جێدەهێڵێت و دەبێتە قەدەری بەرهەمەکە.

ئەرکی زمانیش لەئاستی بەکارهێنانی هونەریدا، ئەرکێکی مەتریاڵی نییە کە لەسەر سپێتی لاپەڕەکان، بەمەرەکەیی ڕەش‌و بەپیتی ژمارە سێزدەی سیستەمی کۆمپیوتەری (ماکنتۆش) ببینین‌و زانیارییەکانمان پێبڵێت، شتە نائاشکراکانمان بۆ (بەیان بکات)و نادیارەکانمان بۆ (ڕون بکاتەوە).. بەڵکو ئەرکێکە دەمانخاتە بەردەم (جیهانی بەرهەمەکە). جیهانی بەرهەمەکەش، جیهانێکە هەموو شتێ تیایدا وەك (ڕازێکی بەیان نەکراو)، وەك (نائاشکراییەکی ئامادە)و وەك (نادیارێکی زانراو) بە نەگوتراوی‌و لەشێوەی (نامەتریاڵیانە)ی خۆیدا ماوەتەوە. بۆیە پرۆسەی خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە، پرۆسەیەك نییە کە ئێمە لە نادیارەوە بگەیێنێتە دیار. پرۆسەیەك نییە بەهۆیەوە بتوانین پەردەی نهێنییەکان هەڵبدەینەوەو بەپێی بەرەو پێشچوونمان لەهەڵدانەوەی لاپەڕەکاندا، زانیارییەکانمان زیاد بکاتو ئەگەری بواری خۆگونجاندنمان لەگەڵ کاراکتەر و ڕووداوەکاندا بخاتە بەردەست. بەڵکو ئەرکی خوێندنەوە هەر لە سەرەتاوە خۆی لەبەردەم پرۆسەیەکی ڕاڤەکردنی دوورودرێژدا دەبینێتەوە، کە ڕەنگە نەمانگەیەنێت بەهیچ ئەنجامگیرییەکی بەرجەستە و قەناعەتپێکەر. چونکە بەڕاستی بێمانایە ڕازی ئەم بەرهەمە تەنیا بەگرێی داستانەکەیەوە (پلۆت)کەیەوە ببەستین‌و لێرەشەوە باس لە (سەرکەوتن)و (ژێرکەوتن)ی

شۆڕشێك، نائومێدبوونی ڕاپەڕینێك، یاخود باسی ژیانو مەرگی بزوتنەوەیەك بکەین، کەبەدەستی نەوەیەکی یاخیبوو هاتۆتە ئەنجام.. ڕازی ئەم بەرهەمە بە ئاماژەکردن بۆ شێوەی قسەکردنی خەباتکارەکانو شۆڕشگێڕەکانیش خۆی نادات بەدەستەوە، چونکە ئەوانیش زمان لە ئاستە ڕۆژانەییەکەیدا بەکاردەهێننو ئەوە تەنیا لەدوای شەهیدبوون و لێرەنەمانیانە، کە ئێمە بەپێی نەریتی یادکردنەوەکان، سیمایەکی پیرۆزیان بۆ قاییل دەبین. هەروەکو چۆن ئاماژەکردنیشمان بۆ ڕووداوە مێژووییەکانی ئەم چەند دەیەی دوایی کۆمەڵگای خۆمان و ناوچەکە بەگشتیو بەستنەوەیان بە ڕووداوەکانی ئەم تێکستەوە، هیچ ئەنجامێکمان دەستگیر نابێت جێگەی متمانە بێت.

بۆیە ئەمەش دەڵێم چونکە ترسم هەیە لەوەی بەریانی ڕەخنەیی ناو ڕۆشنبیریی ئێمە، کە لەلایەکەوە، گوتاری دەروونشیکارانەی ڕواڵەتگەرا تیایدا زاڵە و لەلایەکی تریشەوە سەخت لەژێر کاریگەریی ئەتمۆسفێری سیاسیو کۆمەڵایەتی کوردستاندایە، هەستیٚ ئەم بەرهەمەش بخاتە بەر زەبری چەمکەکانی خۆیو خوێندنەوەیەکی لەوبابەتەی بۆ بکاتو ئەنجامگیریی (زانستانەی ڕەخنەیی)شمان پێشکەش بکات. واتە لەدوا ئەنجامدا کۆنکرێتیزەی جیهانی بەرهەمەکە بکات و بەیاننەکراوەکانی لەناو هەندیٚ چەمکی سنووردارا کۆبکاتەوەو بەناوی ئەوانەوە بدوێت. گرنگیی هەر خوێندنەوەیەکی ئەم بەرهەمە لەوەدا نابێت کە ڕەهەندە سایکۆلۆژی، سیاسی، تەکنیکی، ڕیواییو ئەنتی ئایینەکانیمان بۆ بدۆزێتەوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، ئەو ئاگاییە بدۆزێتەوە کە دەقەکە بەهۆیەوە بەرگری لە کۆنکرێتیزەبوونی خۆی لەچوارچێوەی سایکۆلۆژیا، سیاسەت، تەکنیك و فێڵەکانی ڕیوایەتدا، پێدەکات. یاخود بەهۆی ئەو بەرگیکردنەوە نایەوێت وەك دەقێکی ئەنتی ئایینی پێناسە بکرێت.

بەمانەیەکی دی، ئەم بەرهەمە نایەوێت (دۆکیۆمەنتێکی ئەدەبی) بێت و وەك نەریتگەراکان دەڵێن، (بانگەشەیەکی دیکەی بزوتنەوەی تازەگەریی کوردیی) بێت، کە (پڕە لەهەڵەی ڕێنووسو زمانەوانی!)و بیەوێت (پەیامێکی دیاریکراو)مان پێڕابگەیەنێت، تا ئێمەش بەهۆی (شیکردنەوەی زانستانە)وە

کۆدەکانی بکیەنەوەو پەیامەکەی لەزمانی ڕەخنەدا دابڕێژینەوە. (هەڵبەت ئەگەر لەدەرەوەو لەڕوانگەیەکی مێژووییەوە تەماشای ئەم بەرهەمە بکەین، ئەوە هەم دۆکیۆمەنتێکی ئەدەبییە، هەم ئیدیعایەیەکی دیکەی تازەگەریی ئێمە و هەم هەڵگری پەیامێکی فیکری، فەلسەفیو ئێستاتیکی دیاریکراویش. هەر لەبەر ئەم خەسڵەتانەش خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی شێلگیرانە هەڵدەگرێت.. ئەگەرچی لەجاری یەکەمدا چێژ بەخشترە تەنیا وەك دەقێکی فەنتازیانەی خۆش بیخوێنینەوە و هەوڵدەین بەبێ هیچ حوکمێکی پێشوەخت لەئاستیا کراوەبین..) هەروەها بەرهەمەکە نایەوێت بەهۆی ئیشکردن بەئیمکانیەتێکی زیرەکانە بۆ چنین‌و ڕیوایەتکردن لە بەسەرهاتی کۆمەڵێ کاراکتەری خەیاڵیمان ئاگادار بکاتەوە (کە ئەمەش ئاگایی نووسەرەکەیمان نەك هەر لەسەر تەکنیکی نووسینی ڕۆماندا بۆ دەردەخات، بەڵکو ئاشکراکەری تێگەیشتنی بەختیاریشە لە (کات) وەك چەمکێکی فیکریو فەلسەفی). بەڵکو بەرهەمێکە دەیەوێت بەهەموو توانای خۆی پێمان بڵێت: ڕازێکی پەنهان هەیە لە بەیانکردن نایەت و خۆی نادات بەدەست ئیمکانیەتەکانی دەربڕینی زمانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە.
هەرلێرەشەوە سەرجەمی بەرهەمەکە دەبێتە هەوڵدانێکی چڕ و یاخیگەرانە بۆ گەیشتن بە ئەودیوی زمان، بۆ بێکۆتاییو بۆ ئەو هەرێمەی چیدی ڕوونیو بەرجەستەییو ئاشکرایی مانایان نەماوە، چونکە زمانێك نییە بتوانێت تەفسیرێکی لۆژیکی بۆ شتەکان، پەیوەندییەکانو دیاردەکان بکات و لەچوارچێوەیەکی ڕوونو بەرجەستەو ئاشکرادا بیانخاتە ڕوو، یاخود نەزمێکیان پێببەخشێت. بۆیە بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزی (میتا - زمان) واتە زمانێك کە لەودیو زمانی ئاڵوگۆڕکردنەوەیە و پلەیەکیش بالاترە لەو زمانە، ناتوانین لەجیهانبینی ئەم ڕۆمانە وەك (جیهانبینییەکی ئەڵتەرناتیڤ)، تێبگەین و ناشتوانین ڕەگەزە میناتۆرییەکەی، کە بەبڕوای من لە ناولێنانی کاراکتەرەکانیدا بەرجەستە بووە، شیبکەینەوە..
ئەوەی کاراکتەرەکانی ئەم دەقە دەکاتە کاراکتەری سەربەخۆ، ڕەوتی ژیانی ئەوان نییە لەناو ڕووداوەکاندا و بەپێی گەشەی زەمەنیی تەمەنی هەرکامێکیان،

(تەنانەت ئەو کاتەش کە زەمەنی ڕووداوەکان‌و گێڕانەوەکان سیمایەکی میتۆلۆژیانە بەخۆیانەوە دەگرن). بەڵکو سەربەخۆبوونی ئەو کاراکتەرانە هەر لەسەرەتاوە بەتووندی گرێدراوە بە (ناو و نازناو)ی خۆیانەوە. واتە بەو ڕەگەزە زمانییەوە، کە چارەنووسی هەریەکەیان و کاراکتەری بوونی هەر یەکێکیانی لەسەرەتاوە دەستنیشان کردووە.

ناوی ئەوان بۆتە قەدەری ئەوان و بۆتە بەرجەستەکەری کەسایەتی و جیهانی ناخ‌و بیرکردنەوەیان.

لەپشت هەرناوێکی تایبەتەوە، خەسڵەتێکی جەوهەری هەیە کە گوزارشت لەناخی کاراکتەرەکان دەکات. ئەگەر لەڕوانگەی نیشانەناسیەوە، (ناو) دەلالەتێکی زمانیی بێت بۆ ناسینەوەی مەدلوولێکی کۆنکرێتی، ئەوە ناوی قارەمانەکانی (ئێوارەی پەروانە) تەنیا سیمای جەستەیی کاراکتەرەکانمان (بەو مانایەی دەکرێت لە تێکستەکەدا بۆ جەستەیان بگەڕێین‌و وێنەیەکی فیزیکی لەسەر ئەو جەستەیە بهێنینە پێشچاوی خۆمان)، پێ ئاشنا ناکەنەوە و لەزەینماندا بەرجەستەیان ناکەن.

بەڵکو بەدرێژایی ڕۆمانەکە و بەدووبارە کردنەوەی بەردەوامی ناوی هەر کاراکتەرێکیان، زیاتریش ئەو ڕەهەندانە ئاشکرا دەبن کە لەودیو خودی کاراکتەرەکانەوە ئامادەن‌و بگرە کەسایەتیشیان پێکدەهێنن. لێرەشەوە کارکردی ناوەکان ئەوە نییە ببنە (پاشگر)ێك بەسیمای قارەمانەکانەوە، تا لەڕێگەی گۆکردن، هێنانە سەرزمان و وێناکردنیانەوە لەپرۆسەی خوێندنەوەدا، سیمای ناولێنراوەکانمان بۆ بەرجەستە ببێت. بەڵکو کارکردی سەرەکیی ناوەکان ئەوەیە ببنە جەوهەری کەسایەتی و قووڵایی بوونی کاراکتەرەکان.

کاراکتەرەکان بوونی خۆیان لەناوە تایبەتییەکانیاندا بەرجەستە و تەحقیق کردووەو ئەزموون‌و بەسەرهاتیان بەجۆرێ ڕێدەکات، کە ببێتە ناوەڕۆکێك بۆ ناوەکانیان.

ناوەکان کەسەکانن و تەنیا ئەوانەی خاوەنی بوونێکی سەربەخۆشن، (ناوی تایبەتییان) هەیە: (خەندانی بچکۆلە، نەسرەدینی بۆنخۆش، سیامەندی باڵندە

و.. هتد). دەنا ئەوانیتر یان لەپەراوێزدان (وەك: دەلیلە چاوشینەکە و پیرەی دالّدەدەری عاشقان)، یاخود لەژێر ناوی گرووپەکاندا دەناسرێنەوە: (گرووپی خوشکانی تۆبەکار، ئافەرتە دەفژەنەکان و براکان و خزمەکان و هتد).
بەمانایەکی تر، بەختیار کاراکتەری قارەمانەکانی نەك لەمیانەی بەسەرهاتی ڕۆمانەکەیدا و بەدرێژایی ماوەی ڕیوایەتکردنەکان لە تێکستدا، پێگەیاندووە و گۆشکردووە، بەڵکو هەریەکەیانی لە (ناولێنان)ی خۆیانەوە خولّقاندووە. چونکە هەموو ئەو زانیاریانەی بەهۆی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیانەوە لە سەریان دەیخوێنینەوە، دەیبیستین و پێی ئاشنا دەبین، لەڕاستیدا بریتییە لە فراوانکردن، کردنەوەی کۆد و ئاشکراکردنی نهێنی و سنووری مانای ناوەکان.
ڕەنگە بتوانم ئەو مەبەستانەی پێشووم لەوەدا کورت بکەمەوە کە بڵێم: بەختیار کەسەکانی ناونانیٚ بۆ ئەوەی ئاشنایان بکات، بەڵکو بۆئەوەی خەڵقیان بکات.
یاخود وەکو واڵتەر بنیامین گوتویە بۆئەوەی: (ناوەکانیان ببنە چارەنووسی خۆیان)و کاراکتەرەکان لەناوی خۆیاندا کەشف ببن.
بەڵام دەکرێت بپرسین چ دیدێك لەپشت ئەم پرۆسەیەوە وەستاوە؟ یان چ ئەرکێك لەپرۆسەی نووسینو هێنانە سەرکاغەزی ئەم ڕۆمانەدا بۆ (زمان) لەپێش چاو گیراوە، تا بتوانێت ببێتە زمانێکی خولّقێنەر و ڕازئامێز؟ بەمانایەکی دیکە: ئایا لەدایکبوونی ئەم دەقە هەرتەنیا ببەستین بەو تەوژمەوە کە دەکرێت (بەتەوژمی نووسین) ناوی بەرین و ڕەخنەگرە کلاسیکیەکان پێیان دەگوت: (ئیلهامو سرووش)و سەبارەت بەنووسینی ئەم بەرهەمە ماوەی (دە) مانگی خایاندووە؟ یاخود بیبەستین بەهەبوونی ئەو (جیهانبینی)یە دروستبووەوە کە لەپێش (مەتریاڵیەتی دەق)و پرۆسەی نووسینەوە، لەلای بەختیار ئامادەیە و هەڵگری تێڕوانینێکی تایبەتە بۆ ئەرکی زمان و من لە شوێنێکی دیکەدا ڕوونم کردۆتەوەو بەرگریم لێکردووە..(٢)
یەکێك لەو ڕەخنەگر و فەیلەسووفانەی بەپێچەوانەی بۆچوونی باوی زمانناسەکانو زاناو فەیلەسووفە پیشەییەکانەوە، بەرگری لە زمانی ئیلاهیانە و ئەفسانەیی دەکرد، واڵتەر بنیامین بوو. بنیامین لە وتارێکیدا بەناوی (لەمەڕ

زمانەوە بەمانایەکی گشتی و زمانی مرۆڤ بەتایبەتی)(٢)، بەرپەرچی ئەو بۆچوونە باوەی دایەوە کە لە (زمان)دا تەنیا ئامرازێکی پەیوەندیکردنی ناوخۆی مرۆڤەکانی بەیەکترەوە دەبینی. بەمانایەکی تر، بەرپەرچی ئەو تێگەیشتنەی لە (زمان) دایەوە، کە ڕۆڵی زمانی لەژیانی مرۆڤدا، لە (بەئامرازکردنیدا) سنووردار دەکرد و هەر نەخشێکی تری بۆ زمان بە ئەرکێکی زیادەی وەك (ئەفسانەخوازی)و (نازانستی) لێکدەدایەوە. هەڵبەتە ئەو دیدە لە خستنە پاڵی هەریەکێك لەم چەمکانەشدا نییەتێکی شاراوەی هەبوو، کە بریتی بوو لە بەکەمگرتنو لاقرتەپێکردنی هەریەك لەو کایانە. ئەم بۆچوونە لە ئێستاشدا و لە گوتاری زانستیانەدا بەچاکترین شێوی خۆی ئاشکرا دەکات. ئەمەش لەوەدا کە پسپۆڕەکانی زانست لە ئاخاوتنیاندا لەسەر دیاردە و شتەکانی دنیا، هەمیشە بەپشت ئەستووری ئەو ڕاستییە دەدوێن، کە بریتییە لە (شوناسی زانستانە)ی دنیا و گەردوون. شوناسێك کە ئیدیعا دەکات لەڕێگەی کۆکردنەوە و دیراسەکردنی دیاردەکان و داتاکانەوە، دەتوانین بەجەوهەری ئەو دیاردانە بگەین. واتە زمانی زانستانە هەر لە سەرەتاوە بڕوای بە (حەقیقەتێك) هەیە کە بریتییە لە حەقیقەتی (ناسینی زانستانە). ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت کە پسپۆڕەکانی زانست لەپێشەوە ئەرکی زمان بەوە دەستنیشان دەکەن، کە دەکرێت بەهۆیەوە (تەعبیر) لەو حەقیقەتە بکرێت.

لێرەشەوە زمان بۆخۆی نەك هەر نابێتە پانتاییەکی سەربەخۆ و ناکرێتە دەروازەی ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ جیهان و دیاردەکانی ناوی، بەهۆی ڕاڤەکردنو لێخوردبوونەوەوە، بەڵکو دەشکرێتە ئامرازی تەعبیرکردن لەو حەقیقەتەی کە لە (دەرەوە)ی زماندایە. ئەمەش بەمانای ئەوەیە کە حەقیقەتی شتەکان و دیاردەکان لەجیهانی ئۆبجەکتیڤ و (ئا.. لەوێدایە) و چاوەڕێیە تا ئێمە (بەشێوەیەکی زانستانە) لێیبکۆڵینەوەو لەزماندا نیشتەجێی بکەین، ڕوونیبکەینەوە و کەشفی بکەین..

بەڵام بنیامین لەو وتارەیدا کە پێشتر ناویم برد، پانتایی زمان دەگێڕێتەوە بۆ بنەمایەکی پەروەردگارانە و پیرۆز. واتە باس لە (زمانی پیرۆزی سەرەتا)

دەكات كە بەيەكجاری جياوازە لە پانتايی زمانی دنيايیو خاكيانەی مرۆڤ. لەيەكەمياندا مەبەست لە زمان، وەك بەناونيشانی وتارەكەی بنيامينيشدا دەردەكەوێت: زمانێكی (گشتی)يەو پيرۆزمەند. زمانێك كە يەكسانە بە (بوون)و شتەكانيش لەوجودی وشەيی خۆياندا بەرجەستە دەبن. واتە لەو كاتەوە كە (ناو)يان لێدەنرێت. ناولێنان بەپێی ئەم ديدە، خەسڵەتێكی قودسيانە و پەروەردگارانەی زمانە. چونكە كردەی ئەفراندنی جيهان و گەردوون لەلايەن يەزدانەوە، پێش هەموو شتێك (ئەفراندنێكی زمانی)يە بەهۆی ناوهێنانەوە. لە (تەورات)دا هاتووە: (يەزدان وتی ڕووناكی ببێت و ڕووناكی دروستبوو) ئەمجا (يەزدان ڕووناكی ناونا: ڕۆژ و تاريكيشی ناونا: شەو). پاشان (يەزدان وتی فەلەكێك لەناو ئۆقيانووسەكاندا بەرپاببێت و فەلەكی ناونا ئاسمان).. بەم جۆرەش يەزدان ناودەنێت و ئاواش خەڵق دەكات(٤).

بنيامين بۆخۆی دەنووسێت: (لەلای خواوەند ناو ئەفرێنەر و كەماڵ بەخشە، چونكە ناو وشەيە و وشەی خواوەنديش موعتەبەرە چونكە ناوە. مانای دەستەواژەی (وە يەزدان تەماشايكرد و ﴿ئەوەی هەبوو﴾ پێی پەسند بوو) ئەوەيە: كە خواوەند لەڕێگەی زمانەوە ئيعتيرافی بە شتەكان كرد(٥).

ئەم خەسڵەتە خواوەندييە بووە توانايەكی سەرەكيی (ئادەم)يش: لەوەدا كە ئادەم لەوێنەی خواوەند دروستكرابوو، دەبوو توانای يەزدانيش بەشێوەيەكی (بچووككراوە) لەويشدا هەبێت. واتە توانای ناولێنان. بەم جۆرەش ئادەم وەك (وێنەيەكی بەجەستەبووی خواوەندی))، هەر ڕەنگدانەوەيەكی سێبەرئاسای ئۆرگێناڵەكەی نەبوو، بەڵكو هاوشانيشی بوو. چونكە (يەزدان هەموو ئاژەڵێكی ساراو هەر باڵندەيەكی ئاسمانی هێنايە لای ئادەم تا ببينێت چ ناوێكيان لێدەنێت، ئەوەش كە ئادەم گياندارەكانی پێ بانگكردن، بوو بەناويان)(٦).

بەدەربڕينە بنيامينيەكەی: (كردەی ئەفراندن لەلايەن يەزدانەوە لەوەدا بەكەماڵی خۆی دەگات، كە شتەكان ناوی خۆيان لەمرۆڤەوە پێدەبەخشرێت. بۆيە وەك بنيامين دەڵێت، دەكرێت (ناو) بە زمانی زمان دابنرێ. هەروەها: (ناوی تايبەتی شوێنی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و وشەی ئەفرێنەری يەزدانييە)(٧).

شتەکان تەنیا بەهۆی بوونی زمانییانەوە، واتە جێبوونەوەیان لەزماندا بەکەماڵی بوونی خۆیان دەگەن، چونکە شتە بێ ناوەکان لەهەمان کاتیشدا بوونێکی داخراوی سنووردایان هەیە. (ناو) کرانەوەیە لەبەرامبەر بووندا و قەبوولکردنی چارەنووسێکە.
بەم جۆرەش ناوی تایبەتی بووەکان لەهەمان کاتیشدا هەبوونی ئەوانە، لەبەرئەوەی: (ئەوە پرۆسەی ناولێنانە(...) کە یەکەمجار بوار دەداتە تاکەکان تا لەگەڵ بوونی بۆ دەستنیشانکراوی خۆیاندا ببن بەیەك)(٨).
ئەوەی کە دواجار جودایی دەخاتە نێوان ناوەکانو شتەکانەوەو بەیەکتر نامۆو بێگانەیان دەکات، ساتەوەختی دەرچوونی ئادەمە لەبەهەشت لەدوای گوناهی یەکەمەوە: ئادەم کە ئیدی دەبوو وەك بوویەکی زەمینی بژی و چارەنووسی خۆی لەسەر زەوی بێنێتەدی، نەدەکرا خاوەنی زمانێکی پەروەردگارانەی پیرۆز بێت. بەڵکو دەبوو زمانەکەیشی ببێتە زمانێکی (تایبەت) کە لەجیاتی (ئاشناکردنی شتەکان و ئەفراندنیان، دەبوو شتەکان وا لێبکات قابیلی تێگەیشتن بن). واتە زمانێ کە وەك (ئامرازی ئاشناکردنە)و لێرەشەوە زمانێکی بەرتەسکی پەیوەندیکردنی ڕۆژانەی ناو کۆمەڵی ئینسانەکان لەگەڵ یەکتردا..
واتە زمانێك، (تەنیا دەتوانێت شتە نووسراوەکان بخوێنێتەوە و هەرگیز تواناکان نابێت بەهۆیەوە نێوان دێڕەکان و مانای دەروونیی و بەیاننەکراو و نادیارەکان و ڕازەکان دەرك بکەین)(٩).
هەڵبەت نابێت لەم تێزە گرنگەوە، ئەو ئەنجامگیرییە بهێنینە دەست کە پیشانی دەدات، بنیامین ڕەهەندێکی (نامرۆڤانە) دەبەخشێتە زمان، یاخود کارکردی زمان لەچوارچێوەیەکی میتافیزیکیانەدا سەقامگیر دەکات. ئەگەرچی خستنەڕووی بنیامین بەهۆی پابەندبوونیەوە بە نموونە تەوراتییەکان و کاریگەربوونیەوە بە تێکستەکانی ئایینی (کاباڵەیی) کە لقێکی ئایینی یەهودییە، ڕووخسارێکی میتافیزیکیانەشی هەیە.
بەلام خاڵە سەرەکییەکەی بنیامین خاڵێکی فەلسەفییە کەدەیەوێت لەڕێگەیەوە بیسەلمێنێت، زمانی مرۆڤ تەنیا شێوەیەکی (تایبەت)ی زمانە.. تاقە زمانێکیش

که ئومێدی ئەوە دەداتەوە بەمرۆڤ تا لەگەڵ بنەما خاوێن و پیرۆزەکاندا یەکبگرێتەوە، زمانی ئەدەب و داهێنانی بەرهەمی هونەرییە بەگشتی. لەوەدا کە زمانی هونەر، زمانی لادانە لەزمانی ڕۆژانە و شکاندنی بەربەستە گراماتیکیەکانە، ئەوە توانایشی هەیە ئاستی بەکارهێنانی ئامرازیانەی زمان بۆ ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی ئێمە بەشتەکان ڕەتبکات، بمانباتە ئەودیو سنووری چاوەڕوانییەکانی ماناییەوە، داوەتمان بکات بۆ قەڵەمڕەوی مانا دەرروونی و نادیار و هێشتا دروستنەبووەکان(١٠).

ئەگەر بشییێت ئەنجامگیرییەکی سەرەتایی بدەم بەدەستەوە، دەبێت بڵێم: ئێمە لەگەڵ (ئێوارەی پەروانە)دا، پێش هەموو شتێك لەبەردەم بەرهەمێکی هونەریداین. بەرهەمێك، کە وەك جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤ خۆی ئاشکرا دەکات و هەر ئەمەشە کە ڕێگەمان پێنادات وەك تێکستێکی بەڵگەنامەیی لەپەیوەندی بەواقیعێکی دیاریکراوەوە، بیخوێنینەوەو ڕاڤەی بکەین. واتە ڕەگەزێکی بەرگریکردن لەم بەرهەمەدا هەیە کە هەر لەسەرەتاوە سنوور بۆ خوێندنەوە تەقلیدیە ئاراستەکراوەکان دادەنێت، کە ئەو ڕەگەزەش ڕەهەندە ئێستاتیکیەکەیەتی. لێرەشەوە، وەك بەرهەمێکی هونەری دەیەوێت بەگوتەی هایدگەر، (بانگهێشتنمان بکات بۆ بوون لەجیهانێکی تردا). واتە وەك بەهەمێکی هونەری، سنوورە (نوقسانە)کانی زمانی پەیوەندیکردنی ڕۆژانەی ئێمە ڕەت دەکات، (کە هەمیشە دەبێت بەئەنجامی ڕوون و لۆژیکیمان بگەیەنێت، یان ڕوونکەرەوە بێت) و ئەو پەیوەندییانە لەناو زمانێکی (کەمتر لۆژیکی)دا بەرهەمدەهێنێتەوە، بەبێ ئەوەی بتوانین چاوەڕێی ئەنجامگیریی کۆنکرێتی لێبکەین.

لێرەیەوە جیهانی (ئێوارەی پەروانە) هەڵگری ئاگاییەکە بەرامبەر بەخۆی وەك بەرهەمێکی هونەری کە بە (ئاگایی ئەفراندن) ناوی دەبەین. ئەم ئاگاییە دەسەڵاتی ئەوەی داوەتە بەرهەمەکە، تا بتوانێت کارکردی کۆمەڵایەتیانەی ئاڵوگۆڕی زمانیی ڕەتبکات و بەهۆی یەکسانکردنەوەی مرۆڤەکان بەجەوهەری خۆیان و شتەکان بە وشەکان، جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤ بسازێنێ تا (کارکردی

گشتی) زمانی تێدا بەرجەستە ببێت. واتە کارکردی ئەفسانەیی و قودسیی و پەروەردگارانەی زمان. کارکردێك کە زمانی ئاڵوگۆڕیانەی تایبەتانەی مرۆڤ دەکەوێتە پەراوێزییەوەو لەسیمایەکی بەدنیاییبووی ئەو زمانە ئەزەلیو قودسیەش زیاتر، هیچیتر نییە..

(ئێوارەی پەروانە)، چ لەسەر مانا شاراوەکانی، چ وەك تێمپۆی نووسینو پاشان چ لە ناولێنانی کاراکتەرەکاندا، هەڵگری ڕەهەندێکی ئەڵتەرناتیڤی زمانییە، کە ڕێگەمان پێنادات بەئاسانی زەمەنەکەی بەکاتی دنیایی ئەندازە بگرینو زمانەکەی تەرجەمە بکەینەوە بۆسەر زمانی ڕۆژانە و تەمەنی قارەمانەکانی هەڵسەنگێنین، چونکە دەنگەکانی ئەم بەرهەمە بەڕۆحێکی ئەفسانەیی و زمانێکی مەلەکوتی و لە زەمانێکی بێکۆتاییدا دێنە دەنگ..

# پەراوێزەکان

(١) بەختیار عەلی: ئێوارەی پەروانە، ڕۆمان. لەبڵاوکراوەوکانی نێوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی، سوید:١٩٩٨.

(٢) ڕێبوار س: سۆفیستەکان: لەستایشی فەلسەفەی کەمایەتیدا. سوید، ١٩٩٨. بەشی نۆیەم، ل١٥٦-١٥٧و ١٦١-١٦٥.

(3) WALTER BENJAMIN: OM SPROG OVERHOVEDET OG IN: OVERSAT. SLAGMARKS ،OM MENNESKETS SPROG 1989 P. 46.، RED. TORE ERIKSEN،SKYTTEGRAVSSRRIE

(٤) بابك احمدی: خـاطـر ات ظـلـمـت. نشر مرکز، چ: اول، تهران ١٣٧٦. ص ٣٥

(5) BENJAMIN: OP. PP. 44.

(٦) احمدی، هەمان س. پ.ل:٣٥.

(7) BENJAMIN: OP. PP. 41-41.

(8) HARMANN SCHWEPPENHAUSER: NAVN LOGOS- P. 21.، RED. T. ERIKSEN،UTRYK. IN OVERSAT

(٩) احمدی، ه.س.پ. ل٣٧.

(١٠) ه.س.ل ٤٠.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

رەخنە و هزر:

- دیاردەگەرایی تاراوگە، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید ۱۹۹۵. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر ۲۰۰۲

- نووسین و بەرپرسیاری، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری بینین، ئەمەریکا ۱۹۹۷

- سۆفیستەکان، چ۱ ستۆکهۆڵم ۱۹۹۸، چ۲ دەزگای سەردەم، سلێمانی ۱۹۹۹

- دنیای شتەبچووکەکان، دەزگای سەردەم، سلێمانی ۱۹۹۹

- کتێبی نالی، دەزگای موکریانی، هەولێر ۲۰۰۱

- نەتەوە و حەکایەت، دەزگای سپیرێز، دهۆك ۲۰۰۲

- قەفەسی ئاسنین، چاپخانەی رەنج، سلێمانی ۲۰۰۳

- مێژووی هزری کۆمەلایەتی، زنجیرەی هزر و کۆمەڵ ۲، هەولێر ۲۰۰۳

- هاوکاتی و هاوشوناسی، دەزگای سپیرێز، دهۆك ۲۰۰٤

بەرهەمی ئەدەبی:

- گۆرانییەك بۆ گوندە سووتاوەکان (شیعر)، کۆپنهاگن ۱۹۸۹

- کۆپنهاگن! (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارك ۱۹۹٤

- زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال (شیعری) چاپخانەی رەنج، سلێمانی ۲۰۰۰

- من و مارەکان (چیرۆك) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی ۱۹۹۹

وەرگێران:

- ئەفسانەی خۆشەویستی (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆك، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی ۱۹۸۳

- دەنگی پێی ئاو (سهراب سپهری) چ۱، ۱۹۸۹، چ۲ کۆپنهاگن ۱۹۹۰

- در امدی بر شعر معاصر کُردی، کۆپنهاگن، ۱۹۹۰

- **پیدرۆپارامۆ** (رۆمان)، خوان رۆلفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩
- **دەروازەکانی کۆمەڵناسی** (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٢
- **ئەلبوومی کیژی جنۆکان** (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢